# ئیمارەتی ئیسلامی هۆڵاندا

نووسینی: ڕێکەوت ئیسماعیل ئیبراهیم

لێکۆڵینەوەیەک سەبارەت بە ڕەوەندی ئیسلامی و ئیسلامی سیاسی لە هۆڵاندا

- ناوی کتێب : ئیمارەتی ئیسلامی هۆڵاندا
- بابەت : لێکۆڵینەوە
- ناوی نووسەر : ڕێکەوت ئیسماعیل ئیبراهیم
- بەرگ: ڕووناک ڕەسوڵ پوور
- ساڵی چاپ : ٢٠٠٦
- نۆرەی چاپ : دووەم
- ژمارەی سپاردن (٢٠١) ی ساڵی ٢٠٠٦ ی دراوەتێ.
- تیراژ : ٢٠٠٠ دانە
- نرخ: ٤٠٠٠ دینار
- چاپ: چاپخانەی ڕەنج.

**پێشکەشە بە:**

- سەرەکۆماری شەهید قازی محەمەد
- بە گیانی پاکی هەموو ئەو سەربازە ئەمەریکییانەی کە بەخوێنی خۆیان گەورەترین سەروەرییان دروست کرد.

# ناوەڕۆك

ئێستای ڕەوەندی ئیسلامی
کۆمەڵگا داخراوەکان
خەتەنەسوران
ئیسلامی دیجیتاڵ

<u>بەشی سێهەم:-</u>
ڕەوەندی ئیسلامی و ئاوێتە بوون
ئاوێتە بوون چی یە؟
بوارەکانی ئاوێتە بوون
کلتور
کلتوری من و ئەوی دی ، ئێمەو ئەوان
وێنەی ڕەوەندی ئیسلامی:-
ئەوبوارانەی ئاوێتە بوون تیایدا شکستی خواردووە

<u>بەشی چوارهەم:-</u>
هۆڵاندای ئەمڕۆ
ترس لە ئیسلام
ڕەگەزپەرستی و توندو تیژی
ڕاستی تازە

سەرهەڵدانی Wilders
یاخی بوونی کچە سۆمالیەکە
<u>بەشی پێنجەم:-</u>
سەرهەڵدانی ئیسلامی سیاسی لە هۆڵاندا
ئەو دەمەی موسڵمان و ئیسلامیەکان بەرەو ئەوروپا هەڵهاتن!
A.I.V.D دەزگای زانیاری هۆڵاندا

چیرۆکی ئەو ئیسلامیەی کە خۆی خزاندبووە نێو دڵی دەزگاکەوە
هۆڵاندا هاوپەیمانی شەڕی دژ بە تیرۆر
سەرەتاکانی ئیسلامی سیاسی

تابوری پێنجەم
گەڕان بەدووی نهێنیەکاندا لە نێو تەنەکەی خۆڵدا
هۆڵاندا.. باخچەی پشتەوەی ئیسلامیەکان
قاعیدە لە ئەوروپا

<u>بەشی شەشەم:-</u>
ئەمڕۆی ئیسلامی سیاسی لە هۆڵاندا
سەرنج و دەرئەنجامەکان
ئەنفلۆنزای باڵندە:
ژینگەی بڵاو بوونەوەی ئەنفلۆنزاکە
ئەو وێنانەی مزگەوت دەیانبەخشێت
بەرهەم هێنانی تیرۆریست
ئیسلامی سیاسی بەرەو کوێ؟
کێ گرەوەکە دەباتەوە؟
ووردبوونەوەیەک لە ئەقڵیەتی پیاوی سپی

سەرچاوەکان

## پێشەکی:

تەقینەوەکانی لەندەن(٧-٧-٢٠٠٥ ) دیسانەوە جالیەی ئیسلامی ( ڕەوەندی ئیسلامی ) زۆر بە توندی خستەوە سەر شانۆی ڕووداوەکان... هەر چەندە ئەوە یەکەم کاری تیرۆریستی نەبوو لە ئەوروپا ئەنجام بدرێت بەڵام یەکەم جار بوو کردەوەی خود کوژی لە لایەن گروپە توند ڕەوەکانی ئیسلامی سیاسیەوە لە نێو دڵی ئەوروپادا ئەنجام بدرێت و یەکێک لە پایتەختە مەزنەکانی خەڵتانی خوێن بکات! لە کاتێکیشدا ئەنجام بدرێت کە بەهۆی کۆبونەوەی هەشت دەوڵەتە زەبەلاحەکەوە لەندەن و تەواوی شوێنە ستراتیژیەکانی بەریتانیا لە ژێر چاودێرییەکی توندی پۆلیسدا بێت... ئەمەش تەنها ئەوەی سەلماندەوە کە ئەو گروپانە نەک هەر زۆر بە باشی ڕێکخراون و دەتوانن کات و سات و شوێنی زەبر دانیش بۆ خۆیان دیاری بکەن بەڵکو ئەوەشی سەلماند کە ئیتر خەڵکانی خۆکوژ ئەوانەی ئامادەن خۆیان بتەقێننەوە و بکوژن و ببڕن لێرە لە ئەوروپاش سەریان هەڵداوە...

پاش تەقینەوەکانی لەندەن ١٢ وێنەی کاریکاتێری پەیامبەری موسڵمانان کە ڕۆژنامەیەکی دانیمارکی لە ٢٠-٠٩-٢٠٠٥ دا بڵاوی کردنەوە بوونە هۆکاری هەڵئایسانی چەندەها کاری توندو تیژی لە دەرەوەو ناوەوەی ئەوروپا بەرامبەر بە حکومەتی دانیمارک و تەنانەت دەوڵەتانی دیکەی

ئەسکەندەنافی. ئەم وێنە کاریکاتێریانە لە مانگی سیپتەمبەر بڵاوکرانەوە کەچی ڕەوەندی ئیسلامی پاش چەند مانگێک بە ئاگاهات و کەوتە پرۆتسە کردنی!! لەم نێوەدا ڕاپەڕینی پاریس و پاشان سەرتا سەری فەڕەنسا لە ۲۷ ئۆکتۆبەری هەمان ساڵدا دیسانەوە ڕەوەندی ئیسلامی خستەوە ناو ناوان، ئیتر نەک تەنها فەرەنسا بەڵکو تەواوی ئەورووپا لە ترسی ڕاپەڕینی ئەو ڕەوەندە کەوتنە خۆ...

بیرۆکەی نوسینی ئەم کتێبەم دەگەڕێتەوە بۆ چەند ساڵێک بەر لە ئێستا کە زۆر بە شوێن ئەوەوە بووم پێگەی ڕەوەندی کوورد لە ئەورووپا لە دووتوێ ی لێکۆڵینەوەیەکدا بخەمە ڕوو، بەڵام هەڵکەوتەی ڕووداوەکان وای کرد کە ئەم نوسینە پێش ئەوی دیکە بکەوێت چونکە ئێستا لە ئەورووپا ترسێک بەڕێوەیە، بەڵام ئەم ترسە وەک سەردەمی کارل مارکس و فریدک ئنگلس کەلە مانیفێستی کۆمۆنیستدا ( ۱۸٤۸ ) باسیان دەکرد ترس و شەبەحی کرێکاران و شۆڕشە چینایەتیەکەیان نیە، بەڵکو ترس و شەبەحی ڕەوەندی ئیسلامی و ئیسلامی سیاسیە...

لە ڕاستیدا بۆ لێکۆڵینەوەی ڕەوەندی کووردیش هەندێک بەشی ئەم کتێبە هەر پێویستە، خاڵی هاوبەشیش بۆ نزیکی هەر دوو بابەتەکە لە یەکەوە زۆرە، هەروەک چۆن نزیکەی پێنج ساڵ لەمەوبەر نوسینێکم لە ڕۆژنامەی کووردستانی نوێدا بڵاو کردەوە بە ناوی ( کوورد، لۆبی ، کۆکەکۆلا ) هەر ئاواش بەردەوام دەمویست خوێنەری ئازیزی کووردمان بە پێگەو هێزو تواناو قەبارەی ڕەوەندی کووردی ( ئەگەر بتوانم پێ ی بڵێم ڕەوەند – جالیە ) ئاشنا بکەم... هیوادارم لە ئاییندەدا بتوانم ئەو پرۆژەیەش بخەمە بەر دەستی خوێنەری هێژا..

ئیمارەتی ئیسلامی هۆڵاندا بۆ؟

هەرگیز هۆی هەڵبژاردنی ئەو تایتڵە ناگەڕێنمەوە بۆ ئەوەی کە وەک هەندێک لە نوسەران ناوێکی زل و گوندێکی وێران پێشکەش کەم، نا... ئەودەمەی بە ئەندێشەو لێکۆڵینەوە و سەردانەکانم سەرگەرمی نوسینی ئەم کتێبە بووم زیاتر لە چەند جارێک چوومەتە شوێنانێک کە هەمان یاساکانی ئیمازەتەکەی مەلا عومەر و بن لادنی تیادا پەیڕەو کراوە، گوێم لە چەندین وتارو لێدوان بووە کە سەرچاوەکانی تا ڕادەیەکی زۆر هاوتای لێدوان و لێکدانەوەی ئەشکەوتەکانی نێو تۆرا بۆرا بووە، سەردانی مزگەوتی(فورقان و تەوحید )م کرد لە هۆڵاندا هیچ دوو دڵ نەبووم کە ئەو ساتە من لە نێوان موریدو یاوەرەکانی ئیمارەتەکەی مەلا عومەردابووم.

لەوانەش زیاتر نوسینی هەندێک لە پەیڕەوانی ئەو هێڵە توند ڕەوانە و داخوازیەکانیان و لێدوانەکانیان هەموو ئاماژە بەوە دەدەن کە ئەگەر ئەوانە بارودۆخی لەباریان بۆ بڕەخسێت و توانایان هەبێت ئەوە لە نێو دڵی ئەوروپاشدا ئیمارەتێکی هاوتای تالیبان دروست دەکەن..

نوسینێکی ئەوتۆ نەك تەنها مەنهەج و پەیڕەوێکی زانستی و ئەکادیمی پێویستە بەڵکو ئەمانەتێکی ئەوتۆشی دەوێت بە جۆرێک کە نوسەر بتوانێت ڕێزو بەهای تەواو بە خوێنەری بدات و بە (ئانقەست) ژمارەکان و ڕاستیەکان ئاوەژوو نەکاتەوە، لە وەش زیاتر بتوانێت لە چەندین گۆشەوە سەیری ڕەوشەکە بکات و بە چەندین چاویش ڕووداوەکان و ژمارەکان بخوێنێتەوە..

ئەتوانم بڵێم نوسینێکی ئاوا نەک هەر ئاسان نی یە بەڵکو تاقەت پڕوکێنە، لە لایەک نەک نەبوونی سەرچاوە بە کووردی بەڵکو بابەتێک یاخود لێکۆڵینەوەیەکی ئەوتۆ لەم بارەوە بە کووردی بوونی نیە و سەرچاوەی عەرەبیش تا ڕادەیەکی یەکجار زۆر سەبارەت بە هۆڵاندا دیسان زۆر کەمە، بۆیە دەبێت زیاتر پشت بە سەرچاوەی هۆڵاندی ببەستین بۆ دەست کەوتنی زانیاری..

خۆش بەختانە مرۆڤ لە ئەوروپا هەندێک کاری بۆ ئاسان کراوە کە هەرگیز لە وڵاتانی خۆماندا ئەو کارانە ئەوها ئاسان نین، بۆ نمونە زانیاریەکان لێرە نەک زۆرن بەڵکو بەجۆرێک هەمەچەشن و وورد و بابەتین کە هەرگیز کاتت نابێت بۆ تاوتوێ کردنی زۆربەی.. بۆ نمونە زۆربە ی هەرە زۆری ئەو ژمارە و ساڵ و ووردە کاریانەی کە لەم کتێبەدا بەر چاومان دەکەون ساڵانە دەکرێنە هەزاران نامیلکەو لە لایەن سەنتەری گشتی سەرژمێرەوە بڵاو دەکرێنەوە، لە کاتێکدا لە زۆربەی هەرە زۆری وڵاتانی ئیسلامی و عەرەبی و پاشکەوتوودا نەک هەر سەرژمێرە نییە بەڵکو ئەگەر هەش بێت بۆ هەموو کەس نی یە کە چاوێک بەو ژمارە ترسناکانەدا بخشێنێت کە لە نێو ئەو سەرژمێرانەدا بەر چاو دەکەون.. بەم جۆرە زۆری سەرچاوەکان و هەمەڕەنگی بە جۆرێک نوسەر ماندوو دەکەن کە بۆڕبۆڕێنی لەگەڵ چرکەکانی سەعاتدا پێ بکەن..

لە ڕاستیدا تا ڕادەیەکیش خۆم هەست بەوە دەکەم کە گلەیی خوێنەرم هێنابێتە سەر خۆم چونکە زۆر بە ووردی ئاماژەم بە سەرچاوەکان نەداوە وەک پێویست بەڵام بە ئەمانەتەوە بە خوێنەری ئازیزم دەڵێم هەر زانیاریەک کە گوزارش لە ڕاستیەک بکات و ناوی شوێن و کات و چەندایەتی و چۆنایەتی دیاری کرابێت بەبێ سەرچاوە نەنوسراوە و هەوڵیشم داوە هەمیشە سەرچاوە لێک ئاڵۆسکاوەکان ئامازە پێ بکەم، بەڵام پێشم وایە

خوێنەری ئازیز گلەیی ئەوەم لێ نەکات کە نەتوانم یەکە یەکە ڕۆژنامەکانی سێ ساڵی ( د ڤۆلکس کرانت ) ی هۆلاندی ناو بەرم کە بەردەوام سوودم لێ بینیون و بەکارم هێناون ... پێم خۆشە ئەوەش بڵێم کە جگە لە ئەنتەرنێت بەکار هێنانی زۆربەی هەرە زۆری سەرچاوەکانی دیکە بە تایبەت ڕۆژنامەکان پارەیەکی زۆری دەوێت، چونکە لە ڕاستیدا بە شداری کردن لە یەک ڕۆژنامە زیاتر بە هەموو کەس ناکرێت..

بەپێ ی توانا هەوڵم داوە بە شەکانی ئەم کتێبە بە جۆرێک بێت کە خوێنەر هەنگاوبە هەنگاو بە بابەتەکە ئاشناکەم و بە جۆرێک پێشکەشی کەم کە تەنانەت ئەگەر هەرگیز لە هۆلانداش نەژیابێت یاخود هەرگیزیش بە ڕێبواری نەهاتبێتە ئەم وڵاتە و سەردانی هەندەرانیشی نەکردبێت، بتوانێت بە تام و چێژەوە یەک بەدووای یەک بە شوێن بابەتەکاندا بڕوات..

بە شێوەیەکی گشتیش هەوڵم داوە بابەتەکان بە جۆرێک بخەمە ڕوو کە لە چەند ڕوویەکەوە ئاسانکاری پێشکەش بە خوێنەر بکات چ لە ڕووی شێوازی داڕشتنەوە یان لە ڕووی شێوازی دەربڕینەوە، هەوڵیشم داوە بە جۆرێک یەکخستن لە نێوان بابەت و بە شەکاندا بکەم کە شیکردنەوەی هەر لایەنێک لە لایەنەکانی کێشەکان لە دیدی ئەو لایەنەوە بخەمەوە ڕوو پاشان هەڵی سەنگێنم، دەبێت ئەوەش بڵێم کە بە پێوستم نەزانیوە زیاد لە پێوست درێژ دادڕی بکەم.

ڕیزبەندی بابەتەکان و پێشکەش کردنی بە خوێنەر هەندێک جار ناچاری کردووم لە چەند شوێنی جیاوازدا بابەتێک دیسانەوە ئامارژە پێ بکەمەوە بەلام دیسان بۆ ئەوەی خوێنەری هێژا توشی وەڕس کردن و دووبارە کردنەوە نەکەم هەمیشە هەوڵم داوە پوختەی ئامارژە کردنەوەکە بە جۆرێک لە خزمەتی نوسینەکەدا بێت کە خوێنەر نەک هەر وەڕس نەبێت بەڵکو تامەزرۆی زانیاری زیاتر بکات لەمەڕ هەمان بابەت و لێکدانەوە..

لە کۆتایدا هیوا دارم کە ئەم هەوڵەم وەک خزمەتێکی وشەی کووردی پەسەند بکرێت و خاوەن خامەی بە بڕشت دوودڵ نەبێت لە ئاراستە کردنی ڕەخنەو سەرنجەکانی ... پڕ بە دڵیش سوپاس بۆ هەموو ئەو دڵسۆزانەی کە هاوکاریان کردووم..

ڕێکەوت ئیسماعیل ئیبراهیم
هۆلاندا ٦-٨-٢٠٠٥

## بەشی یەکەم:-

### شانە خەوتوەکان یان شانە خەو زڕاوەکان:

سە دە ی بیست و یە ك بە جە نگی جیهانی سێهە م دە ستی پێ کرد، جە نگی دژ بە تیرۆر، وە ك هە موو جە نگە کانی دیکە کا ت و شوێنی دە ست پێ کردنی زانراوە، ١١ی سێپتێمبە ری ٢٠٠١ لە مانهاتن، بە ڵام بە پێچە وانە ی هە موو جە نگە کانی دیکە وە ئە م جە نگە لە لایە ن دوو بە رە و ە بە ڕێ دە کرێت، بە رە یە کیان پڕ چە ك و دە وڵە مە ند و بە هرە مە ند بە تازە ترین جۆری تە کنە لۆژیا. بە رە کە ی دیکە ش هە ژار و کە م چە ك و توانایە کی دیاری کراوی هە یە ، جیاوازی هە رە گە ورە ش لە نێوان ئە م دوو بە رە یە دا ئە وە یە کە لا یە کیان ئامادە یە بکوژرێت بە ڵام ئەو ی دیکە ئامادەیە بژی...

بە رە ی دووەمی ئە م جە نگە ئیسلامی سیاسی توندڕەوە ، شوێن و جوگرافیای چەسپاوی نی یە و هە ر دە مە ی لە بستێکی ئە م گوندە زە بە لاحە وە سە ر دە ر دێنێ و پاشان وون دە بێت.

ئـاگری جـه نـگ گـه یـشته ئـه فگانـستان و عێـراق و پاکستان و ئیسپانیاو سعودیه و دوکەڵەکەشی بە سە ر چە ندین وڵاتـی دیکە ی دنیادا باڵی تاریکی کێشاوە .

رژێمی تالبان کە هە تا کاتی مانەوە ی گە ورە ترین شـە رمـە زاری بـوو بـۆ کۆمە ڵگای نێو دە وڵە تی لە نـا و بـرا و دیکتـاتۆری عـراقیش پـاش تیـاچونی ڕژێمـە کـە ی لـە کـونجی زینداندا تونـدکراو کۆتـایی بـە حـوکمی ڕە شـی دوو رژێمی قێزەون هێنرا.

باندە تیرۆریستە کـانیش بـە هـە مـان شێوە تواناییـان زۆر کـە م کرایـە وە و ژمارە یەکی زۆریشیان لێ کوژرا یاخود دە ستگیر کرا.

لـە ئـەمـەریکـا هێرشـەکـانی سێپتێمبەر لـە لایـەن ئـەو شـانـە ئیسلامیانـەوە ئەنجام درا کە پاشان ناو نران شانـە خـەوتوەکان یان ( نوستووەکـان). بـەڵام هەمان ئەو شانـە خـەوتوانـە ناو بەناو لە خـەو ڕادەچـەنـن و لـە سوچێکی ئـەم دنیایەوە زەبرێک دەدەن و دەخـەونـەوە..

ڕوداوەکـانی مـەدرید و لێکوڵینـەوەکـانی پۆلیسی ئیسپانیا ئەوەی پیشاندا کـە هەر لـە ساڵی ١٩٩٤ وە ئـەو وڵاتـە بۆتـە لانکـەی حـەواندنـەوە و تۆکمـە کردنـی گروپـە ئیـسلامیە ترۆرسـتـەکـان، بـەریتـانیـاش هـەتـا ڕۆژی ئـەنجامـدانی هێرشـەکـان نـەک تـەنها لانکـەو وڵاتـی دووەمـی توند ڕەوە ئیسلامیەکـان بـوو بەڵکو تەواوی حکومەتە ئەوروپییەکانیش لە بێ دەنگی لەندەن بەرامبـەر بـە گروپەکانی وەک ئـەبو قەتادەو ئەبو حەمزەو عومـەر بەکری سـەری سوڕمابوو، هەر وەک ئـەوەی کە ڕیکـەوتنێکـی شـاراوە لـە نێواندا هـەبێت و لـەم کـەین و بەینەدا لـەندەن دەستی گرتبێت بە کڵاوەکەی خۆیەوە بۆ ئەوەی بای ئیسلامی نەیبات ... ئیتالیاش کە هەتـا شـەڕی بوسنە باشترین ترانزێتـی پـەڕینـەوەی ئیسلامیەکان بوو بۆ جیهادی بەلقان، دەرکـەوت کـە لـەم دووایانـەدا باشترین مـەڵبـەند بـووە بـۆ گواستنەوەی خۆبـە خشە عـەرەبـەکان بـە سـەرپـەرشتی ( بەرەی ئیسلامی تونسی ) بۆ شەڕی دژ بە ئەمەریکا لە عێراق بێ گومـان ئـەم کارانـەش بە گشتی هەر لە لایـەن ئـەو شـانـە خـەوتوانـەوە بـە ڕێوە چووە کـە ئیتر لە تـەواوی ئـەوروپادا نـەک بە خـەبەر هاتوون بـەڵکو خـەویشیان زڕاوە.

سەرچاوەی مرۆیی ئـەم هەمـوو گـروپ و دەستـەو تـاقم و بـاڵ و ڕێکخراوانـەی ئیـسلامی سیاسـی بریتیـە لـە ( ڕەوەنـدی ئیـسلامی )، ئـەمـرۆ لـە ئـەوروپـاو ئەمەریکادا ڕەوەندێکی ئیسلامی ئەوتۆ بەهێز هەیە کـە ژمـارەی ئـەنـدامانی خۆی لـە ٢٢- ٢٥ ملێون دەدات... ئـەم ڕەوەندە کە کە بـەشێوەیـەکی سـەرەکی لـە ساڵانـی پـەنجای سەدەی بیستـەمەوە دەستیان بە کۆچ کرد لە هەندێک لـەو

ولاَتانەی کە تیایدا دەژین چی دی نەک کۆچ بەر نین بەڵکو بونەتە هاولاَتی و ڕەگەز نامەیان هەیە و لە ژیانی سیاسی و ئاینی و کۆمەلاَیەتی و فەرهەنگی ئەو کۆمەڵگایانەی کە تیادا دەژین ڕۆلی کاریگەریان هەیە، بەلاَم پرۆسەی بە هاولاَتی بونیان نەک هەر نەیکردونەتە هاولاَتیەکی ئەوروپی بەڵکو بەجۆرێک نامۆی کردوون کە زۆربەی هەرە زۆریانی توشی حاڵەتی ونبوون کردووە.

سەنتەری ( نیکسۆن ) ی ئەمەریکی ساڵی ٢٠٠٤ لە یەکێک لە تویژینەوەکانی خۆیدا پاش لێکدانەوەی ٣٧٣ دۆسیەی جیهادی لە ئەوروپاو ئەمەریکا گەیشتە ئەو دەرئەنجامەی کە ڕێژەی ٢٥% ی جیهادیەکان موسڵمانی ئەوروپین ( واتە لە ئەوروپا پەروەدە بوون ). سەنتەرەکە لە تویژینەوەکەیدا دەڵێت: ژمارەی جیهادیە فەرەنسیەکان دوو هێندی جیهادیە سعودیەکانەو ژمارەی جیهادیە ئینگلیزیەکانیش زۆر لە جیهادیە سودانی و یەمەنی و ئیماراتیەکان زۆرترن.

هاوشێوە ی زۆربە ی دە وڵە تە رۆژ ئاواییە کان هۆلاَنداش بەرە یە کە لە جە نگی دژ بە تیرۆر و سە ر بازە هۆلاندیە کان بە چە ندیین ولاَتی دنیادا بلاَو بونە تە وە و لە چە ندیین لاشە وە ڕاستە و خۆ لەو جە نگدا بە شدارن. هە رچە ندە هاوشێوە ی ئە مە ریکا و ئیسپانیاو بەریتانیا ڕووداوی زۆر خوێناوی ڕووی نە داوە و هولاَندیە کان ولاَتە کە یان بە ئارام ناو دە بە ن، بە واتای گە رمی جە نگ هێشتا جە نگی سارد دژی ئیسلامی سیاسی پە یڕە و دە کرێت بە لاَم دیسانە وە ئامارەکان وای نیشان دە دە ن کە دەوڵە ت لە حاڵە تی ئامادە باشیدا بێت بە تایبەت پاش تەقینەوەکانی لەندەن هۆلاَندا هەمان ڕۆژو دەست بەجێ وێرای ئەمستەردام چەندین شاری دیکەی گەورەی خستە بن چاو، هەر ڕۆژێک پاش ئەو هێرشانە وەزیری ناوخۆی ولاَت ڕایگەیاند کە لە نێوخۆی هۆلاَندا نزیکەی ٢٠ گروپی توند ڕەو هەنە کە ئامادەن لە هەموو ئان و ساتێکدا دەست بووەشێنن، هەر ئەم ڕاستیەش بوو کە وای لە پۆلیسی هۆلاَندا کرد ڕۆژی ١٤ی ئۆکتۆبەری ٢٠٠٥ لە چوار شاری جیاوازدا لە هۆلاَندا حەوت لەو گومان لێکراوانە دەستگیر بکات کە بە پێ ی وتەی پۆلیس سەرقاڵی ئەوە بوون چەک تەقەمەنی پەیدا بکەن بۆ ئەنجام دانی کردوەی ترۆرستی...

ئەمرۆ لە تەواوی دنیای ئەوروپادا ترس لەو بونەوەرە نەماوە کە جاران پێیان دەگوت ( عەرەبە ئەفگانیەکان ) ، هەروەک چۆن پێشم وایە لە ئایندە ( ئەو موجاهیدانەی کە ناو دەنرێن –گەڕاوەکانی عێراق یاخود موجاهیدەکانی

نێو شەڕگەکانی فەلوجە ) مەترسیەکی ئەوتۆ بۆ سەر ئەوروپا دروست ناکەن.
ئەمڕۆ مەترسیەکە لە نێو خودی ئەوروپادایە، ئەو ئەوروپیانەی کە بە ڕەچەڵەک موسڵمانن و لە نێو کۆمەڵگا ئەوروپیەکاندا بە شوێن شوناسی لە مێژە ونبووی خۆیان دەگەڕێن و بۆیان نادۆزرێتەوە.
لێرەدا هەوڵ دەدەین هەنگاو بە هەنگاوی ڕوداوەکان و گەشەسەندنەکانی هۆڵاندا لەمەڕ ئیسلامی سیاسی و کردەوەی ترۆرستی بخەینە بەر دەمی خوێنەر..

**کوژرانی فورتایین:**
جەنگی سارد دژی ئیسلام یەکێك بوو لە جاڕنامەکانی پرۆفیسۆر **Pim Fortuyn 1948-2002**
بەر لە پەیدا بوونی ئەم پیاوە ئیسلامی سیاسی و زەق بوونەوەی کێشەی ڕەوەندی ئیسلامی ( جالیەی ئیسلامی ) هەرگیز بایەخێکی ئەوتۆی لە نێو هۆلاندا نەبوو بەلام هەڵبژاردنەکانی هۆڵاندا لە مانگی مەی ساڵی ٢٠٠٢ تا ڕادەیەکی زۆر گرەوە سیاسیەکانی سەرەو ژێر کرد ئەوەی لەم هەڵبژاردنەدا تازە بوو سەرهەڵدانی گروپێکی نوێ بوو بە ڕابەری پرۆفیسۆری ناو براو.

فۆرتایین مامۆستای زانکۆ بوو لە ماوەیەکی زۆر کورتدا توانی سەرنجی جەماوەرێکی زۆر بۆ خۆی ڕاکێشێت و لە لێدوانەکانیشیدا دڵنیا بوو لەوەی کە خۆی سەرۆك وەزیرانی ئایندەی وڵات دەبێت.
هۆی جەماوەری بوونی ئەم پیاوە تەنها ئەوە بوو کە ڕاست و ڕەوان و ڕاشکاوانە ڕەخنەی توندی ئاراستەی ئیسلام و ئیسلامی سیاسی و بێگانەکان دەکرد. کتێبەکەشی بە ناوی (دژی بە ئیسلام کردنی کلتورمان - **Tegen de islamisering van onze cultuur 1997** ) ببوە ئینجیلی تازەی ئەوەنەوە نۆییەی هۆڵاندا کە حەزی لە چارەی بێگانە نەبوو.
لە بانگەشەی هەڵبژاردندا فۆرتایین بێ ڕەحمانە ڕەخنەی توندی ئاراستەی تەواوی حزب و حکومەتەیەك لە دوای یەکەکانی هۆڵاندا دەکرد و پێی دەگوتن ( وەك نەعامە سەریان کردۆتە ژێر لمەوە).

رۆژی ٦-٥-٢٠٠٢ فۆرتایین ده وروبه ری کاتژمێر ٦ ی ئێواره لـه شـارۆچکه ی هێلڤه رسوم - پاش ئه نجامدانی چاوپێکه وتن لـه گه ڵ که ناڵێکی رادیۆییدا پێشکه شکه ری به رنامه که لێ ی پرسی:-

- به رای خۆتان چه ند ساڵ ده ژیین ؟
فۆرتایین وەڵامی دایه وه:
- من هه میشه گوتومه ٧٦ ساڵ ده ژیم، هه ر واش ده بێت..
فۆرتایین ته نها چه ند خوله کێك بـوو وه ڵامـی پرسـیاره کـه ی دابـۆوه، لـه هاتنه ده ره وه یدا درایه به ر گولله و کوژرا..
ئه و ده مه ی فۆرتایین کوژرا ته واوی میدیای هۆڵانداو ته نانه ت چه ندین میـدیای جیهـانیش ڕاسـته و خـۆ ڕووداوه کـه یـان ده گواسـته وه ، هـه مـوو کۆمەڵگای هۆلاندیش به بێگانه کانیشەوه ده ستیان لـه سـه ر دڵیـان دانـابوو چونکـه پێـشتر فۆرتـایین هـەڕه شـه ی زۆری لـەلایـەن ئیـسلامیەکانـەوه لـێ کرابوو، هـه مـوو ئامـاژه کـانیش بـۆ ئـه وه ده چوون کـه بکـه ری کـاره کـه کـه سێکی ئیسلامی بێت و ئیتر کێشه ی نێوان ڕه وه ندی ئیسلامی و هۆڵاندا بکـه وێتـه سه ر جاده و به ره و ئاقاری توندو تیژی مل بگرێتـه بـه ر . بـه ڵام دڕه نگه وه ختی ئه و شه وه ، ووته بێژی پۆلیسی ئـه و شـاره ئـاوی ساردی کرده دڵـی هـه مووان و ڕای گـه یانـد کـه بکـوژی گومـان لێکـراو ده سـتگیر کـراوه و کابرایه کی قژ زه ردی باڵا بـه رزی چاو شینـه ، ئه م لێدوانه ی ووته بێژه که بۆ ئه وه بوو که بڵێت (مـه عنـی هـا بکـوژه کـه موسڵمـان نییـه و ئیتر کـه س خۆی سه غڵه ت نه کات).
ئه و فیشه کانـه ی ئاڕاسته ی فۆرتایین کران پێنج فیشه ك بوون و پێنج شه به قی گه وره ی کرده نێو جه سته ی هۆڵانـداوه... ئـه و وڵاتـه ی سـه رۆك وه زیرانـی بـه سواری پاسکیل ده چووه سـه ر کـار بـه بـێ ئـه وه ی تاقـه یـه ك پۆلیس بـه شوێنیـه وه بێت و پتر لـه سێ سه د ساڵ بوو کوشتنی سیاسی تیایدا ئه نجا م نه درابوو.

**کوژرانـی ڤان کۆخ :**

ده ر هێنه ری سینـه مایی هۆڵانـدی تـه یو ڤـان خـۆخ ( Theo van Gogh/ ١٩٥٧-٢٠٠٤ ) به که سێکی ئاتـه یست ( باوه ڕی به بوونی خودا نـه بوو ) ناسرابوو ، لـه وه ش زیاتر ماوه یه کی زۆر بوو لـه ڕێگای ماڵپـه ڕه کـه ی خۆیـه وه وێرای دژایه تـی کردنـی ئیسلام ، تـه شه ر لێدان و قسه پێ گوتن و تـه نانـه ت جنێو پێدانیشی کۆ لێ نه ده کرده وه. لـه ڕێگای ده رهێنانـی فلیمێکه وه بـه نـاوی (

مل كه چی - Submission ) ڕه خنه ی توندی ئاراسته ی ئیسلام كرد له مه ڕ مامه ڵه كردنی ژنانه وه.

ئه و فلیمه ی ڤان خۆخ هێنده ی تر قوڕه كه ی خه ست كرده وه ، سه ر له به یانی ڕۆژی ٢-١١-٢٠٠٤ لاوێكی هۆلاندی به ڕه گه ز مه غریبی ته مه ن ٢٦ ساڵ به ناوی (موحه مه د. بویه ری- Muhemed . B) هه ستا به كوشتنی ئه م ده رهێنه ره و هه ر وه ك هه ندێك سیاسه ت

مه داری ولات ئاشكرایان كرد جه نگ له گه ڵ تیرۆر خۆی گه یانده هۆلاندا.

زۆری نه خایاند بكوژه كه ده ستگیر كراو پاشان ئه ندامانی تۆڕه كه شی یه كه یه كه ده ستگیر كران، ئه وه ی لێره دا بۆ خه ڵكی هۆلاندا ئاشكرا بوو قه باره ی ئیسلامی سیاسی و مه ترسیان بوو. ئتر هه ست كردن به مه ترسی له نێو هۆلاندیه قژ زه رده كان ( ڕه سه نه كان )

به رامبه ر به هۆلاندیه قژ ڕه شه كان ( ناڕه سه نه كان ) بووه دیارده یه كی به رده وام و هه میشه له میدیاكانیشدا ئاماژه ی پێ ده درا.

موحەمەدی ٢٦ ساڵە بە پێ ی زانیاریەكانی پۆلیس ئەندامی شانەیەكی گەورەتری تیرۆریستە ئیسلامیەكان بوو كە پاشان بە شانەی ( پایتەخت) ناوی برا، بەر لەوەی ئەوكارە ئەنجام بدات لە ژێر چاودێری پۆلیسدا بوو، دوو جاریش دەستگیركرابوو بەڵام لەبەر نەبوونی بەڵگە لە دژی ئازاد كرابوو. ئەم لاوە پاش ئەوەی لە نێو كۆڕو كۆبوونەوەی مەغریبیەكاندا زۆر كاری تێكرابوو، لە یەكێك لە مزگەوتەكانی تایبەت بە ڕەوەندی مەغریبی ڕێكخرابوو.

ئەم فلیمە موحەمەدی هەژاندو وەک بێ حورمەتی بە بەهاپیرۆزەكانی ئیسلام لە قەڵەمی دا، بۆیە بە ئەركی سەرشانی خۆی هەستاو لە نێو شاری ئەمستەردام پاش ئەوەی بە دەمانچەكەی كەوتە تەقەلێكردنی ڤان خۆخ و كوشتی، هاوشێوەی برا موجاهیدەكانی فەلوجەی بە خەنجەرێكی ئیسلامی كەوتە هەڵهێنانەوەی لاملی و پاشان چەقۆكەشی لەگەڵ نامەیەكی هەڕەشە ئامێزدا بەسەر سنگی (ڤان خۆخ) ەوە بە جێ هێشت كە لەبەشەكانی داهاتوودا ئەو نامەیەو ئاكامەكانیشی دەخەینە ڕوو.

ڕووداوی كوشتنی ئەم هونەر مەندە تەواوی كۆمەڵگای هۆلاندی هەژاندو ڕووداوەكانی ١١ی سێپتەمبەری ئەمەریكاو ١١ی ئازاری مەدریدی وەبیر دەهێنایەوە، دەتوانم بڵێم لەو ڕۆژەوە درزەكانی نێو كۆمەڵگای هۆلاندی زیاتر دەلاقەیان تێ بووەو وەک دوو بەرە بەرامبەر بە یەكتر دێنە بەر چاو،

بەرەی یەکەم بەرەی ئەو هۆلاندیانەیە کە لەبنەڕەتدا هۆلاندی نین و زۆربەی ڕەوەندی ئیسلامی و پەنابەران و بێگانە پێست ڕەش و ئەسمەرەکان دەگرێتەوە، بەرەی دووەمیش بەرەی هۆلاندیە ڕەسەنەکانە کە زۆربەی مەسیحیەکان و قژزەردەکان و ڕاستڕەوەکانیش دەگرێتەوە.

بەرەی دووەم هۆلاندیەو خۆی بە خاوەنی هۆلاندا دەزانێت و لە ڕێگای میدیاو ڕێکخراوەکان و پارت و دامەزراوە دەوڵەتیەکانەوە شەڕێکی ئاشکراو نهێنی دژ بە بەرەی یەکەم پیادە دەکات، داخوازی ئەوەیە کە وڵاتەکەیان لە شەڕی بێگانەکان بپارێزن.

بەرەی یەکەمیش هەر هۆلاندیە بەڵام خۆی بە خاوەنی وڵات نازانێت و لە ڕێگای مزگەوت و کۆمەڵەو ڕێکخراوە تیرۆریستەکانیەوە دەیەوێت جەنگی پیرۆز ( جیهاد ) دژی بەرەی خاچ پەرستی دووەم بکات.

ئە گە رچی تە یۆ ڤان خۆخ وە ك فنسنت ڤان خۆخی[1] ئامۆزای خۆی گوێچکە ی خۆی نە بڕی! بە ڵکو ئیسلامی سیاسی هاوچە رخ لە ئە ورووپا لە کلتوری سە ر بڕینە وە مۆدێلی گوێ بڕینی سیاسی داهێناو تەیۆ ڤان خۆخی دەرهێنەری پێ ترۆر کرد، ئەوەی هۆلاندیەکانی نیگەران کرد لەم کردەوەیەدا جگە لە کارە ترۆریستیەکە ئەوە بوو کە ئیسلامی سیاسی وەڵامی هونەری بە فیشەک دایەوە لە کاتێکدا دەیان توانی ئە وانیش بە فلیمێکی دیکە یاخود لەڕێگای دادگاوە کاری خۆیان لە گە ڵ ئە و دە رهێنە رە و هاوکارە کانیدا یە کلا بکردایە تە وە...

موحەمەدی بکوژی ڤان خۆخ بەم کارەی گەورە ترین خزمەتی بە دوژمنانی ڕەوەندی ئیسلامی و ئایینی ئیسلام کرد، ئەوانە بە پێچەوانەوە دەبوو نەک دەمارگیر نەبوونایە بەڵکو بەهۆی کرچ و کاڵی خستنەڕووی بابەتەکەو لاوازی هونەرییەوە فەرمۆشیان کردایە، ئەم کوشتنە بە هێندی زامەکانی سەر جەستەی ڤان خوخ زامی کردە جەستەی لاوازی ڕەوەندی ئیسلامی ، ئەو زامە هێندە بە سوێ بوو دەرئەنجامەکەی تەنها سوتاندنی چەندین مزگەوت و ئەنجامدانی چەندین هێرش نەبوو بۆ سەر ڕەوەندی ئیسلامی بەڵکو دەرنجامێکی لێ کەوتەوە کە سەراپای ڕەوەندەکە وەک تاوانبار سەیرکرێت و بخرێتە گۆشەی گومانەوە، موحەمەد نەیزانی فیشەکی دەمانچەکەی بەر لەوەی ڤان خۆخ بکوژێت و ساردی کاتەوە ، جەستەی ڕەوەندی ئیسلامی خەڵتانی خوێن دەکات.

## شانشینی هۆڵاندا .. یاسا و دە ستور:

دە وڵـە تـی هۆڵانـدا یـە کێکـە لـە شـا نـشینە کۆنـە کـانی ئـە وروپـا. خێزانی (ئۆرانیا - Oranja) بە میراتی لە سە ر کورسی شاهانە دادە نیشن. هە ر وە ك مێژووی تە واوی ئەوروپا ، مێژووی سە رهەڵدانی ئە م بنـە ماڵـە یـە و قۆناغـە کـانی بـە دە سـتگرتنی حوکمیـان ئـاڵۆزە و چـە نـدیین جـار گۆڕانکـاری بـە سـە ر دا هـاتووە ، لـە گـە ڵ دروسـت بـوونی هـە مـوو ئـە و گۆڕانکاریانە و پێشکە وتنی چە مکی دیموکراسـی و مافـە کـانی مرۆڤیش،جـار لە دوای جار دە سە ڵاتی پاشاکانیش کە م بونە تە وە تا ئە و ڕادە یـە ی ئـە مرۆ بـە ر چاومـان دە کـە وێت کـە پاشای هۆڵانـدا بـە پـێ ی دە ستور دە سـە ڵاتێکی ئە وتۆی نی یە.

لە ڕاستیدا لە ناوە ڕاستە کانی سە دە ی نۆزدە هە مە وە ئیتـر بـارو دۆخـی ئە م وڵاتـە هێندە ئارام بووە ئە گە ر هە ردوو جە نگـی جیهـانی لـێ دە ر کـە ین هە میشە بە دوور بووە لـە جە نگ، یاساو دە ستور هێندە تیایدا چە سپیوە کە زۆر لـە و بابـە تانـە ی لـە وڵاتـە ئیسلامیە کاندا هێشتا یـە ك لا نـە بۆتـە وە لە هۆڵاندا زۆر دە مێکە بۆتـە یاساو پە یڕە و دە کرێت[٢].

یـە کـە م دە ستوری هۆڵانـدا کـە بـە دە نگدان و ڕە زامـە نـدی زۆرینـە قبـوڵ کرابێت ساڵی ١٨٤٨ نوسراوە تە وە ، هە ڵبـە تـە زۆر پێشتر دە ستوری وڵات و یاساکان لـە ئارادا بووە بـە ڵام تـا ئـە و مێژووە بـە شێوە یە کی سە پێنراو بووە نە ك بـە دە نگدان.

هـە ڵبژاردن لـە هۆڵاندا مێژوویێکی کۆنـی هـە یە ساڵی ١٧٩٥ بۆ یـە کـە م جـار ئـە نجام درا.

هە ڵبژاردن سە رە تا تە نها بۆ پیاوان بوو ، هـە ر وە هـا بـۆ ئـە و کـە سانـە بوو کە دە وڵە مە ند و خاوە ن زە وی و زار بوون و باجیان بـە دە وڵـە ت دە دا. پاشان وورده ووردە مـە رجـە کـان کـە م کرانـە وە تـا وای لـێ هـات سـاڵی ١٩١٩ ژنـانیش بۆیان هە بوو دە نگ بدە ن .

شێوازی حوکم لـە هۆڵاندا پارلـە مانی و دیموکراتییە ، پارلـە مـان پێك دێـت لـە ژووری یە کە م و دووە م، ژووری دووە م لـە ڕێگای هـە ڵبژارنـە گشتیە کانە وە دیاری دە کرێن و هـە ر چوار ساڵ جارێـک تـەواوی پارتـە سیاسـیەکـان ئـەوانـەی بـەشداری هـەڵبژاردن دەکـەن ١٥٠ کورسی پارلـەمان پڕدەکـەنـەوە.

کلتوری دیموکراسی لەم ولاتەدا هێندە ڕەگی داکوتیوە کە هیچ کەس و لایەنێک ناتوانێت خۆی لە سەرو یاساوە ڕاگرێت، هە میشە سندوقی دەنگدان و دادگا کێشەکان یەکلا دەکەنەوە، بۆیە هیچ کاتێک بردنەوەی بەردەوام و هەمیشەیی بۆ هیچ پارتێک نی یە.

ڕۆژی هەڵبژرادن وەک هەموو ڕۆژانی دیکەی ژیانە بنکەکانی دەنگدان کاتژمێر ٧:٣٠ سەرلەبەیانی هەتا ٩ ی شەو بۆ دەنگدان لەسەر پشت دەبن، بێ ئەوەی تێبینی ئەوە بکەین کە ژمارەی پۆلیس یان ئاسایش لە ڕۆژانی ئاسایی زیاتر بێت یاخود بنکەکانی هەڵبژاردن بخەنە ژێر چاودێری.

بەرلە هەڵبژاردن چەندین نامیلکەوبلاوکراوەو ماڵپەڕی ئەنتەرنێت تەنانەت بە( MSN ) یش دەنگدەران ئاگادار دەکرێنەوەو زانیاری زۆر وورد لەسەر تەواوی پارتەکان دەست دەکەون و چەندین هێڵی تەلەفۆنیش بۆ وەڵام دانەوەی پرسیارەکانی هاولاتیان دەخرێنە خزمەتەوە.

گرنگترین پارتە سیاسیەکانیش ئەمانەن:

**C.D.A**

پارتی دیموکراتی مەسیحی ساڵی ١٩٨٠ لە ئەنجامی یەکگرتنی ٣ گروپی سیاسی کە هەر لەساڵی١٩٧٣ وە فدراسیۆنێکیان پێک هێنابوو، دروست بوو، بە یەکێک لە پارتە مەزنەکانی ولات دەژمێردرێت.

**PvdA**

پارتی کرێکاران کە پارتێکی سۆشیال دیموکراتە ساڵی ١٩٤٦ بە یەکگرتن لەگەڵ دوو پارتی دیکەدا دروست بوو، یەکێکە لە پارتە گەورەکانی ولات..

**V.V.D**

پارتی گەلی ئازادی و دیموکراتی، پارتێکی لیبراڵە، ساڵی ١٩٤٨ وەک تەواو کاری پارتی ئازادی دروست بوو. ئێستا بە ٦ وەزیر و ٢٧ ئەندام پارلەمان بەشداری لە حکومەتدا دەکات.

**SP**

پارتی سۆشیالیست ساڵی ١٩٧٢ دروست بووە. ئێستا بە سێهەم پارت دەژمێردرێت و نزیکەی ٥٠ هەزار ئەندامی هەیە.

چەپی سەوز **Groen Links**

ئەم پارتە ساڵی ١٩٩٠ لەسەر بنەماکانی پاراستنی ژینگە دروست بوو، لە یەکگرتنی چەندین گروپی دیکە خۆی ڕاگەیاند.

دیموکراتی ٦٦ **D66**

ئـەم پارتـە كـە پـارتێكی پێشكەوتـن خـوازی سۆشـيال ليبراڵـە سـاڵی ١٩٦٦ دامەزراوە.

**PRDV**

ئەم پارتە ( پـارتی دادپـەروەری و جـێ بـەجـێ كـردن و پێشكەوتـن) كۆتـايی مـانگی ئـاپرلی ساڵی ٢٠٠٥ ڕاگەيەنـرا، سـەرۆكی پارتـەكـە (Peter.R. de Vries ) پێشكەش كەری بەرنامەيەک بوو لـە ڕووداوەكـانی كوشتن و تـاوانی دەكۆڵيەوە.

جگـە لـەو پارتـانـە چـەندين پارتـی بچوكـی ديكـە هـەنـە كـە كاريگـەريان لـەسـەر گـۆڕەپـانـی سيـاسـی زۆر نـيـە. هـەروەهـا چـەنـد ئـەنـدام پارلـەمانێكيش كـە بـە تـەنـها خۆی لـە پارتێک جيابۆتـەوە و ليستێكی پێک هێناوە بۆ ئـەوەی لـە هـەڵبژاردنـی تازەدا بـەشدار بێت لـەوانـەش Geert Wilders كـە لـە پارتی گـەلی ئـازادی و ديموكراتی و Ali Lazrak لـە پارتی سۆشياليست جيابوونـەتـەوە.

## كورتـە مێژوويـەكی هۆڵاندا:

ديارە يەكێک لـە لاپـەڕە پرشنگدارەكـانی مێژووی ئـەوروپا ئـەوەيـە كـە ڕووداوە مێژووييـەكـانی (مێژوو) ی كۆنی خۆيان زۆر بـە باشی ئـەرشيف كردووە، ئـەمـەش وادەكات كـە نووسين و لێكۆڵينـەوە لـەسـەر مێژووی هـەريـەكـە لـەو دەوڵـەتـانـە بۆ خودی مێژوونوسـانيش ئـاسـان نـەبێت، بـەڵام لـە نوسينی بابـەتێكـی ئـاواشـدا ناكرێت ئـاماژە بـە مێژووی هۆڵاندا نـەدەيين هـەرچـەنـدە كـورت و خێـراش بێت، ديارە ئـەمـەش لـە پێناوی ئـەوەدايـە كـە خوێنـەری هێژا بتوانێت لـەمـەڕ ڕووداوە هاوچـەرخـەكـانی ئـەمڕۆ تێگـەشتنی خۆی هـەبێت وباشـترو خێراتـر وەڵامـی ئـەو هـەموو لێدوان و بڕيـار و ڕووداوانـەش دەست گـەوێت كـە ڕۆژانـە ڕوودەدەن و پـەيوەندی ڕاستـەوخۆيان هـەيـە بـەوەوە.

مـەسـەلـەی ئـايين تـەنـها ئـەمڕۆ نـەبۆتـە جێگـەی مشت و مڕ بـەڵكو وەک تـەواوی مێژووی ئـەوروپـا، هۆڵانـدا بـەو شێوە جوگرافيايـەی ئـەمڕۆی بـە هـەڵكـەوتـەی جيۆسياسيشـەوە تـەنـانـەت بـە دەسـەڵاتـی سياسـی و خێزانـی شـاهانـەشـەوە نـەخشـەيـەكـە ڕاست و ڕەوان جێگـە پـەنجـەی كێشـە ئـايينيـەكـان و كـەنيسـەی بـە زەقی پێوە ديارە، ئـەگـەر سـەيری نـەخشـەی جوگرافيـای خـواروخێچی هۆڵانـدا بكـەيـن ئـەوە زۆر بـاش هـەست بـە ئـاڵۆزی ملـمـلانـێ ئـاييني و ئـەتنيـەكـان دەكـەين.

ئاسەواری کۆنترین مرۆڤ لە وڵاتی زەویە نزمەکان( Nederland ) ساڵی ١٩٧٦ لە کەنار ڕووباری ڕایین( Rhenen ) دۆزرایەوە کە تەمەنی ١٥٠ هەزار ساڵ بوو، پاشان زۆری نەخایاند لە باشوری وڵاتیش پەیکەری مرۆڤێکی دیکە دۆزرایەوە کەتەمەنی ٢٠٠ هەزار ساڵ بوو ئەم مرۆڤە ناو نرا نیاندەرتاڵ ( Neanderthaler ) لە بەر ئەوەی لە دۆڵی نیاندەر کە دەکەوێتە نێوان ( Elberfeld & Dusseldoorf ) دۆزرایەوە. پێنج هەزار ساڵیش بەرلەدایک بوونی عیسامرۆڤی نیشتەجێ لە باشوری هۆڵاندا لە گوندی Stein و Elsloo ژیاوە.

مێژووی کۆنی هۆڵاندا ئامارژە بە قەڵەم ڕەوی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمەکان دەکات لەو ناوچانەی کە ئەمڕۆ بە هۆڵاندا یاخود زەویە نزمەکان ناسراوە.

ڕۆمەکان دەوروبەری ٧٠٠ ساڵ بەر لە عیسا فەرمان ڕەوای تەنها شارێک بوون، پاشان دەستیان گرت بە سەر ئیتالیای ئەمڕۆداو پاشان باشوورو ناوەڕاستی ئەوروپاو ئەوجا دەسەڵاتی خۆیان درێژکردەوە هەتا سوریای ئەمڕۆ.

ساڵی ٥٧ بەر لە عیسا ڕۆمەکان هێرشیان کردە سەر هۆڵاندا، بەڵام لە ژێر فشاری بەرەنگارییەکی زۆر پاشەکشەیان کرد، ئەمجارەیان ساڵی ١٢ بەر لە عیسا بە سوپایەکی زۆرەوە هاتنەوەو بەتەواوی دەستیان بەسەردا گرت.

کاریگەری ڕۆمەکان لەسەر هۆڵاندا بەهۆی دووری نێوانیان زۆر لاواز بوو، بەڵام بەهۆی هەڵکەوتەی جوگرافی سەر دەریاوە بایەخی جوگرافی هۆڵاندا هەمیشە زیادی کردووە، لەگەڵ کز بوونی ئەستێرەی ڕۆمەکان و کزر بونەوەو گرژبوونەوەی دەسەڵاتیان ووردە ووردە لە نێوخۆی هۆڵاندا دەسەڵاتە ناوخۆییەکان بەهێزدەبوون و فەرمان ڕەوای ناوچەکان دەسەڵاتی خۆیان زیاتر بڵاودەکردەوە.

هەڵبەتە دروست بوونی چوارچێوەی جوگرافی هۆڵاندا بەم جۆرەی ئێستای کە هەیە، هەرگیز لە مێژووی کۆندا بەو جۆرە نەبووە، بەڵکو هەروەک مێژووی تەواوی ئەوروپا هەمیشە ناوچەکە لەژێر دەسەڵاتی زل هێزەکانی وەک فڕەنک و جێرمانەکان و ئیسپانیەکاندا لە بێنەو بەردەدا بووە.

تا سەدەی حەوتەم سێ گروپی جیاواز لە هۆڵاندا نیشتەجێ بوون:-

De Frezen فریزەکان لە باکوری وڵات، De Saksen ساکسەکان لە باشور، De Franken فرانکەکان لە باشور.. بەڵام ئەم دەسەڵات دارانە تەنها فەرمانڕەوایەک بوون وەک میر لە لایەن دەسەڵات داری ناوەند ( مەرکەزی ) کە فڕەنکەکان بوون دانراون.

سالی ٧٥١ تا ٩٢٥ زۆربەی هۆڵاندا ی ئەمرۆ لە ژێر فەرمان ڕەوایی کارۆلاینەکاندا بوو بە فەرمانڕەوایی (Karel de Grote)، لێرەدا نەک تەنها هۆڵاندا بەڵکو بەلجیکاو فەرەنساو بەشێکی ئیتالیاش هەر لە ژێر دەستی ئەم فەرمانڕەوا فرەنکیەدا بوون، ئەوروپیەکان لە مێژووی خۆیاندا دەسەلاتیKarel de Grote بە دەسەلاتێکی پرشنگدار دەزانن و وەک یەکەم هەوڵی یەکیەتی ئەوروپا ناوی دەبەن. بەلام پاش مردنی ئەم فەرمانڕەوایە نۆرمانیەکان توانیان دەسەلاتیان لێ وەرگرن، تا ڕێکەوتنی Verdun سالی ٨٤٣ کە فەرمان ڕەوایی یەکەیان دابەشکرا بە فەرمان ڕەوایی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاواو ناوەڕاست، لێرەدا هۆڵاندا بەر بەشی ناوەڕاست کەوت لە فەرمانڕەوایی ـیەکەدا، بەم جۆرە بۆ یەکەم جار لە دەسەلاتی فرەنکیەکان ( فەرەنسیەکانی ئەمرۆ) دابڕان، بەشەکەی ناوەڕاستیش دیسان دابەش بوو بە سێ فەرمانڕەوایی، هۆڵاندا کەوتە بەشی باکور و لە پاشاندا سالی ٩٢٥ لکێنرا بە فەرمانڕەوایی جێرمەنەکانەوە ( ئەڵمانەکان )، بەلام دیارە زۆر جار ئەم لکاندنە تەنها بە ناو بووە چونکە دەسەلاتداری ڕاستەقینە هەمیشە دەسەلاتی ناوچەکان بووە، واتە خودی هۆڵاندیەکان بوون.

بەناوبانگترین دەسەلات و ناوچەش لەو دەمەدا ئەمانەی خوارەوە بوون:-

Vlaanderen, Brabant, bisdom Utrecht, graafschap Holland, Gelre ( Gelderland ), graafschf Namen,Luxemburg, Henegouwen.

مێژووی هۆڵاندا زۆر جار ئاماژە بە شەڕی دەسەلات دەدات کە تیایدا دەسەلات لە نێوان فەرمانڕەوا جیاوازەکاندا لە ئارادا بووە، هەمیشە ئەوناوچانەی کە تا ئەمرۆ زۆربەی زۆری ماون لە ڕێگای شەڕی دەسەلات و ژن و ژن خوازییەوە فراوان کراوە.

لە قۆناغی سەدەکانی ناوەڕاست بەدوواوە، دەسەلاتدارە بچوکەکان کەم دەبنەوەو ئیتر دەسەلاتداری گەورە پەیدادەبن.

لە مێژووی هۆڵانـدادا Filips de stoute جێگای دیاری هەیە، یەکەم فەمانڕەوا بوو کە هەوڵی دا زۆرترین بەشەکانی هۆڵاندا یەکبخات و سالی ١٤٦٤ بۆ یەکەم جار کۆمسیۆنێکی ڕاوێژکاری لە هەموو دەسەلاتدارە ناوچەییەکان دروستکرد.

هەروەها Karel V یەکێکی دیکەیە لە دەسەلاتدارە بەناوبانگەکانی سەردەمی خۆی، ئەمیش لە نزیک کردنەوەی دەسەلاتەکانی ئەوسای هولاندا ڕۆڵی زۆری هەبوو لە نێوان سالانی ١٥٢٣-١٥٤٣دەسەلاتی بەسەر تەواوی

ناوچەکانی هۆلانداو بەلجیکاو لۆکسۆمبۆرگدا هەبوو ، ئەودەمە ئەو ناوچانە بە ١٧ هەرێمەکەی Karel.v ناودەبرا.

## بنەماڵەی ئورانیا ( Oranje):

مێژووی ئەم بنەماڵەیە یاخود درەختی وەچەو وەچەزادەکانی ئەم بنەماڵەیە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ٨٠٠ ی زایینی ، بەشێک لەم خێزانە کە تا ئەمڕۆ لەسەر کورسی شاهانە دانیشتوون بە ژن و ژن خوازی لەگەڵ خێزانی فەرمان ڕەوا Karel de Grote تێکەڵ بوون و هەمیشە سەردارو سەروەری چەندیین ناوچەی هۆلاندا بوون بە تایبەت ئەو ناوچانەی کە تا ئەمڕۆ بە هەرێمی باشورو باکوری هۆلاندا ناسراون[٣] بەڵام تەختی شاهانەی شانشینی ئەمڕۆی هۆلاندا کە بە بنەماڵەی شانشینی ئۆرانیا ناسراون دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٥٤٤ کە ئیتر بە فەرمی شازادە ولیامی یەکەم ( Willem van Oranje-Nassau )[٤] بووەبە شازادەی بنەماڵەو هەتا ئەمڕۆش ئەو بنەماڵەیە ئەوتاجەیان پاراستووە و ئێستا شازادە ( Willem Alexander ) لە دایک بووی ساڵی ١٩٦٧ شازادەی وڵاتەو بڕیار وایە پاش پادشا خانم بیاتریکس ( Beatrix ) ی دایکی ببێتە پادشای وڵات.

## کۆماری هۆلاندە( ١٦٤٨-١٧٩٤ ):-

هەرگیز ئەو ووتە شیرینەی موحەمەد حەسەنین هەیکەل لەیاد ناکەم لە کتێبی (پایزی توورە)دا دەڵێت ( مێژووو جێگە دەستی مرۆڤە لەسەر زەوی و جوگرافیاش جێگە دەستی خوا)، میللەتی کورد کە خاوەنی ٢٣ ئیمارەتی سەربەخۆ بوو زۆر ساویلکانە لە شەڕی چاڵدێرانی (١٥١٤ ) بە بەڵگەی ئەوەی سونەیە لەگەڵ تورکەکاندا دژی سەفەویە شیعەکان جەنگی و لە ئاکامدا بوو بە قوربانی ڕێکەوتنی نێوان شا عەباس و سوڵتان مورادی چوارهەم و وڵاتەکەی دابەش کرا، جێگەدەستێکی هێندە نەشیاوی بۆ خۆی دیاری کرد هەتا نوسینی ئەم چەند دێڕە ئێمەی کوورد پێوەی دەتلێینەوە، بەڵام هۆلاندیەکانیش زۆر کارامەو ئازایانە نەک جێگە پەنجەی خۆیان لە

مێژوودا تۆمار کردووه بەڵکو جوگرافیاشیان بۆ خۆیان گۆڕی و بەو جۆره نەخشاندیان کە لە سودی خۆیان دا بێت، چەندین شوێنی وڵاتەکەیان کە پێشتر دەریاو ئاو داپۆشیبوو ووشکیان کردەوەو کردیانە ئاوەدانی لەوانەش هەردوو هەرێمی Nordoost Polder & Flevoland.

ئەم قۆناغەی مێژووی هۆڵاندا بەردەوام بریتی بووە لە شەڕو پێکدادانی ئاینی کە سەرچاوەکەشی هەمیشە کەنیسەی کاتۆلیک و پرۆتستانت بووە، هەشتا ساڵی ڕەبەق حەوت هەرێمی هۆڵاندا سەرکەوتوانە دژی دەسەڵاتی کاتۆلیکی ئیسپانیا کە ئەودەمە سەنترالی دەسەڵاتی کەنیسە بوو ڕاوەستان. تاسەرەنجام ساڵی ١٦٤٨ ڕێکەوتنی ئاشتی ( Munster ) مۆرکراو ئەو حەوت هەرێمەی هۆڵاندا کە بەلجیکای ئەمڕۆشی لەسەر بوو بە وڵاتێکی کۆماری سەربەخۆ ناسرا.

ئەودەمەی لولەی تفەنگ خامۆش دەبێت، دەست و پەنجەی ڕەنگینی مرۆڤ دەست بە ئاوەدانی دەکات. بازرگانی و ئابوری هۆڵاندا بوژایەوە، ئەمستەردام بە یەکێک لە پایتەختە ناودارەکانی دنیا ناسرا، زانست و هونەر ئاستێکی بەرزی بەخۆوە بینی، هونەر مەندە شێوەکارەکانی وەک Rembrant و Jansteen تیایدا سەریان هەڵدا، زانکۆی لایدن Leiden دامەزرا کە تا ئێستا یەکێکە لە زانکۆ هەرە بەناوبانگەکانی دنیا(٥) هەر لەم سەردەمەشدا بوو کە هۆڵاندا بووە خاوەنی کەشتی گەلی خۆی و هێزە سەربازیەکانی خۆی ڕەوانەی هەندەران کردو قۆناغی ئیمپریالستی خۆی دەست پێ کرد چەندین دەڤەری وەک ئەندونوسیاو سورێنام و دورگەکانی ئەنتالیاو ئەروبا Antillen & Aruba ی داگیرکرد.

ساڵی ١٦٧٢ هۆڵاندا کەوتە بەر شاڵاوی فەرەنساو هێزەکانی Lodewijk ی چواردەهەم دەستیان بەسەر باشوری وڵاتدا گرت و لە ڕۆژهەڵاتیشەوە ئینگلیزەکان هێرشیان هێنا، بەم جۆره باشورو ڕۆژ- هەڵاتی وڵات داگیر کرا بەڵام ولیەمی سێ هەم ( ١٦٥٠ -١٧٠٢ ) کە ئەودەمە فەرمان ڕەوای وڵات بوو داوای هاوکاری ئیسپانیای کردو توانی بەسەر هەردوو لادا زاڵ بێت و ساڵی ١٦٧٤ لەگەڵ ئینگلیزەکاندا پەیمانی ئاشتی مۆرکات و ساڵی ١٦٧٨ لەگەڵ فەرەنسیەکان پەیمانی ئاشتی Nijmegen مۆر بکات.

دیسانەوە زۆری نەبرد ساڵی ١٦٨٨ شەڕی نۆ ساڵە هەڵگیرسایەوە، ئەم جارەیان هۆڵانداو ئینگلیز پێکەوە سەنگەریان لە فەرەنسا گرت، وێرای

ئەوەش لە نێوان خودی دەسەلات دارانی هۆلاندا کودەتای سپی و شەڕی دەسەلات بەردەوام بوو.
لە ماوەی سالانی ١٧٨٧-١٧٨٥ بزوتنەوەیەکی دژایەتی بنەماڵەی ئورانیا سەری هەلدا، نیشتمانیەکان(de patriotten) پاش چەندین شەڕی خوێناوی بە هاوکاری فەرەنسا دەستیان بەسەر تەواوی هۆلاندا گرت و ڕۆژی ١٦-٠٥-١٧٩٥ کۆماری ( Bataapse ) لەژێر سەرکردایەتی برای ناپلیۆن پۆناپارت (Lodewijk Napoleon) ڕاگەیەنرا. بەلام لە ڕاستیدا ولات ژێردەستەی فەرەنسیەکان بوو، بەڕێوەبەرانی ولاتیش لەژێر فەرمانی فەرەنسیەکاندا کاریان دەکردو سالی ١٨١٠ هۆلاندا بە تەواوی لکێنرا بە ئیمپراتۆریەتەکەی ناپلیۆنەوە[٦] بەلام ناپلیۆن لەو دەمەدا لە شەڕەکانیداشکست و تالاوی دەچەشت بۆیە ناپلیۆن داوای لە هۆلاندا کرد ٨٠ هەزار سەربازو ٤٠ هەزار ئەسپ ڕەوانەی بەرەکانی شەڕ بکات بۆ ناپلیۆن، بۆیە لە هۆلاندا سەربازگیری بە زۆر بۆ هەموو ئەوپیاوانەی تەمەنیان لە نێوان ٢٠ تا ٦٠ سالیدا بوو ڕاگەیەنرا، ئەم سەربازگیریە کە جاران بە نرخی ٣ تا ١٠ هەزار گلدەر دەکڕرایەوە ئیتر کرا بە زۆرە ملەو ماوەی کڕینەوەی
خزمەتی سەربازی نەما ئەمەش بووە هۆی سەرپێچی زۆربەی دەولەتمەندەکان بۆیە یاخی بوون تەواوی ولاتی گرتەوە، ڕۆژی ١-١١-١٨١٣ سەربازگەی فەرەنسی لە ئەمستەردام داگیر کراو سوتێنرا، ڕاپەڕین سەرتا سەری ولاتی گرتەوەو زۆربەی بەرپرسە فەرەنسیەکان بەرەو فەرەنسا ڕۆشتنەوەو هێزەکانی ناپلیۆنیش لە شەڕی لایبزیک بە تەواوی نابووت بون و لە ڕوسیاش سوپاکەی لە نێو بەفردا ڕەق دەبۆوە.
لە نزیکەی ١٥ هەزار سەربازی هۆلاندی کە بە فەرمانی ناپلیۆن برابونە شەڕی ڕوسیاوە تەنها چەند سەربازێک گەڕانەوە.

### شانشینی هۆلانداو کەرتبوونەوەی ولات:

ڕاپەڕینە سەرتاسەریەکەی هۆلاندا و تێک شکانی یەکجاری ناپلیۆن نەک چارەنووسی هۆلاندای دیاری کرد بەلکو هەموو ئەوروپا هەناسەیەکی هەلکێشاو لە جەنگی کاول کارانەی ناپلیۆن ڕزگاری بوو.
ڕۆژی ٢١ ی نۆڤەمبەری سالی ١٨١٣ فەرەنسیەکان دەستیان بە کشانەوە کردو ولات کەوتەوە دەستی بنەماڵەی ئۆرانیا بە ڕابەری ولیەمی پێنجەم.

دەوڵەتە سەرکەوتووەکان لە ڕێکەوتنی ڤیەنا ١٨١٤-١٨١٥ دیسانەوە تەواوی ئەو گۆڕانکاریانەی کە ناپلیۆن دروستی کردبوون وەک خۆیان لێ کردەوە، هەر لە چوارچێوەی ئەم ڕێکەوتن نامەیەدا بوو کە هۆڵاندا کرایەوە بە شانشین و درایەوە دەست بنەماڵەی ئۆرانیاو دووا سەربازی فەرەنسی ڕۆژی ٦ ی ئاپرڵی ١٩١٤ هۆڵاندای بە جێ هێشت(٧).

شۆڕشی فەرەنسا ١٧٨٩ کۆمەڵێک گۆڕانکاری گەورەی لە مۆراڵی سیاسی و کۆمەڵایەتی وڵاتە ئەوروپیەکان دروست کرد، بنەماکانی یەکسانی و برایەتی ببووە وێردی زمانی تەواوی ئەوروپییەکان. کێشەی دەستورو ململانێ ی پادشاو دەسەڵات داران و یاسا هەمیشە گرفت و کودەتای سپی لە گەڵدا بووە، بەڵام ئەم جارە بۆ یەکەم جار دەستور شێوەیەکی شەرعی و فەرمی پێ درا.

لە مانگی مارتی ساڵی ١٨١٤ لەسەر داوای پادشای وڵات ٦٠٠ دەسەڵاتدار و نەجیب زادەی وڵات بانگ کران بۆ دەنگدان، لە ژمارەی بانگ کراوەکان ٤٧٤کەس ئامادەبوون و تەنها ٢٦ کەس نەبێت هەموویان دەنگیان بۆ دەستوری نوێ دا.

لە باشوری وڵات کە بەلجیکای ئەمڕۆشی دەگرتەوە دەستور خرایە بەردەم ١٣٢٥ کەس بۆ دەنگدان بەڵام زۆربەی هەرەزۆری ئامادەبووان دەنگیان بۆ نەدا هۆی سەرەکیش تەنها کێشەی ئایینی نەبوو بەڵکو کێشەی ئابوریش ڕۆڵی هەبوو چونکە ئەوبەشەی وڵات تەنها ٢٥ ملیۆن گڵدەر قەرزاری شەڕ بوو بەڵام بەشی باکور١٢٥٠ ملیۆن لە ژێرەوە بوو، پادشا هەوڵێکی زۆری دا هەتا سە رەنجام دەستور لەوێش پەسەند کرا، بەڵام ئەم پەسەند کردنە لە وە لاوازتربوو کە بتوانێت کێشە مێژوووییەکانی نێوان هەردوولا و دەیان جەنگی خوێناوی لە یاد بەرێتەوە، ساڵی ١٨٣٠ نواندنی میلۆدرامایەکی نەتەوەیی بووە هۆی هەڵگیرساندنی ڕاپەڕینی بەلجیکا.

ڕاپەڕین سەرەتا لە برۆکسل سەری هەڵدا بەڵام لە پاشاندا بووە هۆی ئەوەی ڕەوشەکە لەدەست دەرچێت، بۆیا پادشا بە خۆیی و ١٠ هەزار سەربازەوە هەڵی کوتایە سەر ناوچە یاخیبووەکان و شاری Leuven و Hasseltی داگیرکرد، لەولاشەوە فەرەنسیەکان و بەلجیکیەکان خۆیان سازداو سوپاو تەقەمەنیان بەرەو ناوچەکانی ڕووبەڕوو بونەوە گواستەوە بۆیە هێزەکانی هۆڵاندا لە ترسی خوێن ڕژانێکی زۆر پاشەکشەیان کردو ئیتر گفتوگۆی سیاسی بۆ چارەسەرکردنی ڕەوشەکە بێ ئەوەی سودێکی ئەوتۆی هەبێت دەستی پێ کرد.

بەلجیکا لە ڕۆژی ١٠ نۆڤەمبەری هەمان ساڵ ١٨٣٠ سەربەخۆیی وڵاتی ڕاگەیاند بەڵام هۆڵاندا ڕازی نەبوو دانی پێدا بنێت بۆیە لە ژێر فشاری ئابلۆقەی ئابوری فەرەنساو بەریتانیا دژی هۆڵانداو لەبەر تێچونی گرانی شەڕی سەربازی و کوشتار ساڵی ١٨٣٩ هۆڵاندا ناچار دانی بە سەربەخۆیی بەلجیکادا نا...

بە کۆتایی ئابلۆقەی ئابوری و جەنگی بەلجیکا بارودۆخی ئابوری هۆڵاندا گەشەی سەند ، شۆڕشی پیشەسازیش ١٨٥٠-١٧٥٠ دەمێک بوو لە دەرگای دابوو، ئاسەوارەکانی خۆی وردە وردە بەرەو هۆڵاندا دەهێنا، پێشکەوتنی ئابوری زۆربەی ژیانی دەگرتەوە ساڵی ١٨٣٥ هێڵی ئاسنی نێوان ئەمستەردام و ڕۆتەردام دەستی پێ کرد، سیستەمی پۆست و پولی پۆست ساڵی ١٨٥٠ کاری پێ کرا، لەم قۆناغەدا بۆ یەکەم جار ساڵی ١٨٦٩ لە ئەمستەردام بۆ زیاد کردنی ٢٠ سەنت هەق دەستی کاریان و دیاری کردنی ١٢ سەعات کار لە یەک ڕۆژدا کرێکارانی کەشتی سازی مانگرتنیان دەست پێ کرد ، لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە نەک تەنها شەڕەکانی کەنیسە کۆتایی هاتبوو بەڵکو ئایین بە تەواوی لە دەوڵەت جیاکرایەوەو سیستەمی سیکیولاریزم جێگەی گرتەوە، شان بەشانی ئەمەش لە نێو هۆڵاندا وردە وردە دەسەڵاتی پادشا کەمتر دەبۆوەو تەواوی دەسەڵاتەکان بە پارلەمان دەدرایەوە.

### هۆڵاندا لە نێوان هەردوو جەنگی جیهانیدا:

پەیوەندیەکی توندوتۆڵی ئابوری وای کرد هۆڵاندا لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا دژایەتی ئەڵمانیا نەکات و بێ لایەنی خۆی لە نێوان هاوپەیمانەکان و سوێند خۆرەکاندا ڕاگەیەنێت، بەم هەڵوێستە هۆڵاندا خۆی لە کاول کاری و وێران کاری جەنگ پاراست و زیانێکی ئەوتۆی بەر نەکەوت

بە پێچەوانەی بەلجیکا کە بەهۆی بەشدار بوونی لە شەڕدا دژی ئەڵمانیا زیانێکی زۆری وێ کەوت وتەنها بە کەوتنی شاری Antwerpen یەک ملیۆن بەلجیکی ئاوارەی هۆڵاندا بوون.

سەرەتاکانی سەدەی بیستەم ئیتر هۆڵانداشانشینێکی گەشەدارو بەهێز بوو، زۆربەی هەرە زۆری کێشە ئایینی و یاسایی و سیاسیەکانی تیادا یەکلا

ببونەوە، دەوڵەتێک کە ئیتر هەنگاوی باشی بەرەو لیبراڵ بوون نابوو، دیموکراتیەت تادەهات باشتر دەچەسپی.

ساڵی ١٩٠٠ خوێندنی بەزۆر سەپێنرا بەسەر هەموو کەسێکدا، ساڵی ١٨٩٦ یەکەم ئۆتۆمبێل هاتە وڵات و پاش چوارساڵ هۆڵاندا خۆی یەکەم ئۆتۆمبێلی دروستکرد و یەکەم کۆمپانیای ئاسمانی بۆ هات و چۆ بە ناوی KLM کە هەتا ئەمڕۆش هەر لە خزمەتدایە ساڵی ١٩١٩ دروست کرا.

خۆپاراستنی هۆڵاندا لە جەنگی دووەمی جیهانیدا خزمەتێکی زۆری بە وڵات گەیاند، بەڵام ئەوساتە وەختەی هەموو دنیا چاوەڕێ ی تەقاندنی یەکەم گوللەی جەنگی دووەمی جیهانی بوو هۆڵاندا ترسی ئەوەی هەبوو کە لە لایەن هیتلەرەوە بکرێتە پارووێەکی چەور، هەر لەبەر ئەوەش بوو لە مانگی ئۆگستۆسی ساڵی ١٩٣٩ پادشای هۆڵاندا خانم Wilhemina بە فەرمی بێ لایەنی هۆڵاندای لە جەنگدا ڕاگەیاند، بەڵام ئەمە دادی نەداو دەمەو بەیانێکی بەهاری ڕۆژی ١٠ی مانگی مەی ساڵی ١٩٤٠ پەڕەشوتەکانی ئەڵمانیا هێرشیان دەستپێکردو هەزاران سەربازی ئەڵمانی لە شوێنە ستراتیجیەکاندا بە پەڕەشوت هەڵدرانە خوارێ و لە ڕۆژی ١٤ی هەمان مانگدا سوپای هۆڵاندا خۆی بەدەستەوەداو حکومەتی هۆڵانداش بە شازادەو پادشاو وەزیرەکانیەوە بەرەو بەریتانیا هەڵهاتن.

بەڵام هۆڵاندیەکان وەک تەواوی وڵاتانی ئەوروپا دژی سوپای داگیرکەر بەرهەڵستیان نواندو حکومەتی هۆڵانداش لە بەریتانیاوە لە ڕێگای ڕادیۆوە سەرکردایەتی دەوڵەتی لە تاراوگەوەدەکرد

سەرەنجام پاش پێنج ساڵی ڕەبەق گەڕانەوە بۆ وڵات.

هۆڵاندا بە هاوکاری ئەمەریکا ئازادکرا، سەربازەکانی ئەمەریکا لە شەڕی ئازاد کردنی هۆڵانداو هێرش بۆ سەر دووا سەنگەرەکانی هتلەر بەشداریەکی بەر چاویان نوواند، لە مانگی ئاپرلی ساڵی ١٩٤٥ لە ئاسمانەوە فڕۆکە ئەمریکاییەکان بەردەوام خواردنیان بەردەدایەوە بۆ خەڵکی هۆلاندی کە جەنگ ماندوو برسی کردبوون. و ڕۆژی ٦ مانگی مەی ساڵی ١٩٤٥ لە هوتێلی De Wereld لە شارۆچکەی Wageningen کاتژمێر ١٧ ئەڵمانیا ڕێکەوتنامەی خۆبەدەستەوەدانی مۆرکرد. پادشای هۆڵانداش خانم ولیەمینا ساڵی ١٩٤٨ پاش ٥٠ ساڵ شانشینی تاجی شاهانەی خۆی بەخشی بە خانم Juliana و ساڵی ١٩٨٠ لە ڕۆژی ٣٠ ئاپرلدا ئەویش لەبەر نەخۆشی و پیربوون تاجەکەی خۆی بەخشی بە خانم Beatrix ی کچی خۆی کە هەتا ئەمڕۆش ئەو خانمە پادشای وڵاتە...

### ئابوری هۆلاندا:-

وێرای ئەوەی کە هۆلاندا دەوڵەتێکی بچوکە و پێوانەکە ی تەنها ٤١،٥٢٦ کلم$^2$ دەبێت کەچی بە یەکێک لە ئابوریە دەوڵەمەندو بەهێزەکانی دنیا دەژمێردرێت. ساڵی ٢٠٠٢ سەراپای بەرهەمی نەتەوە نزیکەی ٤٤٤،٦ ملیارد یۆرۆ بوو.

ساڵی ٢٠٠٣ سەراپای داهاتی نەتەوەلە هۆلاندا٤٧٧ ملیار یۆرۆ بوو،هەمان داهات لە ئەمەریکا نزیکەی١٠.٠٠٠ ملیارد دۆلار بوو، ئەمەش دەکاتە ٣٠ هێندەی ئابوری هۆلاندا، بەم جۆرە لەو ساڵەدا هۆلاندا لە ڕیزی پازدەهەمین وڵاتی دەوڵەمەندی جیهان بوو. ساڵی ٢٠٠٤ سەراپای داهاتی تاکەکەس لە هۆلاندا ٢٧.٩٠٠ یورۆ بوو.

بۆ پێوانەی ئاستی بژێوی لە وڵاتێکدا هەمیشە تێکڕای داهاتی تاکە کەس لە سەراپای داهاتی نەتەوە دەکرێتە پێوانە بۆ زانینی بەرزی یاخود نزمی ئاستی بژێوی بە هەمان شێوەش دەکرێتە پێوەر بۆ پێشکەوتن یان دواکەوتنی ئابوری ئەو وڵاتە هەر لەبەر ئەوەشە کە خشتەی داهاتی نەتەوە و سەراپای داهاتی تاکە کەس لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دیکە دەگۆڕێت. ئەم خشتەیەی خوارەوە سەراپای داهاتی تاکەکەس لە هەندێک لە وڵاتانی دنیادا دەخاتە ڕوو :-

www.let.leidenuniv.nl سەرچاوە

داهاتی تاکە کەس( لە بەرزترینەوە بۆ نزمترین) ساڵی ١٩٩٩

| وڵات | سەراپای داهاتی نەتەوە |
| --- | --- |
| لوکسۆمبۆرگ | ٤١،٢٣٠ |
| ئەمەریکا | ٣١٩١٠ |
| سوسرا | ٢٨.٧٦٠ |
| نەروێژ | ٢٨،١٤٠ |
| ئایسلاند | ٢٧،٢١٠ |
| بەلژیک | ٢٥،٧١٠ |
| دەنیمارک | ٢٥،٦٠٠ |
| کەنەدا | ٢٥،٤٤٠ |
| ژاپۆن | ٢٥.١٧٠ |
| نەمسا | ٢٤.٦٠٠ |
| هۆڵاندا | ٢٤.٤١٠ |
| ئوستورالیا | ٢٣.٨٥٠ |
| ئەڵمانیا | ٢٣.٥١٠ |
| فەرەنسا | ٢٣.٠٢٠ |
| فنلندا | ٢٢.٦٠٠ |
| ئینگلتەرا | ٢٢.٢٢٠ |
| سوید | ٢٢.١٥٠ |
| ئیتالیا | ٢٢.٠٠٠ |
| کویت | ٥.٧٦٠ |
| ئیران | ٥.٥٥٠ |
| مەغرب | ٣.٣٢٠ |

پاش خوێندنەوەی ئەو خشتەیە بۆمان دەردەکەوێت کە هۆڵاندا لە ڕیزی پێشەوەی ئەودەوڵەتانەدا یە کە ئاستی بژێوی تیایدا زۆر بەرزە، بەم جۆرە پێشکەوتنی ئابوری و ڕەفاهیەتیش تیایدا بەرز دەبێتەوە.

بڕی بەشداری کردنی کەرتی ئابوری لە هەڵکەوتەی گشتی ئابوری وڵاتێکدا پشت دەبەستێت بە چەندین ڕەگەزی وەک( سامانەکانی سەرزەوی و ژێرزەوی و کانزاکان و دەریاو ئاو.. هتد ). هەروەها هەڵکەوتەی جوگرافیایی و سەرخان و ژێرخانی ئابوریش لەم بوارەدا کاریگەری خۆی هەیە.

هۆڵاندا بەو پێ یەی کە دەکەوێتە سەر دەریاو سنورێکی درێژو لەباری دەریایی هەیە هەمیشە بنکەیەکی ستراتیژی نەک تەنها ئابوری و جوگرافی بەڵکو سیاسیشی هەبووە.

ئەم خشتەیەی خوارەوە بەشداری هەریەکە لە کەرتە ئابوریەکان لە پێکهاتەی سەراپای داهاتی نەتەوە ( س.د.ن ) دەخاتە ڕوو:

www.ned.univie.ac.atسەرچاوە

| کەرتی ئابوری | س. د. ن<br>% |
|---|---|
| پیشەسازی | %٢٠ |
| بازرگانی و گواستنەوە | %٢٠ |
| کشت و کاڵ | %٣ |
| خزمەتگوزاریەکانی دەوڵەت | %٢٦ |
| بانک | %٥ |
| بیناسازی | %٥ |
| ئەوانی دیکە | %٢١ |

ئەو خشتەیە بۆمان دەردەخات کە پیشەسازی و بازرگانی پێکەوە گەورەترین کەرتی ئابوری لە هۆڵاندا دروست دەکەن، ئەمەش وا دەکات ئابوری هۆڵاندا وەبەرهێنانەکانی خۆی نەک تەنها لە نێو خودی وڵاتدا بەڵکو لە دەرەوەی وڵاتیشدا برەو پێ بدات، خاڵێکی دیکەی سەرنج ڕاکێش لە ئابوری هۆڵاندا ئەوەیە کە ڕێژەی بەشداری کەرتی کشتوکاڵ ڕێژەیەکی زۆر کەم دێتە بەر چاو بەڵام دیسان بە هۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆژی لە بواری کشتوکاڵدا بڕی بەرهەم هێنانی ئەوکەرتە لە چاو دەوڵەتە کشت و کاڵیەکانی دنیادا زۆر زیاترە . ئەو خشتەیە ی خوارەوەش قەبارەی هەناردن ( تصدیر ) ی هۆڵاندامان بۆ دەخاتە ڕوو:

سەرچاوە www.minbuza.nl

گەورەترین وڵاتانی دنیا لە هەناردندا

| وڵات | هەناردن/ ملیارد دۆلار |
|---|---|
| ئەمریکا | ٩٥٧ |
| ئەڵمانیا | ٦٩٢ |
| یابان | ٤٨٠ |
| فەرەنسا | ٤٠٩ |
| بەریتانیا | ٣٨٤ |
| چین | ٣٥٨ |
| هۆڵاندا | ٢٩٥ |
| کەنەدا | ٢٨٨ |
| هۆنگ کۆنگ | ٢٤٣ |

پیشەسازی نەوت و گاز یەکێکە لە گرنگترین بوارەکانی پیشەسازی هۆڵاندا، گەورەترین کۆمپانیای کە هۆڵاندا بە هاوبەشی بەریتانیا بەڕیوەبەی دەبات Koninglijk Shell Groep نەوتی جیهانی نەک تەنها لە ئەوروپا بەڵکو لە تەواوی جیهاندا بە کۆمپانیایەکی زەبەلاح ناسراوەو لە بواری دەرهێنان و پشکنین و بەرهەمهێنانی نەوتدا دەستێکی باڵای هەیە. سەرمایەی وەگەڕخراو لەم کۆمپانیایەدا ٤٣٧ ملیارد یۆرۆ یە، چەندین کۆمپانیای پیشەسازی دیکەی وەک Heineken, DSM Philips, Fortis, لە کۆمپانیا بەناوبانگەکانی هۆڵاندان.

بەندەری ڕۆتەردام ڕۆڵێکی زۆر گەورە دەبینێت لە تێکڕای بەشداری کەرتی بازرگانی و بانکی لە پێکهێنانی داهاتی نەتەوە. پێگەی نێو نەتەوەیی و سەردەریایی هۆڵاندا وای کردووە کە ئەم بەندەرەلە پاش بەندەری هۆنگ کۆنگ دووەم بەندەری جیهانی بێت لە ڕووی داگرتن و بارکردنی شمەک و کاڵاوە. هەردوو بەندەری هامبۆرگی ئەڵمانیا Hamburg وئانتوێرپن Antwerpen ی بەلجیکا کە دوو بەندەری دیکەی ئەوروپین تەنها ⅓ و ¼ ی بەندەری ڕۆتەردام بازرگانی تیادا ئەنجام دەدرێت. بەم جۆرە دەتوانین بڵێین هەردوو کەرتی پیشەسازی وبازرگانی دوو کۆڵەکەی گرنگی ئابوری هۆڵاندا پێک

دێنن. ئەم خشتەیەی خوارەوەش سەراپای قازانج ( سود ) ی کۆمپانیا گرنگەکانی هۆڵاندا کە هەندێکیان بە کۆمپانیای زەبەلاح دەژمێردرێن، دەخاتە ڕوو:

سەرچاوە: De Vokskrant, 30-03-2005, b7

| ناوی کۆمپانیا | بڕی قازانج/ ملیارد یۆرۆ | ناوی کۆمپانیا | بڕی قازانج/ ملیارد یۆرۆ |
|---|---|---|---|
| Shell | 14,934 | DSM | 262 |
| ING | 5968 | ASML | 235 |
| ABN Amro | 4109 | P&D Nedlloyd | 179 |
| Fortis | 3358 | VNU | 162 |
| Philips | 2836 | Numico | 145 |
| Unilever | 1876 | Buhrmann | 145 |
| Aegon | 1663 | Wolters | 135 |
| KPN | 1511 | Vedior | 116 |
| Akzo Nobel | 856 | IHC Caland | 37 |
| TPG | 667 | Getronics | 32 |
| Heineken | 537 | Versatel | -24 |
| Reed Elsevier | 445 | Hagemeyer | -164 |
| | | Ahold | -443 |

ئەو خشتەیەی سەرەوە ڕوونی دەکاتەوە کە کۆمپانیا گەورەکانی هۆڵاندا زیاتر لە بواری پیشەسازی و تەکنەلۆژیای زانیاری و بانک و گواستنەوەدا کاردەکەن، ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەوەیە کە قازانجی هەندێک لەو کۆمپانیایانە هێندە گەورەیە کە بە هێندی داهاتی نەتەوەی وڵاتێکی پاشکەوتوی دنیا دەبێت..

کەرتی کشتوکاڵ و بەرهەمی ئاژەڵ و ماسی دیسانەوە کەرتێکی زۆر گەورەی ئابوری پێک دێنن، بەشداری ئەم کەرتە لە پێک هێنانی داهاتی نەتەوە بە

ڕێژەی ٣% دەبێت، ئەم خشتەیەی خوارەوەش ژمارەی سەرئاژەڵ و پەلەوەر لە ساڵی ٢٠٠١ دا دەخاتە ڕوو:

سەرچاوە: www.landen web.com/economie

| جۆر | دانە / سەر |
|---|---|
| ڕەشەووڵاخ | ٤.٠٥٠.١٨٦ |
| بەراز | ١٣.٠٠٠.٠٠٠ |
| مە ڕ | ١.٣٠٠.٠٠٠ |
| ئەسپ و جوانو | ١٢٠.٤٨٦ |
| ئاسک | ٢٢١.٠٦٤ |
| مریشک | ١٠٠.٣٣٤.٠٠٠ |
| کەروێشک | ٣٨٤.٠٠٠ |

کەرتی کشتوکاڵ لە هۆڵاندا بە یەکێک لە پێشکەوتووترین کەرتە ئابوریەکانی دنیا ناسراوە کە تەکنەلۆژیایەکی زۆر پێشکەوتوو مۆدێرنی تیادا وەگەڕدەخرێت، لەپاش ئەمەریکاو فەرەنسا ، بە سێهەم وڵاتی دنیا دەژمێردرێت لە هەناردنی کشتوکاڵدا نزیکەی ١٠٠ هەزار کۆمپانیای بچوک و گەورە لەم بوارەدا کاردەکەن. وێرای بەرهەمی پەنیرو ماست و ئەلبان، بەرهەمی گوڵ و تۆوی گوڵ ئەم وڵاتەی ناو لێ ناوە وڵاتی گوڵ و باخچەی ئەوروپا، هەرچەندە ئیسرائیل بە دووەم دەوڵەتی دنیا ناسراوە لە بەرهەم هێنانی گوڵدا بەڵام دیسانەوە ئەم بەرهەمە بە هاوکاری و پشکی کۆمپانیا هۆڵاندیەکان بەڕێوە دەچێت.

## بەشی دووەم:-

### ڕەوەندی ئیسلامی

بەر لەوەی تیشک بخەینە سەر ڕەوەندی ئیسلامی و ئامارو ژمارەکان بدوێنین، پێویستە سەرنجێکی خێرای ژمارەی دانیشتوانی هۆڵانداو هەڵکەوتەی دیموگرافی ئەم وڵاتە بدەین بۆ ئەوەی قەوارەی کاریگەری ئەم ڕەوەندە لەسەر ڕەوتی ژیانی ئەم وڵاتە بزانین.
لەم خشتەیەی خوارەوەدا ژمارەی دانشتوانی هۆڵاندامان هەتا ساڵی ٢٠٠٤ بۆ دەردەکەوێت:

سەرچاوە : سەنتەری گشتی سەرژمێرە لە هۆڵاندا
Centraal Bureau voor de Statistiek, Voorburg/Heerlen 2004

| ساڵ | کۆی گشتی دانیشتوان | نێر | مێ |
|---|---|---|---|
| ١٩٥٠ | ١٠.٠٢٦.٧٧٣ | ٤.٩٩٨.٢٥١ | ٥.٠٢٨.٥٢٢ |
| ١٩٥٥ | ١٠.٦٨٠.٠٢٣ | ٥.٣٢٠.٧٥٩ | ٥.٣٥٩.٢٦٤ |
| ١٩٦٠ | ١١.٤١٧.٢٥٤ | ٥.٦٨٦.١٥٢ | ٥.٧٣١.١٠٢ |
| ١٩٦٥ | ١٢.٢١٢.٢٦٩ | ٦.٠٩٠.٥٢٩ | ٦.١٢١.٧٤٠ |
| ١٩٧٠ | ١٢.٩٥٧.٦٢١ | ٦.٤٦٥.٠٨١ | ٦.٤٩٢.٥٤٠ |
| ١٩٧٥ | ١٣.٥٩٩.٠٩٢ | ٦.٧٧١.٦١٣ | ٦.٨٢٧.٤٧٩ |
| ١٩٨٠ | ١٤.٠٩١.٠١٤ | ٦.٩٩٤.٢٨٠ | ٧.٠٩٦.٧٣٤ |
| ١٩٨٥ | ١٤.٤٥٣.٨٣٣ | ٧.١٤٩.٦٢٠ | ٧.٣٠٤.٢١٣ |
| ١٩٩٠ | ١٤.٨٩٢.٥٧٤ | ٧.٣٥٨.٤٨٢ | ٧.٥٣٤.٠٩٢ |
| ١٩٩٥ | ١٥.٤٢٤.١٢٢ | ٧.٦٢٧.٤٨٢ | ٧.٧٩٦.٦٤٠ |
| ٢٠٠٠ | ١٥.٨٦٣.٩٥٠ | ٧.٨٤٦.٣١٧ | ٨.٠١٧.٦٣٣ |
| ٢٠٠١ | ١٥.٩٨٧.٠٧٥ | ٧.٩٠٩.٨٥٥ | ٨.٠٧٧.٢٢٠ |
| ٢٠٠٢ | ١٦.١٠٥.٢٨٥ | ٧.٩٧١.٩٦٧ | ٨.١٣٣.٣١٨ |
| ٢٠٠٣ | ١٦.١٩٢.٥٧٢ | ٨.٠١٥.٤٧١ | ٨.١٧٧.١٠١ |
| ٢٠٠٤ | ١٦.٢٥٨.٠٣٢ | ٨.٠٤٥.٩١٤ | ٨.٢١٢.١١٨ |

بە پێ ی زانیاریەکانی نوسینگەی سەرەکی بۆ سەرژمێرە( احصاء) هەتا ڕۆژی ٢٤-٠٤-٢٠٠٦ ژمارەی دانشتوانی هۆڵاندا١٦.٣٣٥.٥٠٩ کەس دەبن لە زەو ی یەکدا کە پانتاییەکەی ٤١.٥٢٦ کلم² یە ئەمەش وای کردووە لە پاش بەنگلادش، هۆڵاندا زۆرترین ژمارەی دانیشتوانی هەبێت بەرامبەر بە هەر مەتردووجایەک لە خاک.

ڕۆژانە ٥٥٧ منداڵ لە دایک دەبن و ٣٩٣ کەسیش دەمرن، هەروەها سەبارەت بە کۆچ و کۆچی بەرامبەر، زانیاریەکانی وەزارەتی کۆچ و سەنتەری سەرژمێرە ئامارە بەوە دەدەن کە ڕۆژانە ٣٣٩ کۆچ بەر دێنە وڵات و ٢٦٣ کەسیش وڵات بەجێ دێڵن. ئەگەر کۆکردنەوەو لێدەرکردنێکی سادەی بۆ ساز دەین ئەوە بۆمان ئاشکرا دەبێت کە جیاوازی لە نێوان لەدایک بوون و مردن

١٦٤ لە دایک بووەو جیاوازی نێوان هاتن و ڕۆشتنیش لە کۆچدا ٧٦ کەسە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە کۆمەڵگای هۆڵاندا ڕۆژانە ٢٤٠ کەس زیاد دەکات.

## هۆڵاندا کۆمەڵگایەکی هەمەڕەنگ:-

هۆڵاندیەکان هەمیشە دەڵێن کۆمەڵگای ئێمە مڵتی کلتورە واتە لە چەند گروپی جیاوازو لە چەند کلتوری هەمەڕەنگ پێک دێت، ئەم ووتەیەش ڕاستە چونکە لە ڕاستیدا پتر لە ١٠٠ نەتەوەو ئایینی جۆراوجۆر لە نێو هۆڵاندادا هەیە کە هەمووشیان بە بێ جیاوازی بواری ئەوەیان بۆ ڕەخساوە کە چالاکیە ئایینی و کلتوری و نەتەوەییەکانی خۆیان ئەنجام بدەن. بەر لە وەی بێینە سەر باسی ئایینەکان و پێگەی ئایینەکان لە کۆمەڵگای هۆلاندیدا دێینە سەر باسی ئەوەی کە چۆن و بۆچی ئەو هەموو نەتەوانە لەم وڵاتە بچوکەدا کۆبونەتەوە،لێرەداباسی پێکهاتە سەرەکیەکانی ئەم کلتورو ئایینە جیاوازانە دەکەین.

بێگانەکان لە هۆڵاندا دەکرێن بە چوار بەشەوە:-

یەکەم/ ئەوانەی کە لە چوارچێوەی کردەوە ئیمپریالستی و داگیرکاریەکاندا هاتونەتە ئەم وڵاتەوە وەک ئەندۆنوسی ، مۆلۆک، سورێنامی، ئەنتالی و ئەروبایی.

دووەم/ ئەوانەی بۆ کارکردن بانگ کراون.

سێهەم / پەنابەران ( ئەوانەی لە وڵاتەکانی خۆیان لەبەر هۆی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی لە وڵاتی خۆیان هەڵهاتوون )

چوارەم/ ئەوانەی لەبەر چەندین هۆی وەک ژن و ژنخوازی و خزمایەتی و کۆکردنەوەی خێزان یاخود خوێندن بۆلای ئەو سێ بەشەی سەرەتا دێن( واتا ئەوانەی سەرەوە کە دەگەڕێنەوە لە وڵاتەکانی خۆیانەوە کەس و کاری خۆیان دێنن یاخود ژن دەخوازن).

ئێستاش دێینە سەر باسی یەکە یەکەی ئەو خاڵانەو چۆنیەتی پەیدابوونی هەریەکە لەو گروپانە دەخەینە ڕوو.

## میراتیەکانی ئیمپریالیزمی هۆلاندی:-

مێژووی هۆلاندا بەتاڵ نییە لە کردەوەی ئیمپریالستی و داگیرکاری وڵاتانی دیکە، هەزارەها ڕۆڵەی بێگانە کە ئێستا لە هۆلاندا دەژین و زۆربەشیان هەر گیز وڵاتی باوکی خۆی نەدیووە و تەنانەت زمانی وڵاتی خۆشی نازانێت و لە نێو کۆمەڵگاشدا بە هۆلاندی ناناسرێت بە دەر لە خواستی خۆیی و لە دەرئەنجامی داگیر کردنی وڵاتەکەیەوە لە لایەن هۆلانداوە هاتۆتە ئەم دەڤەرە، ئەمانە ئێستا بەشێکی زۆری بێگانەکان پێک دێنن و لەم پێکهاتانەی خوارەوە پێک دێن:-

## ئەندۆنوشیەکان ( هۆلاندیە هندیەکان ):-

هەتا ساڵی ١٩٤٩ ئەندونوسیا لە ژێر دەستی هۆلاندا بوو(یەکەم جار پرتوگالیەکان ساڵی ١٥١٢ ئەندونوسیایان گرت پاشان ساڵی ١٦٠٥ هۆلاندیەکان بۆ یەکەم جار داگیریان کرد، ئینگلیزەکانیش ساڵی ١٨١١ ئەندەنوسیان داگیر کرد و پاشان ساڵی ١٨١٦ دایەنەوە بە هۆلاندا. ) ڕووداوەکانی جەنگی دووەمی جیهانی وای کرد یابان لە ڕۆژی ١١-١-١٩٤٢ ئەندونوسیا داگیر بکات، لە ئاکامی ئەمەشدا لە نێوان ساڵانی ١٩٤٥-١٩٤٩ نزیکەی ٤٥ هەزار ئەندۆنوسی هاتنە هۆلاندا، ساڵی ١٩٤٩ پاش سەربەخۆ بوونی ئەندۆنوسیا دیسانەوە هەتا سەرەتای ساڵی ١٩٦٠ نزیکەی ١٤٠ هەزار کەسی دیکە ڕوویان لە هۆلاندا کرد. ئەمانە زیاتر ئەوانە بوون کە هاوکاری هۆلاندابوون و لەبەر سەرهەڵدانی بیری تۆڵە سەندنەوەو ئەنتی هۆلاندی نەیانتوانی لە وڵاتی خۆیان بمێننەوە هەرچەندە لە هەمان ماوەدا نیو ملیۆن هۆلاندی لەبەر بێ کاری و بێ جێگاوڕێگایی هۆلاندایان بە -جێهێشت و بەرەو ئوستورالیاو نیوزیلانداو ئەمەریکا ڕۆشتن.

**مۆلۆک Molukkers:**

مۆلۆکەکان هاوشێوەی ئەندۆنوسیا ساڵی ١٥١٢ لە لایەن پرتوگالیەکانەوە داگیر کرا بەڵام هەر بە هەمان شێوە مۆلۆک بەر لە ئەندۆنوسیا کەوتە بەر دەستی هۆلاندیەکان، وێڕای ئەوەی لە سەدەی یازدەوە لە ڕێگای بازرگانیەوە ئاینی ئیسلام زۆر بە خێرایی لە ئەندۆنوسیا بڵاو بۆوە دورگەکانی مۆلۆک

نەک نەبوونە ئیسلام بەڵکو پارێزگاری ئایینی مەسیحی خۆیان کرد ئەمەش وای کرد کە ئەم گروپە ئەتنیەی ئەندونوسیا خێرا لەگەڵ هۆڵاندیە داگیر کەرە (مەسیحیە هاوئایینیەکەیان) ڕابێن و هۆڵاندیەکانیش ئەم هەلەیان قۆستەوەو شانبەشانی ئەندۆنوسیە لایەنگرەکانیان سوپایەکی ( میلیشیایی ) باشی لێ دروستکردن کە هەندێک جار لە دەرەوەی هۆڵانداش بەکاری دێنان. ئەم خۆبەستنەوەیەی مۆلۆکۆکان بە هۆڵانداوە هەڵوێستێکی وای لێکەوتەوە کە لە ناوخۆی وڵاتدا وەک دوژمنی ئەندونوسیاو داردەستی هۆڵاندی سەیر دەکران.

لە گەڵ دەستپێکردنی جەنگی جیهانی دووەمدا یابانیەکان هەڵیان کوتایە سەر ئەندۆنوسیاو داگیریان کرد و سەرەتای نەگبەتی مۆلۆک دەستی پێ کرد، بە هۆی دڵسۆزیان بۆ هۆڵاندا زۆریان لێ دەستگیر کراو لە ژێر ئەشکەنجەدا کوژران و زۆریشیان هەڵهاتن.

یابانیەکان لە کاتی داگیرکردنیاندا حکومەتێکی دەستکردیان بۆ ئەندۆنوسیا دروست کرد، ئەم حکومەتە کە زۆربەیان لە ناشیونالستەکانی ئەندۆنوسیا بوون، پاش ئەوەی شکستی یابانیەکان لە جەنگی جیهانیدا بووە ڕاستییەکی چاوەڕوان کراو ، بەر لەوەی هۆڵاندا دەسەڵاتی مۆنۆپۆڵی خۆی ڕێک خاتەوە، بە سەرکردایەتی سوکارنۆ سەربەخۆیی ئەندۆنوسیایان ڕاگەیاند...

پاش ئەوەی هۆڵاندا دانی بە سەربەخۆیی ئەندونوسیادا نا، ئەمانە بوونە قوربانی ئەم ڕێکەوتنە چونکە ئەمانیش بانگەوازی جیابونەوەیان لە ئەندۆنوسیا دەستپێکردبوو بەڵام ڕێکەوتنەکە هیچ بایەخێکی بە کێشەی ئەمانە نەدابوو، هەرچەندە ئەمان هەمیشە دڵسۆزو لایەنگری هۆڵاندا بوون ئەمەش بە یەکێک لە پەڵە ڕەشە کانی مێژووی هۆڵاندا دەناسرێت.

پاش ئەوەی مۆلۆکان سەربەخۆیی خۆیان لە مانگی ئاپرلی ساڵی ١٩٥٠ ڕاگەیاند دیسانەوە بەخت یاریان نەبوو چونکە نەتەوە یەکگرتووەکان سەرقاڵی جەنگی تازە هەڵگیرساوی نێوان هەردوو کۆریا بوو، هۆڵانداش لەملاوە بێ دەنگی خۆی لێ ڕاگەیاندبوو، لەشکری ئەندۆنوسیای داخ لە دڵیش بێ ڕەحمانە هەڵی کوتایە سەریان و سەرکوتی کردن.

ژمارەیەکی زۆری مۆلۆکۆکان لەبەر ئەم ڕووداوانە بەرەو هۆڵاندا هەڵهاتن زۆربەی هەرەزۆریشیان پێشتر لە سوپای هۆڵاندادا لە ئەندۆنوسیا کاریان دەکرد[٨]، بەشی یەکەمیان لە ڕۆژی ١٩-٢-١٩٥١ گەیشتنە بەندەری ڕۆتەردام لە لایەن هۆڵانداوە بە شێوەیەکی کاتی وەرگیران و پاشان هەمووشیان لەبەر ئەوەی بە ڕەگەز ئەندۆنوسی تۆمار کرابوون بە بڕیارێکی پارلەمانی

هۆلاندیی لە خزمەتی سەربازی هۆلاندا دەرکران و خرانە هەندێک کامپی نشتەجێ بوونەوە، ئەم گروپە ئەتنیە تائێستاش خۆی بە داماوی دەستی هۆلاندا دەزانێت و هەڵوێستی هۆلاندا بە خیانەت ناو دەبات.

### سورێنام:

سورێنام دەکەوێتە ناوچەی کاریبی لە باکوری ئەمەریکای باشور ساڵی ١٤٩٩ بۆ یەکەم جار لە لایەن ئیسپانیەکانەوە داگیر کراوە پاشان لە لایەن ئینگلیزو فەرەنسی و پرتوگالیەکانیشەوە داگیر کراوە، ساڵی ١٦٦٧ هۆلاندا داگیری کرد سورێنام پێگەیەکی ستراتیژی بۆ هۆلاندا هەبووە، وێرای بەرهەم هێنانی توتن و شەکرو چەندین جۆر کشتوکاڵی دیکە بە بازرگانی کۆیلەو کۆیلایەتی کشتوکاڵ ئەو وڵاتە کە ژمارەی دانشتوانی نزیکەی نیو ملیۆن دەبێت دۆشرا. ساڵی ١٩٥٤ سورێنامیەکان بە هاوڵاتی هۆلاندی ناودەبران، هەر لەبەر ئەوەش بوو تا ڕابووردوویەکی نزیک سورێنام بەهۆی پاشماوەی داگیرکاری و کۆلۆنیالستی هەر بە هۆلانداوە پەیوەست مابوو، بەڵام ڕۆژی ٢٥-١١-١٩٧٥ سەربەخۆیی تەواوی سورێنام ڕاگەیەنرا و ئیتر وەک دەوڵەتێکی سەربەخۆ چاولێدەکرا هەر لەبەر ئەوەش بوو سنورەکانی هۆلاندای لێداخرا بە تایبەت پاش ئەوەی کە ترسی شەڕی خودکوژی لە ناوخۆی وڵاتدا هاتە ئاراوە. تاساڵی ١٩٧٥ نزیکەی ٥٥ هەزار سورێنامی هاتبونە هۆلانداوە، ساڵی ١٩٨٠ پاسپۆرتیش لە نێوان هەردوو وڵاتدا جیاکرایەوە، لەودەمەشەوە بە تایبەت پاش کودەتای ٢٥ی فێبروەری هەمان ساڵ (کە پێ دەچێت دەستی وەزارەتی بەرگری هۆلاندای تیادا بوبێت) ژمارەی سورێنامیەکان لە هۆلاندا ڕوو لە زیادبوون دەکات و ساڵی ١٩٩٩ ژمارەیان گەیشتە ٣٠٠ هەزار ، بەمەش بوونە دووەم ڕێژەی گرنگی بێگانە لە هۆلانداو ئەمڕۆ ٢٦% ی بێگانەکان پێک دێنن.

### Antillen en Aruba ئەنتالی و ئەروبایی

دەریای کاریبی چەندیین دورگەی جۆربەجۆر لە خۆ دەگرێت، بە هۆی پێگەی جوگرافی ئەم دورگانە لە سەردەمی کۆن و نوێ دا بایەخی ئابوری زۆر گەورەیان هەبووە دانیشتوانی بنەڕەتی خۆی هندیە سوورەکان بوون. ئەم

دورگانە نزیکەی ١٠ هەزار کیلومەتر لە هۆڵانداوە دوورن و ژمارەیان شەش دۆرگەیە ( Aruba , Bonaire, CuraÇo ,Saba, Sint Eustatius, Sintmarten ) ژمارەی دانشتوانیان بەسەر یەکەوە ٢٩٠ هەزارە، ساڵی ١٥١٣ بۆ یەکەم جار ئیسپانیا داگیری کردن و پاشان لە ساڵی ١٦٣٢ بەدوواوە کەوتنە دەست هۆڵاندیەکان و تا ئەمڕۆش بە ناوچەی پەیوەستی هۆڵاندا ناوزەد کراوە، چونکە خۆیان تا ئێستا جیابوونەوەیان لە هۆڵاندا پێ باش نەبووە، ئەمەش وای کرد کە پەیوەست بوونیان بە هۆڵانداوە هەر بمێنێت و لە ڕووی سیاسی و کۆمەڵایەتیەوە هەمان شێوازی مۆدیلی هۆڵاندی پەیڕەو بکەن هەرچەندە لە ناو هۆڵاندا ئێستا دەنگی هۆڵاندی زۆر هەنە کە داوای دابڕانی ئەو دورگانە دەکەن لە هۆڵاندا.

هەتا هەفتاکانیش خەڵکی ئەم دەڤەرە تەنها بۆ خوێندن ڕوویان دەکردە هۆڵانداو پاشان دەگەڕانەوە ، بەڵام لە پاش دا لەبەر تێکچونی باری ئابوری ٢.٥٠٠ کەسیان ڕووی لە هۆڵاندا کرد، لە پاش ساڵانی نەوەتەوە کۆچ بەری ئەنتالی و ئەروبیش زیادی کرد و گەیشتە نزیکەی ١٠٠ هەزار.

**میوانەکانی هۆڵاندا:-**

**ئەو میوانانەی کە نەڕۆشتنەوە**

لە کۆتایی شەستەکان و سەرەتای هەفتاکاندا هۆڵاندا زۆر پێویستی بە دەستی کرێکار بوو، ئابوری هۆڵاندا لە گەشەسەندنێکی بەردەوامدا بوو وێڕای ئاوەدان کردنەوەی تەواوی ئەو شاروشارۆچکانەی کە بە تەواوی بەهۆی جەنگەوە وێران ببون، داهاتی نەتەوەش ڕوو لە گەشەسەندن بوو.

پێشەنگی کرێکاری میوان - Gastarbeiders سەدان کرێکاری ئیتالی بوون کە ڕاستەو خۆ پاش جەنگی جیهانی دووەم گەیشتنە وڵات، پاشان بە هەمان شێوە سەدان و هەزاران کرێکاری یوگوسلاڤی و یۆنانی و پرتوگالی و تورک و مەغریبی لە لایەن هۆڵانداوە بۆ کار داواکران، هەروەک بە ناوەکەیاندا دیارە ( کرێکاری میوان ) بەو مەبەستە میوانداریان کراکە لە بنیاتنانەوەی پاش جەنگدا بەشداربن و پاشان بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان بەڵام بەهۆی مانەوەی درێژیان لەم وڵاتەدا و بە پێ ی یاسا پاسپۆرتی هۆڵاندیان پێدرا. لەم

نەخشەیەی خوارەوەدا کە وەزارەتی کۆمەڵایەتی و کاروباری تەندروستی ڕۆژی ١٥-٣-١٩٧٠ ئامادەی کردووە ژمارەی کرێکارە میوانەکان دەردەکەون.
سەرچاوە: www.gemm.nl/webgemms/ao

| وڵاتی لێوە هاتوو | ژمارەی کرێکاری میوان |
|---|---|
| یۆنان | ١٥٠٠ |
| یوگوسلاڤیا | ٣٧٠٠ |
| ئیتالیا | ١٠٠٠٠ |
| مەغرب | ١٦٠٤١ |
| پرتوگال | ٢٣٥٠ |
| ئیسپانیا | ١٢٣٢٠ |
| تورکیا | ١٧٦٦٠ |

ئەم کرێکارانە بەهۆی جیاوازی نێوان بەهای پارە لە ئەوروپاو وڵاتانی خۆیان (کە هەموویان لە بنەڕەتدا لەبەر بێکاری سەری خۆیان هەڵگرتبوو) هەر وەها لەبەر پێشکەوتوویی ئەوروپا لە چاو گوندو شارەکانی خۆیاندا، لەم وڵاتانە مانەوەو وەچەیان خستەوەو زیادیان کرد، وێرای ئەوەش بە سود وەرگرتن لە یاسای هاوڵاتی بونیان ئەم کرێکارانە و پاشانیش نەوەکانیان هەزاران کەسیان لە خزم و کەس و کارەکانیان بە پێ ی یاسای کۆکردنەوەی خێزان ( gezinshereniging ) ڕاکێشا. ئێستا ڕەوەندی ئیسلامی نەک تەنیا لە هۆڵاندا بەڵکو لە تەواوی ئەوروپادا بڵاوبۆتەوەو لەهەندێک لەو وڵاتانەشدا ئایینی ئیسلام وەک ئایینی دووەم ناوزەدکراوە.

**میوانە نەخوازراوەکان:-**

یەکێک لە ئامرازەکانی شەڕی ساردی نێوان بلۆکی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بریتی بوو لە بەخشینی مافی پەنابەری سیاسی بۆ ئەوکەسانەی کە لە وڵاتی

خۆیانەوە توشی چەوسانەوە هاتوون، هەڵبەتە یەکێک لە مەبەستەکانی بەخشینی ئەم مافە بریتی بوو لە داڵدەدانی ئەو کەسانەی لە بلۆکی ڕۆژهەڵاتەوە هەڵدێن.
بە پێ ی ڕێکەوتن نامەی جنێف ساڵی ١٩٥١ مافی پەنابەری دەدرێتە ئەو کەسانەی کە توشی هەڵاواردن یاخود چەوسانەوەی نەتەوەیی، مەزهەبی، ڕەگەزی، ئایینی یاخود سیاسی دەبن. لە سەرەتای ئەم بڕیارەوە ساڵانە هۆڵاندا چەند سەد کەسێکی لەو پەنابەرانە وەردەگرت و مافی دەدانێ، هەتا ساڵەکانی هەشتا ئەمە هیچ کێشەیەکی ئەوتۆی بۆ هۆڵاندا دروست نەکردبوو تا ساڵی ١٩٨٥ کە ژمارەیەکی زۆر لە پەنابەری سیریلانکایی لە گروپی تامیل ڕوویان لە هۆڵاندا کردو داوای مافی پەنابەریان کرد، ئیتر لەو ساوە ژمارەی پەنابەران زیادی دەکرد تا کار گەیشتە ئەوەی ساڵانە لە هۆڵاندا ٤٠ هەزار کەس داوای مافی پەنابەری بکات.
بە پێ ی ڕاپۆرتی وەزارەتی کۆچی هۆڵاندا پەنابەرەکان بە شێوەیەکی گشتی ڕادەی خوێندەواریان بەرزە و لە وڵاتانی خۆیاندا شارەزاییەکی زۆریان هەبووە.
ئەم نەخشەیەی خوارەوە ژمارەی پەنابەران لە هۆڵاندا دەخاتە ڕوو:
سەرچاوە: سەنتەری گشتی سەرژمێرە لە هۆڵاندا
بەم جۆرە ئەگەر سەیری نەخشەکە بکەین بۆمان دەردەکەوێت بە شی هەرە زۆری ئەو وڵاتانەی کە پەنابەری بۆ هۆڵاندا لێوەهاتووە وڵاتانی ئیسلامین کە ئەفگانستان هەتا ساڵانی کۆتایی سەدەی بیستەم لە ڕیزی پێشەوەی ئە وڵاتانە بووە زۆرترین ژمارەی پەنابەرانی لێوە هاتووە.
سەرئێشەیەکی زۆر کە پەنابەران بۆ تەواوی وڵاتە ئەوروپیەکانیان دروست

| وڵات | ١٩٩٠ | ١٩٩١ | ١٩٩٢ | ١٩٩٣ | ١٩٩٤ | ١٩٩٥ | ١٩٩٦ | ١٩٩٧ | ١٩٩٨ | بەگشتی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ئەفگانستان | ٣٨٠ | ١٤٨ | ٢٦٥ | ٩٠٨ | ١١٩٤ | ١٤٧٩ | ٢٨٤٦ | ٣٦٦٣ | ٣٩٢٣ | ١٤٧٢٤ |
| ئەنگۆلا | ١٩٠ | ١٩١ | ١٥٠ | ٢٧٥ | ٥٢٣ | ٦٨٧ | ٥٠٦ | ٢٤٥ | ٣٢٤ | ٣٢٠١ |
| ئەتیوپیا | ١١١٦ | ٨٩٩ | ٦٩٤ | ٤٩٥ | ٤٩٩ | ٤٧٢ | ٣٩٠ | ٣١٣ | ٣٠٣ | ٥١٨١ |
| گانا | ١٦٨٠ | ١٩٩٧ | ١٤٠٨ | ١٣٨٤ | ٥٢٣ | ٣٤٧ | ٦٥٩ | ٦٨٧ | ٦٤٥ | ٩٣٣٠ |
| عێراق | ٣٧٦ | ٣٥٦ | ٩٥٩ | ٢٠٤٧ | ٢٨٧٢ | ٢٩٨٤ | ٤٦٧٠ | ٦١١٨ | ٧٣٥٥ | ٢٧٧٣٧ |
| ئێران | ١٢٨٦ | ١٦٣٣ | ١٧٢٢ | ١٩٦٦ | ٢٢٧٥ | ٢٦٢٦ | ٢٧٨٨ | ١٦٥٨ | ١١٠٦ | ١٧٠٦١ |
| یۆگۆسلافیای جاران | ١٢٨٤ | ٢١٥٥ | ٥٠٩٢ | ٨٩٩٩ | ٨٦٢٩ | ٧٥٣٨ | ٣٦٠٩ | ١٧٩٠ | ١٦١٤ | ٤٠٧١٠ |
| سۆماڵ | ١٩٨٠ | ١٣٣١ | ٢٠٦٨ | ٥٦٦١ | ٣٣٧٣ | ٢٩٢٢ | ٢٤٦٢ | ١٦٢٥ | ١٣٤٤ | ٢٣٧٦٦ |
| سیریلانکا | ٧١٠ | ٦٣٧ | ٥٦٢ | ٩٦٧ | ٧٣٤ | ٥٩٤ | ٤٠٦ | ٥٣٦ | ٥٦٠ | ٥٧٠٦ |
| ڤێتنام | ٥٠٦ | ٦٨٦ | ٨٣٦ | ٥٣٩ | ٢٢٣ | ١٨٩ | ٢٤٤ | ٢٦٢ | ٣١٣ | ٣٧٩٨ |
| زائیر (کۆنگۆ) | ٢٥٢ | ١٩١ | ٣٢٧ | ٦٤٤ | ٩٢٦ | ١٠٣٢ | ٥٢٦ | ٢٩٥ | ٢٦٧ | ٤٦٦٠ |
| وڵاتانی دیکە | ٧١٥٧٦ | ٧٤١١٣ | ٦٨٩٣٨ | ٦٣٦٨٨ | ٤٦٦٥٣ | ٤٦١٠٢ | ٥٧٠٧١ | ٥٩٣٤٤ | ٦٣٨٣٧ | ٥٥١٣٢٢ |
| کۆی گشتی وڵاتان | ٨١٢٦٤ | ٨٤٣٣٧ | ٨٣٠٢٢ | ٨٧٥٧٣ | ٦٨٤٢٤ | ٦٦٩٧٢ | ٧٧١٧٧ | ٧٦٧٣٦ | ٨١٧٠١ | ٧٠٧٢٠٦ |

کردووه ئەوەیە کە ئەوانە کێشە ئەتنی و سیاسیەکانی وڵاتی خۆیان درێژ دەکەنەوە بۆ ناو ئەو وڵاتانەی کە ئێستا مافی پەنابەریان تیادا وەرگرتووە، زۆر جار کێشەکان دەچنە قاڵبی توندو تیژییەوە، پارتی کرێکارانی کووردستان ( پ.ک.ک) باشترین نمونەیە کە لە کاتی خۆپیشاندانادا دژی تورکیا زۆر جار سەرپێچی یاساکانیشیان دەکرد، لە کاتی دەستگیر کردنی بەرێز عەبدوڵا ئۆجەلان لە ڕۆژی ١٥-٢-١٩٩٩ لە خۆپیشاندانێکدا زیانی چەندین ملیۆن دۆلاریان لە دەوڵەت دا، هەروەها ئۆپۆزیسیۆنەکانی دیکەی وڵاتانی تری دنیا کە مافە مرۆیی و سیاسیەکانی تیادا پێشێل دەکرێت دیسانەوە بەهۆی چالاکی پەنابەرەکان و چالاکی دەوڵەتەکانیان دژی پەنابەران هەمان گرفتیان بۆ هۆڵاندا دروست کردووە.

پاش ڕووداوەکانی ١١ی سێپتێمبەری ئەمەریکاو ئاشکرا بوونی چالاکی گروپە تیرۆریستیەکان و تۆڕەکانی ئەلقاعدە لە وڵاتانی ئەوروپا، هۆڵاندا لە ڕیزی پێشەوەی ئەو وڵاتانە بوو کە بڕیاری دا سنورێک بۆ پەنابەران و میوانە نەخوازراوەکان دابنێت و ئیتر چی دی ماوە نەدات ئەو گروپانە لە مافی پەنابەری و پاسپۆرت وەرگرتن سودمەندبن و لە ژێر سایەی ئەومافانەی کە لەم وڵاتانەدا بە دەستی دێنن ببنە مایەی هەڕەشە کردن بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەیی و ئاسایشی گشتی لە بە ر ئە وە هۆڵاندا بڕیاری دا کەمترین ژمارەی پەنابەران وەرگرێت و زۆرترین ژمارەشیان دەربکات بۆیە ژمارەی پەنابەران لە چاو جاراندا بە شێوەیەکی سەرنج ڕاکێش کەم بۆتەوە، ئەم خشتەیەی خوارەوەش ئەو ڕاستیە ڕوون دەکاتەوە.

سەرچاوە: سەنتەری گشتی سەرژمێرە لە هۆڵاندا:

| ساڵ | کۆی گشتی پەنابەران | ژمارەی پەنابەری وەرگیراو بە شێوەی کاتی یان هەمیشەیی | ژمارەی پەنابەرانی ڕەت کراو |
|---|---|---|---|
| ٢٠٠٠ | ٤٣.٥٦٠ | ٩.٧٣٠ | ١٦.٦٢٠ |
| ٢٠٠١ | ٣٢.٥٨٠ | ١٠.٥٨٠ | ١٦.٠٢٠ |
| ٢٠٠٢ | ١٨.٦٧٠ | ٨.٨٢٠ | ٢١.٢٦٠ |
| ٢٠٠٣ | ١٣.٤٠٠ | ٩.٧٦٠ | ٢١.٨٦٠ |
| ٢٠٠٤ | ٩٧٨٠ | ١٠١٧٠ | ١٤٩١٠ |

لەو خشتەیەی سەرەوەدا بۆمان دەردەکەوێت کە ژمارەی پەنابەران تا بێت ڕوو لە کەمی دەکات و ژمارەی پەنابەرانی دەرکراویش تابێت زیاد دەکات، بە پێ ی تازەترین زانیاریەکانی وەزارەتی داد بەشی کۆچ و پەنابەری، ساڵی ٢٠٠٤ ژمارەی تەواوی پەنابەران ٩٨٧٢ کەس بوون ئەمەش مانای ئەوەیە کە

لە چاو ساڵی پێشتردا بە ڕیژەی ٣٠% ژمارەی پەنابەران کەمی کردووە، بەمەش ژمارەی پەنابەران گەڕاوەتەوە بۆ هەمان ڕێژەی ساڵی ١٩٨٨ .
نەخشەی حکومەتی هۆڵاندا لە ئێستادا بریتیە لە کەم کردنەوەی ڕێژەی هەردوو جۆری میوان، بەم شێوەیە بە پیادە کردنی ئەم سیاسەتە حکومەتی هۆڵاندا دەیەوێت ژمارەی ڕوو لە زیادبووی ڕەوەندی ئیسلامی ڕابگرێت و سنورێک بۆ زیاد بوونی بەردەوامی ژمارەیان دابنێت، بەڵام پێدەچێت تازە هەرچۆنێک لەمەودووا هەنگاوی توندوتیژ بگرێتە بەر بۆ ڕێگەگرتن لە زیاد بوونی قەبارەی ئەم ڕەوەندە تاڕادەیەک هەوڵەکە نەزۆک بێت چونکە ئێستا ڕەوەندی ئیسلامی لە نێو هۆڵاندادا نەک تەنها شوناسنامەی هۆڵاندی هەیە بەڵکو لە نێو خودی خۆشیاندا هەمیشە ڕوو لە زیادکردنن بە پێچەوانەی کۆمەڵگای هۆڵاندی کە ڕێژەی زاووزێ تیایدا کەمە. هەر لەبەر ئەمەشە حکومەتی هۆڵاندا هەنگاوەکانی ئاوێتە کردن و توانەوەی زیاتری ئەم ڕەوەندەی بە جدی گرتووە.
ئێستا ئیتر هەموو ئەو کەسانەی لە هۆڵاندا دەژین و دەکەونە تەمەنی پاش چواردەو پازدە ساڵ لەگەڵ بابەتێکی زۆر گەرم و گوڕ دەکەونە گفتوگۆو کێشە ئەوبابەتەش دوو ووشەی زۆر تیادا بە کار دێت:
Autochtonen یەکەم / ڕەسەن
بە پێ ی لێکدانەوەی سەنتەری گشتی سەرژمێرە هۆڵاندی ڕەسەن ئەوانەن کە دایک و باوکیان هۆڵاندین و لە ناو هۆڵاندا لە دایک بوون.

Allochtonen دووەم/ ناڕەسەن
بە پێ ی هەمان لێکدانەوەی سەنتەری گشتی سەرژمێرە ئەوانەن کە بەلای کەمەوە دایک یان باوکیان بێگانەن و لە دەرەوەی هۆڵاندا لە دایک بوون، پاشان لە نێو ئەم پۆلێن کردنەدا نەوەی یەکەم دێت، نەوەی یەکەم ئەوانەن کە خۆیان لە هۆڵاندا لە دایک بوون بەڵام دایکیان یان باوکیان یان هەردوکیان لە دەرەوەی هۆڵاندا لەدایک بوون و بێگانەن. هۆڵاندی ناڕەسەن لە نەوەی دووەم ئەوانەن کە دایک و باوکیان بە ڕەگەز بێگانەن بەڵام لە نێو هۆڵاندا لە دایک بوون...
هۆڵاندیە ڕەسەنەکان ئەوانەن کە هۆڵاندا بەوڵاتی خۆیان دەزانن و قژ زەردو ڕەنگ سپین، هۆڵاندیە ناڕەسەنەکانیش ئەوانەن کە بەشێوەیەکی گشتی قژ ڕەش ( موو ڕەش) ن . تەنها ووشەی ڕەسەن و ناڕەسەن هۆڵاندی و بێگانە لە یەک جیاناکاتەوە بەڵکو چەندین ووشەی دیکە هەنە کە هەمووی ئاماژەن بۆ

جـۆری ئـەو کـەسـە بێگانـەیـە، لـەم وڵاتـە ووشـە گـەلێکـی وەک ( کـۆچ بـەران migranten ، گروپـی کـەمینـەی ئـەتنـی Atnische minderheiden ، بێگانـەکـان vreemdelingen ، ڕەشـەکـان zwarten ، کرێکـارە میوانەکان gaastarbeiders ، بیانیەکان buitenlanders،هتد..) هەموو ئاماژەن بۆ جیاوازی کردن لە نێوان جۆری ئەو کەسە بیانیە لە نێو کۆمەڵگای هۆڵاندیدا.
بەکار هێنانی هەموو ئەو زاراوانە تەنها یەک ڕاستی دەخاتە ڕوو ئـەویش ئەوەیە هاوڵاتی بێگانە چەند ساڵ لەم وڵاتەش بێت هەست بە بێگانە بوونی خۆی دەکات و هەمیشە بۆی دووپات دەبێتەوە کە بێگانەیە..
ئـەم ووشـە گـەلـە بـە تـەواوی بۆتـە هـۆی دروست بـوونی بیرکردنـەوەیـەکـی تایبەت بە هـەردوولا ( ئێمـەو ئـەوان ، ئێمـەو ئێـوە ) ئـەمـەش خـۆی لـەخۆیدا جیاکردنەوەی ڕەگەزپەرستی نیشاندەدات و هەر ئەم خاڵـەشە کـە هـەر خـۆی سەرەتاو کۆتاییشە لە کێشەکەدا( خاڵی دەستپێک و کۆتاییش) ە.

## ئایین لە هۆڵاندا:-

کۆبوونـەوەی ئـەو هـەمـوو گروپـە جیاوازانـە لـە هۆڵانـدا ڕاستیـەکـی دیکـەی سەپاندە سەرکۆمەڵگا ئەویش ئەوەیە کە ئایین و باوەڕێکی زۆر خۆیان کوتایە نێـو ئـەم وڵاتـەو شـانبەشـانی ئامـادە بـوونی ئـەنـدامانی ئـەو ڕەوەندانـە ئایینەکانیشیان لەگەڵ خۆیاندا هێناو کردیانە بەشێکی سـەرەکـی و زینـدووی کلتوری خۆیان لە تاراوگە.
جگـە لـە ئـاییـنی مـەسیحی کـە ئـاییـنی زۆربـەی هۆڵاندیـە بـاوەڕدارەکانـە چـەنـدین ئـاییـنی دیکـەی وەک ئیـسلام و جولـەکـە و هنـدۆس و بـودایی لـەم وڵاتەدا بونیان هەیە.
ڕێژەیەکی زۆر بەرز لە هۆڵاندیەکان باوەڕیـان بـە هـیچ ئـاییـنێکی ئاسمانی نیـەو هـیچ پـەیـوەندیـەکیـان بـە ئاییـنەوە نـەمـاوە، بـەڵام کلتـوری وڵاتـەکـە تاڕادەیەکی زۆر مەسیحیە و جەژنـەکـان و ڕۆژەکـانی پشوو بـەشێکی زۆریـان ئاییـنین.

لەم خشتەیەی خوارەوەدا ڕێژەو جۆری ئایینەکان دەخەینەڕوو:-
سەرچاوە: سەنتەری گشتی سەرژمێرە لە هۆڵاندا:

| | ١٩٦٠ | ١٩٧٠ | ١٩٨٠ | ١٩٩٠ | ١٩٩٥ | ١٩٩٩ | ٢٠٠٥ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| بێ باوەڕ | ٢٩ | ٣٨ | ٤٦ | ٥٤ | ٥٨ | ٦١ | ٦٤ |
| کاتۆلیک | ٣٧ | ٣٣ | ٢٧ | ٢٢ | ١٩ | ١٧ | ١٥ |
| پرۆتستانت | ٣١ | ٢٦ | ٢٢ | ١٨ | ١٥ | ١٤ | ١٥ |
| ئیسلام | ٠ | ٠ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٥.٨ |
| ئایینەکانی دیکە | ٢ | ٣ | ٣ | ٤ | ٤ | ٤ | ٤ |

هەروەک سەرنج دەدەین لەو خشتەیەدا سالّی ٢٠٠٥ ژمارەی ئەو هۆڵاندیانەی باوەڕیان بە هیچ ئایینێک نییە تا بێت زیاد دەکات و ڕێژەی ٦٤% پێک دێنێت، بە پێ ی لێکدانەوەی سەنتەرە چاودێرەکان سالّی ٢٠١٠ ئەم ڕێژەیە دەگاتە ٦٧%. هەر لە خشتەکەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە ژمارەی ئەندامانی ڕەوەندی ئیسلامی ڕوو لە زیاد بوونە و تادێت ڕێژەی ئەو ڕەوەندە بەرامبەر بە ڕێژەی گشتی دانشتوانی هۆڵاندا بەرزدەبێتەوە.
پاش ئیسلام ( پاشان بە درێژی لێ ی دەکۆڵینەوە ) هندۆس ڕێژەیەکی دیکەی ئایین و باوەڕ لە
هۆڵاندا پێک دێنێت، لە جیهاندا نزیکەی ٥٠٠ ملیون هندۆس هەیە و بە ئایینێکی مەزنی جیهانی دەژمێردرێت کە مەڵبەندەکەی هندستانە.
لە هۆڵاندا ئایینی هندۆسی و بودایی پێکەوە ناودەبرێن و هەرگیز بە جیاوازی و بە بێ یەکتر ژمارە یاخود ڕێژەیەکی ڕاستیان بۆ نەخراوەتە ڕوو، بەڵام پێکەوە نزیکەی ٨٠ هەزار کەس دەبن و هاوچەشنی هەموو ئایینەکانی دیکە خۆیان لە چەندین ڕێکخراوی ئایینی و تایفەیی دا ڕێکخستووە.
کەمینەی نەتەوە یی و ئایینی جولەکەش لە هۆڵاندا بەشێکی دیکە لە ئایینەکان پێک دێنن، ژمارەی جولەکە لە هۆڵاندا نزیکەی ٦٥ هەزار کەس دەبێت، ئەمانە پاش کەوتنی ئەندەلوس لە سالّی ١٤٩٢ ناچارکران لە ئیسپانیا کۆچ بکەن، ئەودەمەی شارستانی ئیسلام لە ئەندەلوس بالاّدەست بوو، لەژێر سێبەری خەلیفەی موسڵمانانندا هەموو ئایینەکان تەنانەت جولەکەکانیش لە گەڵ موسڵمانانندا پێکەوە دەژیان.هەندێکیان لەگەڵ برا موسڵمانەکانیاندا ڕۆشتنە مەغریب و ئەوانی دیکەش هاتنە هۆڵانداو بەلجیکا.

ڕێژەی جولەکە لە هۆڵاندا تەنها ۳،۰% دەبێت بەڵام هاوتای هەموو وڵاتانی دیکەی دنیا دەست ڕۆشتوون و چەندیین بواریان بۆ خۆیان کۆنترۆڵ کردووە کە بازاڕو میدیا هەرە دیارەکانیانە.

وێرای ئەو ئاییینانەی کە ناومان بردن چەندین ئایین و نەتەوەی دیکە لە هۆڵاندا دەژین و ڕیژەی جیاوازی کۆمەڵگا پێک دێنن. ئەم ئایین و نەتەوانەش هەر هەموویان ئازادن لە پێک هێنانی کۆمەڵەو ڕێکخراوەکانیاندا، بۆیە دەبینین لە هۆڵاندا بە هەزاران ڕێکخراوی کلتوری جیاواز هەیە کە زۆربەی هەرە زۆریشیان لە لایەن حکومەتەوە کۆمەک دەکرێن و تاکە مەبەستیش لە کۆمەک کردنیان بریتیە لە هەوڵی حکومەتی هۆڵاندا بۆ ئاوێتە بوونیان لە نێو کۆمەڵگادا.

**ئیسلام:-**

هەروەک لە سەرەتای ئەم بەشەوە باسمان کرد، میوانەکان بەهەردوو شێوەکەوە نەڕۆشتنەوە بەڵکو لە ماڵی خانە خوێ (هۆڵاندا) دایان کوتی... ئێستا ئیتر ژمارەی ڕەوەندی ئیسلامی بۆتە ژمارەیەکی گەورەو ترسناک بۆ حکومەتی هۆڵاندا، ئەم خشتەیەی خوارەوەش ژمارەی ڕەوەندی ئیسلامی بە بێ ئاماژە دان بە نەتەوەو وڵاتی لێوە هاتوو نیشان دەدات.

سەرچاوە: سەنتەری گشتی سەرژمێرە لە هۆڵاندا/ ۲۰۰۵/۱/۱۰
www.statline.cbs.nl/statweb/table.asp

| ساڵ | نەوەی یەکەم 1000x | نەوەی دووەم 1000x | کۆی گشتی 1000x ئیسلام | ڕێژەی ئیسلام لە کۆمەڵگای هۆلاندی. |
|---|---|---|---|---|
| ۱۹۹۳ | - | - | ٥٦٦ | ۳.۷ |
| ۱۹۹٤ | - | - | ٦۰۲ | ۳.۹ |
| ۱۹۹٥ | ٤۱٤ | ۲۱۱ | ٦۲٥ | ٤.۱ |
| ۱۹۹٦ | ٤۲۸ | ۲۲٥ | ٦٥٤ | ٤.۲ |
| ۱۹۹۷ | ٤٤۷ | ۲٤۱ | ٦۸۷ | ٤.٤ |
| ۱۹۹۸ | ٤٦۷ | ۲٥۷ | ۷۲٤ | ٤.٦ |
| ۱۹۹۹ | ٤۹۰ | ۲۷٥ | ۷٦٥ | ٤.۹ |
| ۲۰۰۰ | ٥۰۹ | ۲۹۲ | ۸۰۱ | ٥.۱ |
| ۲۰۰۱ | ٥۳٤ | ۳۱۰ | ۸٤٤ | ٥.۳ |
| ۲۰۰۲ | ٥٥۸ | ۳۲۸ | ۸۸٦ | ٥.٥ |
| ۲۰۰۳ | ٥۷۳ | ۳٤٦ | ۹۱۹ | ٥.۷ |
| ۲۰۰٤ | ٥۸۲ | ۳٦۲ | ۹٤٤ | ٥.۸ |

سەرنجی خشتەکە بدە، ڕەوەندی ئیسلامی لە نێوان ماوەیەکی کورتدا ژمارەی زۆر زیادی کردووە ، لە ساڵی ٢٠٠٤ ژمارەیان گەشتۆتە ٩٤٤ هەزارکەس بەم جۆرە ڕێژەی ئەم ڕەوەندە لە چاو تەواوی ژمارەی دانشتوانی هۆلاندا هەر وەک بۆمان دەردەکەویت ٥،٨% دەبێت واتە نزیکەی ٦% ی کۆمەڵگای هۆلاندی. بە پێ ی سەرچاوەکانی سەنتەری ئاماری هۆلاندا لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠٦ دا ژمارەی ڕەوەندی ئیسلامی سنوری یەک ملوێن تێپەڕ دەکات.

لەم بارەوە لە ڕووی دیموگرافیەوە دوو خاڵ بۆتە مایەی مەترسی بۆ حکومەتی هۆلاندا:

١- ڕێژە ی گەشەسەندنی زاووزێ لە نێو ڕەوەندی ئیسلامی ٢،٥% بەڵام ئەم ڕێژەیە لە نێو خودی هۆلاندیەکاندا لە باشترین حاڵەتدا ١،٥% تێپەرناکات، بۆیە لە نێوان ١٥ ساڵدا ڕێژەی گشتی ئیسلام لە چاو تەواوی کۆمەڵگای هۆلاندی ڕوو لە زیاد بوونە.

٢- تەنها ڕەوەندی ئیسلامی نەبۆتە هۆی هەرەشە بۆ سەر دیموگرافیای هۆلاندا بەڵکو چەندین جۆری کۆچ بەری دیکەش بە هەمان شێوە ڕێژەیان زۆرەو بوونە تە هۆی گۆڕانکاری زۆر لە دیموگرافیای ئەم وڵاتە بۆ نمونە لە شارێکی وەک ئەمستەردام کە بە پێ ی سەرژمێرەی ڕۆژی ١-١-٢٠٠٤ ژمارەی دانشتوانی ٧٣٨.٧٦٩ کەس دەبێت، ژمارەی بێگانە تیایدا ٣٥٣.٠٧٦ دەبێت. ڕێژەی بێگانە تیایدا دەگاتە نزیکەی ٤٨ %.

کۆی گشتی هۆلاندی نارەسەن ( بێگانە / ئەجنەبی ) لە هۆلاندا ٣.٠٨٨.١٥٢ ملیۆن دەبێت واتە ڕێژەی ١٩% ی دانیشتوانی هۆلاندا بێگانەن، چاوەڕوان دەکرێت ئەم ژمارەیە لە ساڵی ٢٠١٥ خۆی لە چوار ملیۆن کەس بدات. لە چوار شارە گەورەکەی هۆلاندا ئەمستەردام، ڕۆتەردام، دەنهاخ و ئوترێخت لە نێوان ٢٠ – ٣٥ % دانیشتوانەکەی بێگانەن.کێشەی دیموگرافیا تەنها کێشەی هۆلاندا نی یە بەڵکو لە زۆربەی وڵاتە ئەوروپیەکاندا هەمان کێشە بەدی دەکرێت، ئەم ڕەوەندە هاو شێوەی هۆلاندا ڕێژەی زاووزێ تیایدا هەمیشە دوو یان سێ ئەوەندەی خەڵکی ڕەسەنی ئەو وڵاتانەن ئەمەش وای کردووە تەواوی ئەو وڵاتانە ئەم کێشەیە وەک ( قومبەلەی تەوقیت کراو) ی ئایندە چاو لێکەن بەڵام پێویستە لێرەدا زیاتر بچینە نێو ووردەکاری بابەتەکەوە، چونکە زانینی پێکهاتەکانی ڕەوەندی ئیسلامی زۆر پێویستە بۆ تێگەیشتنی زیاتر لە

ئیسلامی سیاسی و دابەش بوونی بەسەر بەشە جیاوازەکان و نەتەوە جیاوازەکانی نێو هۆلاندا.
بۆ باشتر شیکردنەوەی ئەم باسە پێویست دەکات لێرەدا ئاماژەیەک بە رەوەندی ئیسلامی لە ئەوروپاش بدەین..

### رەوەندی ئیسلامی لە ئەوروپا:

سەرژمێرێکی تەواو لەسەر ژمارەو بنەڕەت یاخود رەگەزەکانی رەوەندی ئیسلامی لە ئەوروپا بەدی ناکرێت، هەندێک سەرچاوە ئاماژە بە ٢٥ ملوێن کەس دەکەن ( بێ گومان ئەم ئامارە رەوەندی ئیسلامی ئەمەریکاش دەگرێتەوە) و هەندێکی دیکەش بە ١٥ملیۆن ( تەنها لە ئەوروپا و بەبێ ئەمەریکا) ، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی پێدەچێت لە ئێستادا کە ژمارەی تەواوی دانشتوانی ئەوروپا خۆی لە ٧٠٥ ملیۆن کەس دەدات رێژەی موسڵمانان تیایدا خۆی لە ٤% دا بدات.
لێرەدا هەوڵ دەدەین کە ژمارەو وردەکاریەکانی ئەو رەوەندە لە هەندێک لە وڵاتانی خۆرئاوا بخەینە روو:

**فەڕەنسا:**
ژمارەی ئەندامانی رەوەندی ئیسلامی خۆی دەدات لە ٦ ملیۆن ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەم رەوەندە رێژەی ١٠% ی کۆمەڵگای فەرەنسی پێک دێنێت کە خۆی لە ٦٠ ملیۆن دەدات..پتر لە نیوەی ئەم رەوەندە واتە ٣ ملیۆن کەس بنەڕەتی عەرەبیان هەیە.
ساڵی ١٩٩٦ ئەنجومەنی نوێنەرایەتی ئیسلامی لەم وڵاتە پێکهێنراو ساڵی ٢٠٠٠ یش ئاینی ئیسلام وەک یەکێک لە ئاینە فەرمیەکانی دەوڵەت ناسراوە، ئەم رەوەندە جگە لە هەزارەها کۆمەڵەی کلتوری و سیاسی و ئاینی ١٥٠٠ مزگەوتیشی هەیە.

## ئەمەریکا:

ژمارەی ئەندامانی رەوەندی ئیسلامی لە ئەمەریکا سالی ١٩٩٠ لە ٥.٣ ملیۆن کەس تێپەڕی نەدەکرد، بەلام هاوشێوەی تەواوی دەولەتانی خۆرئاوا ئەم رەوەندە بە شێوەیەکی بەرچاو رووی لە زیاد بوون کرد، سالی ٢٠٠٠ ژمارەکەی خۆی دا لە ٧.١٥ ملیۆن ، بە پێ ی تازەترین سەرژمێرە سالی ٢٠٠٥ ژمارەی ئەندامانی رەوەندی ئیسلامی ٨.٢ ملیۆن کەس دەبێت کە ئەمەش خۆی لە رێژەی ٢.٢% ی دانشتوانی ئەمەریکا دەدات.

رەوەندی ئیسلامی لە ئەمەریکا لەم بنەڕەتانەی خوارەوە پێک دێت:

٣.٩٥ ملیۆن لە بنەڕەتی ئەفەریقین واتە رێژەی ٤٨.٢%

١.٩٦ ملیۆن لە بنەڕەتی ئاسیاوین واتە رێژەی ١٨.٥%.

١.٥٢ ملیۆن لە بنەڕەتی خۆرهەلاتی واتە رێژەی ١٨.٥%.

٠.٧٧ ملیۆن لە بنەڕەتی ئەوروپی و ئەمەریکی و ولاتانی دیکە واتە ٩.٣%.

زۆربەی ئەم رەوەندەش بە رێژەی ٧٤.٢% موسلمانی سەربە ئاینزای سونەن و بەرێژەی ٢١.١% دا شیعەن.

## ئەلمانیا:

لە ئەلمانیا ژمارەی رەوەندی ئیسلامی ٣.٢٠٠.٠٠٠ ملیۆن کەس دە بێت کە بنەڕەتیان بۆ ٤١ دەولەت دەگەڕێتەوە، ئەم رەوەندە زیاتر تورکن ( هەلبەتە بەشێکی یەکجار زۆری ئەم رەوەندە کە بە تورک ناونوس کراون کوردی باکوری کوردستانن، بەلام هاوتای هاولاتیانی کوردی باشورو رۆژهەلات و خۆرئاوای کوردستان کە بە عێراقی و ئێرانی و سوری ناونوس کراون ئەوانیش بە تورک ناونوس کراون). پاش تورک یۆگوسلافیای کۆن وعەرەبەکان زۆرینەی ئەو رەوەندە لە ئەلمانیا پێک دێنن.

یەکیەتی ئیسلامی تورکی گەورەترین کۆمەلەی موسلمانانە لە ئەلمانیا کە ٧٧٦ کۆمەلەی ئیسلامی لە خۆ دەگرێت.

سالی ١٩٨٦ کۆنسەی موسلمانان لە ئەلمانیای فدرالی و سالی ١٩٩٤ ئەنجومەنی ئیسلامی دروست بوون، ئەم ئەنجومەنە کە ٣٠ رێکخراوی

موسڵمان پێکیان هێناوە ڕێکخراوی توند ڕەوی (میلی گوروش ) کە پاشان دێنە سەر باسکردنی دەستی بەسەر ئەم ئەنجومەنەدا گرتووە کە بە تەنها خۆی لە ئەڵمانیا ٢٠٠ مزگەوت بەڕێوە دەبات.

بەریتانیا:

بەپێ ی بەڵگە نامەکانی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا، ژمارەی موسڵمانان ساڵی٢٠٠١ پتر لە ١.٦ ملیۆن کەس بوون، بەڵام لە ئێستا ئەو ژمارەیە خۆی لە پتر لە ٢ ملیۆن دەدات کە یەک ملیۆنی لە لەندەنی پایتەخت دەژی،لەم ژمارەیە ڕێژەی هەرەزۆریان بە نگلادیشی (٢٤%) و پاکستانی(٢٢%) ن، وێرای ئەوەش ڕێژەیەکی بەرزی عەرەب و تورک و ئێرانی تیادا دەژی، جگە لەو ڕەوەندەی کە بنەڕەتی ئەفریقایی هەیە. ساڵی ١٩٩٧ یەکەم کەسی ئەم ڕەوەندە کە ناوی موحەمەد سرور بوو توانی پۆستی ئەنجومەنی لۆردەکان بەدەست بێنێت کە ئەمەش لە مێژوی بەریتانیا بۆ یەکەم جار بوو، بەڵام ئێستا ٥ ئەندامی ئەنجومەنی لۆردەکان و ١٢ سەرۆک شارەوانی لە ئەندامانی ڕەوەندی ئیسلامی پێک دێن . بەپێ ی ئامارەکانی ساڵی٢٠٠٣ ڕەوەندی ئیسلامی لە بەریتانیا ٨٠٠ مزگەوت بەڕێوە دەبات.

بەلجیکا:

ژمارەی ڕەوەندی ئیسلامی لە بەلجیکا ١٨٠ هەزار کەس دەبێت، ئەم ژمارەیە ڕێژەی ١،٨% ی دانشتوان پێک دێنێت، ئەم ڕەوەندە بەشی هەرە زۆریان بنەڕەتی تورک و پاشان بەشەکانی دیکەش بنەڕەتی مەغریبی و جەزائیریان هەیە. ساڵی ١٩٩٨ ئەنجومەنی ئیسلامي هەڵبژێردراو بە فەرمی لە لایەن دەوڵەتەوە وەک نوێنەری ڕەوەندەکە ناسران. ئەم ڕەوەندە ٣٨٣ مزگەوتی هەیە.

**ئیتالیا:** ژمارەی ڕەوەند خۆی لە ١،٣٧٥.٠٠٠ دەدات، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی ڕەوەندی ئیسلامی ڕێژەی ٢،٤%ی کۆمەڵگا کە ٥٨ ملیۆنە پێک دێنێت.

**ئیسپانیا** ٦٠٠ هەزار، ساڵی ١٩٩٢ دەوڵەت دانی بە ئایینی ئیسلامدا ناوەو ـیژنەی ئیسلامی نوێنەری رەوەندەکەش هەڵبژێردراوە.

**فنلەندا:** پتر لە ١٠٠ هەزار کەس

**دانیمارک:** ٢٠٠ هەزار واتە ٣% کۆمەڵگا کە ٥.٤ ملیۆن کەسە.

**نەرویج:** ١١٥ هەزار

**سوید:** ٥٠٠ هەزار کەس ،
**سویسرا:** ژمارەی رەوەندی ئیسلامی لە سویسرا ٤٠٠ هەزار دەبێت و دابەش بووە بە سەر ١١٥ رەگەزدا،
**نەمسا:** ٤٠٠ هەزار واتە ٤% ی کۆمەڵگا کە ٨ ملیۆن کەسە.

سەرچاوە: سەرچاوەکانی ئەو خشتەکاریەی سەرەوە زۆرن بەڵام لێرەدا سەرچاوە سەرەکیەکان دەنوسین.

http://www.almethaqalaraby.net/Essam14-7-2005.htm

http://www.2.tatsachen-ueber-deutschland.de/575.0.html

http://www.ikhwanonline.com/Article.asp?ID=11890&LevelID=1&SectionID=309

http://aps.vlaanderen.be/statistiek/nieuws/cultuur/2004-11_islam.htm

http://www.easyterra.nl/autohuur-italie.html

http://www.kuleuven.ac.be/icrs/religies/religies_overzicht.htm#andere

http://www.islammemo.cc/KASHAF/one_news.asp?IDnews=430

http://nl.wikipedia.org/wiki/Islam_in_Nederland

لەهەروڵاتێک لە وڵاتە ئیسلامیەکان، ئایینی ئیسلام شێوەو مۆرکێکی تایبەتی وەرگرتووە بۆ نمونە لە ئێران ئایینی ئیسلام جیاوازە لە تورکیاو پاکستان و لە مەغریبیش جیاوازە لە ئەندونوسیاو کووردستان و ئەفگانستان. بە هەمان شێوەش لە ئەوروپا هەر نەتەوەو گروپێکی ئیسلامی

جیاوازە لەوی دیکە بۆیە زانینی قەبارەی ئەو گروپانە زۆر پێویستە بۆ تێگەشتن لە ڕەوەندی ئیسلامی و ئیسلامی سیاسی..لەم خشتەیەی خوارەوەدا گروپە بێگانەکانی هۆڵاندابە ڕەوەندی ئیسلامیشەوە دەخەینە ڕوو:-

سەرچاوە: سەنتەری گشتی سەرژمێرە لە هۆڵاندا

www.statline.cbs.nl/StatWeb

| | کۆی گشتی | نەوەی یەکەم | نەوەی دووەم |
|---|---|---|---|
| هەموو بێگانە | 3 118 004 | 1 600 062 | 1 517 944 |
| مەغریبی | 315 821 | 168 400 | 147 421 |
| ئەنتالی و ئەروباییەکان | 130 538 | 82 321 | 48 217 |
| سورێنام | 329 430 | 188 367 | 141 063 |
| تورکیا | 358 846 | 195 678 | 163 168 |
| کۆی گشتی ئەوانەی لە ولاتانی ئەورۆپاوە هاتوون | 822 270 | 274 837 | 473 580 |
| کۆی گشتی ڕۆژهەلاتیەکان | 1 695 570 | 1 021 074 | 647 223 |

بەم جۆرە لە خشتەکەدا کۆمەڵێک ڕاستیمان بۆ دەردەکەوێت:
١- زۆر ترین ژمارە ی ڕەوەندی ئیسلامی لە بنەڕەتدا تورکن.
٢- لە پلەی دووەمدا مەغریبیەکان زۆرترین ژمارەی ڕەوەندەکە پێک دێنن.
٣- نەوەی دووەم واتە ئەو ڕەوەندەی کە ئەندامەکانی لە ولاتی باوک لە دایک نەبوون و بە تەواوی لە نێو کۆمەڵگای هۆڵاندیدا پەروەردە بوون (ئەمەش خاڵێکی زۆر گرنگە بۆ ئاوێتە بوون واتە Intgration - اندماج ) بەشێکی زۆر گەورەی ڕەوەندەکە پێک دێنن و ڕێژەشیان نزیکەی٤٦% ی ڕەوەندی ئیسلامی پێک دێنن.
هەروەها لە خشتەکەدا ڕوون دەبێتەوە کە ڕێژەی ٤٦% ی ڕەوەندی ئیسلامی بە ڕەگەز تورکن و ڕێژەی ٣٨% بە ڕەگەز مەغریبین و نەتەوەکانی دیکەش ١٦%ی ڕێژەی ڕەوەندەکە پێک دێنن.

### ئێستای ڕەوەندی ئیسلامی:-

هەروەک لە بەشەکانی ڕابووردوودا ئاماژەمان پێدا، ڕەوەندی ئیسلامی لەم وڵاتەدا بە شێوەیەکی سەرەکی لە تورک و مەغریبی پێک دێن، بەڵام وێرای ئەو دوو گروپە سەرەکیە ژمارەیەکی زۆری نەتەوە موسڵمانەکانی دیکە (لەوانەش کوورد) لەسەر ئەم ڕەوەندە حساب کراون..

ساڵی ٢٠٠٦ ڕەوەندی ئیسلامی لە هۆڵاندا خۆی لە نزیکەی ١ ملیۆن کەس دەدات، ئەم ڕەوەندە لە جەژنەکان و بۆنەکانی وەک ڕەمەزاندا لە لایەن سەرۆک وەزیرانەوە جەژنە پیرۆزەیان لێ دەکرێت.

ئەم ڕەوەندە هەروەک گۆڤارێکی هۆڵاندی بە ناوی (ها پەی. د تاید) ئاماژەی پێداوە ، سەرەتا لە نێو دوکان و چێشتخانەکانی ڕەوەندی خۆیاندا نوێژی بە کۆمەڵیان دەکرد بەڵام وردە وردە یەکەم مزگەوت و یەکەم قوتابخانەو یەکەم کۆمەڵەو هتد.. کرانەوە،ئێستا لە هۆڵاندا بە هێندی ژمارەی نەتەوەکان و هەمەڕەنگی ڕەوەندەکەیان دامەزراوەی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئاییني پێکهاتوون ئێستا ئەم ڕەوەندە بەم جۆرە خۆی ڕێک خستوە:

دامەزراوەکانی ڕەوەندی ئیسلامی

| ناوی دامەزراو | ژمارە | تێبینی |
| --- | --- | --- |
| مزگەوت | ٤٧٢ | ساڵی ٢٠٠٠ تەنها ٣٠٤ مزگەوت هەبوو، ساڵی ٢٠٠٣ بوون بە ٤٥٣ پاشان ساڵی ٢٠٠٥ بوون بە ٤٧٠ و ساڵی ٢٠٠٦ بوون بە ٤٧٢ |
| ڕێکخـــــراوە ئیسلامیەکان | ٦١٦ | ئەمە ژمارەی ساڵی( ٢٠٠٤ ) لەم ژمارەیە ٣٥٦ دانـە ڕێکخراوی تورکی و ١٧١ دانەش مەغریبی. |
| قوتابخانەکان | ٤٧ | ساڵی ١٩٨٨ یەکەم دوو قوتابخانەی سەرەتایی دروست کران، پاشان ساڵی ٢٠٠٣ ژمارەی قوتابخانەکان بوون بە ٣٧، ساڵی ٢٠٠٤ بە ٤٢ و ساڵی ٢٠٠٦ بە ٤٧ قوتابخانەی ئیسلامی کە دوانیان خوێندنی ناوەندی تیادا بـەڕێوە دەبرێت. |
| خوێندنی باڵا | ٣ | ساڵی ١٩٨٨ یەکەم پەیمانگای ئیسلامی لە شاری لایدن کرایەوە، ساڵی ١٩٩٧ یەکەم زانکۆی ئیسلامی لە شاری رۆتـەردام کرایـەوە، ساڵی ٢٠٠٥یش سەنتەری تیۆلۆجی ئیسلامی لە زانکۆی ئازادی ئەمستەردام کرایـەوە، لـە سێپتەمبەری ٢٠٠٦دا خوێندنی بەکەلۆریای شەریعەت لە ئەمستەردام دەست پێ دەکات. |
| کۆمپانیاکان | ١١.٩٤٧ | ساڵی ١٩٩٨ ژمارەی کۆمپانیا تورکی و مەغریبیەکان ٧.٧٤١ کۆمپانیا بوون، ئەم ژمارەیە ساڵی ٢٠٠٠ بوو بە ١٠.٣٦١ ، سـاڵی ٢٠٠٤ ژمـارەی کۆمپانیاکـان بـوون بـە ١٦.٩٨٠ لەم ژمارەیە ٥.٠٣٣ مەغریبی و ١١.٩٤٧ تورکی. |
| بانکــــــــە ئیسلامیەکان | ٨ | ساڵی ٢٠٠٥ ژمارەی بانکە تورکیەکان لـە هۆڵاندا ٨ بـوون، سـاڵی ٢٠٠٦ لقـی بـانکی ئیـسلامی و بـانکی بەحرەین دەکرێنەوە. |

ئـەم نـەخـشەیـە لـە چـەنـدین سـەرچـاوە کـۆکراوەتـەوە کـە گرنگترینیـان ئـەمانـەن:

HP De Tijd 3 feb2006

http://nl.wikipedia.org/wiki/Islamitische_organisaties

Vrij Nederland 18-dec-2004

گەورەترین ڕەوەندی ئیسلامی لە تورکەکان پێک دێت، حکومەتی تورکیا بە هـۆی ترسـی گـەورەی خـۆی لـە ڕەوتـە ئیـسلامیەکـان زۆر بـە تونـدی ڕەوشـی

ڕەوەندە ئیسلامییەکەی خۆی گرتۆتە ژێر چاو وەزارەتی(دیانەت )ی تورکیا ڕاستەو خۆ لە دەرەوەی وڵات ئەم کارە سەرپەرشتی دەکات، بەڵام هەڵبەتە تێکڕای ڕەوەندەکە لە ژێر دەستی حکومەتی تورکیادا نیە .

حکومەتی تورکیا بۆ پێکانی ئامانجەکانی خۆی بە تایبەت ئامانجە شۆڤێنیستەکانی لە دژی میللەتی کووردمان لە باکور مزگەوتەکان دەکاتە باشترین ئامراز بۆ ئەم کارە وێرای ئەوەش لە ڕێگای ڕێکخراوی مافیایی و چەتەیی ( گورگە بۆرەکان ) درێژە بە جینۆسایدی کلتورو فەرهەنگی کووردو ئەرمەنی دەدەن، ئەم ڕێکخراوە تورکە ناسیۆنالیستە کە لە فیدراسیۆنی تورکەکانی هۆڵاندا ( TFN ) خۆیان ڕیکخستووە هەتا ئێستا چالاکیەکانیان لە هۆڵاندا کۆتایی پێ نەهاتووە.

ڕێکخراوی TICF کە ڕێکخراوێکی کلتوری ئیسلامی تورکیە و شان بەشانی ئەمیش دامەزراوەی ئیسلامی هۆڵاندا ISN پێکەوە باڵیان بەسەر مزگەوتەکانی ڕەوەندی تورکدا کێشاوە.

هەردوو ڕێکخراو لە ژێردەستی حکومەتی تورکیادایەو ١٣٠ مزگەوت بەڕێوە دەبەن، تەواوی ئیمامە تورکەکان ڕاستەو خۆ لە لایەن حکومەتی تورکیاوە دادەنرێن ڕێکخراوی Milli Görüs میللی گوروش ( دیدگای نەتەوەیی ) کە ڕێکخراوێکی ئیسلامی توند ڕەوی تورکیایە لە دەرەوەی چوارچێوەی حکومەتدا کاری خۆی دەکات ٤٠ مزگەوت بەڕێوە دەبات.

ڕۆژنامەو میدیاکانی هۆڵاندا ناو بەناو باس لە هەندێک کاری توندڕەوی و نایاسایی دەکەن کە لەم مزگەوتانەوە بەڕێوە دەبرێت.

بزوتنەوەی سلیمانلی Süleymanli کە زیاتر خۆی بە فێرکردنی قورئان و ئیسلام گەرابیەوە سەرقاڵ کردووە ٣٥ مزگەوت بە ڕێوە دەبات.

عەلەویەکان کە ڕێژەیان ٢٥% ی تورکەکان دەبێت خۆیان زۆر لەم دەستەو گروپانەبەدوور -گرتووەو هاتوچۆی مزگەوتی ئەوان ناکەن و خۆشیان مزگەوتیان نیە ، بەڵام چەندین شوێنی تایبەتی خۆیان هەیە کە پێ ی دەڵێن ماڵی خوا، لەوێدا کاروباری ئایینی خۆیان دەکەن.

مەغریبیەکان بەشی دووەمی ڕەوەندی ئیسلامی پێک دێنن، دابەش کردن و پۆلێن کردنی مزگەوتەکانی ئەمان لە هۆڵاندا وەک پۆلێن کردن و دیاری کردنی ڕێبازە ئیسلامیەکان ئاڵۆزە، ئەمانە بە سەلەفی و جیهادی و ئیخوانی و تەکفیری و باڵەکانی دیکەشیانەوە ١٤٣ مزگەوتیان گرتووە.

مزگەوتە مەغریبیەکان لە لایەن فدراسیۆنی مەغریبیە موسڵمانەکانەوە بەڕێوە دەبرێن و ئیمامی مزگەوتەکانیشیان پێکەوە ڕێکخراوێکیان بە ناوی ڕێکخراوی ئیمامەکان دروستکردووە.

هەروەها ٣٧ مزگەوتی دیکەش هەنە تایبەتن بە سورینامییەکان ، ئەمانیش دیسان لە نێوان تایفە ئایینیەکانی سونەو شیعەو ئەحمەدی دابەش بوون.

وێرای ئەو دابەشکردنەی سەرەوە لە تەواوی هۆڵاندا و لە زۆربەی شارەکاندا چەندین مزگەوتی دیکەی تایبەت بە نەتەوەکانی دیکەی وەک پاکستانی، سۆمالی، سودانی،ئەفگانی،مۆلۆکی، میسری، ئەندونوسی، تونسی، بۆسنی، جەزائیری.. هتد تەنانەت کووردیش خۆی لەم پێشبڕکێ یە بێ بەری نەکردبوو لە شاری ئارنهێم کە ژمارەیەکی زۆری کوورد دەژین مزگەوتێکی خۆی هەبوو، بەڵام لەبەر هەندێک کێشە ساڵی ٢٠٠٣ ئەو مزگەوتە بۆ ماوەیەکی دیاری کراو داخرا.

دابەش بوونی مزگەوتەکانیش بەسەر شارەکاندا وەک یەک نیە، لەو شوێنانەی کە زۆرترین ڕێژەی

ڕەوەندی ئیسلامی تیادا کۆبۆتەوە زۆرترین ژمارەی مزگەوتی تیایە، لێرەدازۆربوونی ژمارەی مزگەوتەکان لە یەک شاردا ئاماژەیە بۆ هەمەڕەنگی و جۆراوجۆری ڕەنگەکانی ئیسلام و ئیسلامی سیاسی لەو شارەدا.

ئەو نەخشەیەی خوارەوەش ژمارەو دابەش بوونی مزگەوتەکان لە نێو هۆڵانددا دەخاتە ڕووسەرچاوە: گۆڤاری ( Vrij Nederland ) بەرواری ١٨-١٢-٢٠٠٤ لاپەڕە ٥٢

هەر وەک لە نەخشەکەدا بەدیار دەکەوێت ئەمستەردام زۆرترین ژمارەی مزگەوتی تیادایە (٥١) پاشان دەنهاخ (٣٤) مزگەوت و ڕۆتەردام (٤١)

مزگەوت.
سەبارەت بە قوتابخانە ئیسلامیەکانیش هەمان شێوە دابەش کردن هەیە بەلام بەو جۆرە زەقیە نیە کە لە مزگەوتەکاندا بەدی دەکرێن، زۆر جار رووەدات قوتابخانەیەکی ئیسلامی بە تورک ناسراوە یان بە مەغریبی ناسراوە بەلام ئەمە مانای ئەوە نییە کە ئیتر هیچ کام لە ئەندامانی نەتەوەکانی دیکە لەو قوتابخانەیە ناخوێنێت.
ئەوەی لە خشتەکەدا بەر چاو دەکەوێت ئەوەیە کە رەوەندی ئیسلامی کۆمەڵگایەکی بۆ خۆی لە نێو کۆمەڵگای هۆڵاندا دروست کردوە، کار تەنها بە مزگەوت و قوتابخانەو کۆمەڵە ئاینی و سیاسیەکانەوە ناوەستێت بەڵکو ئەم رەوەندە لە هەندێک بواردا دەگەرێتەوە بۆ ناو وردەکاریەکانی کۆمەڵگای لێوە هاتووی خۆی بەشێوەیەک کە هەندێک جار ئەم خۆبەستنەوە زیاد لە پێویستەی ئەو رەوەندە دەبێتە مایەی بێزاری خەڵکی هۆڵانداو تەنانەت هەنێک جاریش دەبێتە ئاکامی ململانێ لەگەڵ یاساو رێساو بەهاکانی خودی کۆمەڵگای هۆڵەندی خانەخوێ! بەم جۆرە جگە لە دەیان چێشتخانەو دوکان و سوپەرمارکت و قەسابخانەی گۆشتی حەلال و فرۆشگای بیرەی ئیسلامی ( بێ کحول ) هتد تا کار دەگاتە خەستەخانەی جیاواز و مەلەوانگەی جیاواز و خانەی پەککەوتوان و چارەسەری دەرونی بە نوشتەو قورئان .
خەتەنەکردن گرفتێکی دیکەی یاسایی دێنێتە ئاراوە، لە کاتێکدا کە خەتەنەی مندالی نێر هەتا سالی ٢٠٠٥ لە لایەن کۆمپانیاکانی دلنیایی (تأمین) پارەکەی دەدرا بەلام لەبەر ئەوەی زۆربەی هەرە زۆر ئەو خەتەنە کردنانە لە بەر هۆکاری ئاینی بوون ئیتر کۆمپانیاکانی دلنیایی ئامادەنەبوون سالانە ٤ ملیۆن یۆرۆ هەروا لە گیرفانی خۆیان بدەن. خەتەنە کردنی کچان کێشەیەکی دیکەی یاسایی یە لە هۆلاندا، سالی ١٩٩٣ حکومەتی هۆلاندا بە فەرمی خەتەنەی کچانی قەدەغە کرد بەلام بەشێک لە رەوەندی ئیسلامی تا ئێستا ئەوە بە مافێکی ئاینی و کەلتوری خۆی دەزانێت کە ئەم حکومەتە رێگای ئەو کارەی پێ بدات.
هەر بە پارەی حکومەتی هۆلانداو سەر پەرشتی لایەنە پەیوەندارەکانی ولات، رەوەندی ئیسلامی بە زمانی تورکی و مەغریبی و سورێنامی رادێو و تەلەفزیۆنی ئیسلامیشیان بۆ دانراوەو چەندین رۆژنامەو گۆڤاریش بە چاپ دەگەیەنن.

ئەوەی جێگای سەرنج دانە ئەوەیە لە تەواوی شارە گەورەکاندا هەندێک جێگای تایبەت لە شێوازی کتێبخانەی ئیسلامیدا دانراون بەڵام لە ڕاستیدا ئەگەر بە ووردی سەرنجی بدەیت زۆر خێرا بۆت ڕوون دەبێتەوە کە ئەو کتێبخانەیە خاوەنەکەی یاخود لایەنی بەرپرس لێ ی سەر بە کامە باڵی ئیسلامی سیاسیە یاخود سەر بە کامە گروپی ئەتنی ڕەوەندی ئیسلامیە، لەم کتێبخانانەدا نەک تەنها بەرماڵ و قورئان و کاسێت و جلی موجاهدین و تەزبیح و پێداوستیە ڕۆحیەکانی دیکە دەفرۆشرێن بەڵکو نوسراوەکانی (ئەیمەن زەواهری و بن لادن و سەیدقوتب ) یش دەست دەکەون، ئێستا ئیتر موجاهدەکانی عێراق شوێنی موجاهدەکانی ئەفگانستانیان گرتۆتەوەو سی دی و دی ڤی دی و کاسێتی دەنگ و ڤیدێوی چالاکیەکانیان بەرچاو دەکەون و شێوازی جیهادی براکانیشیان لە عێراق و سەربرینی مورتەدو کافرەکانیش بە دەست دەکەون. لە زۆربەی ئەم کتێبخانانەدا سندوقی پارە بەخشین دانراوەو لێ -ی نوسراوە ( لە ڕێ ی خوا – فی سبیل اللە ) بە لام هەرگیز نەزانراوە کە ئەم پارەیە بۆ کام لە ڕێبازەکانی خواو کام شێوەی جیهاد تەرخان دەکرێت.

بە هەمان شێوە لە مزگەوت و دوکانەکانیش سندوقی پارە کۆکردنەوە دانراوە و داوای خێرو پارەبەخشین دەکرێت. هەروەها زۆر جار لەبەردەم دەرگای چوونە ژوورەوەی بازاڕە ڕۆژهەڵاتیەکاندا بەهەمان شێوە ڕێکەوتی کەسانێک دەکرێت کە تورەکەیان گرتۆتەوەو داوای پارە بۆ مزگەوت دەکەن.

لە رووی سیاسیشەوە لە کۆی ١٥٠ ئەندام پارلەمان هەشت ئەندامانی (بێگانەی بە ئایین موسڵمان ) هەیە، بەڵام دیارە ئەم ئەندامانە نوێنەرەی ڕەوەندی ئیسلامی نین و لە نێو حزبە هۆڵاندیەکانەوە( پارتە سوشیالیست و لبراڵ و چەپەکان ) کاندید بوون و ئەگەر خۆشیان بە نوێنەری بێگانە بزانن ئەوا تەنها نوێنەری گروپە ئەتنیەکەی خۆیانن.

لە نێو هەندێک لە شارەکانیشدا بەهەمان شێوە ئەندامانی ڕەوەندی ئیسلامی ئامادەن کە بە پێ -ی هەندێک سەرچاوە ژمارەیان ٥٠ دەبێت لەوانە ( ئەبو تالب ) کە جێگری سەرۆکی شارەوانی ئەمستەردامە و لە لایەن ئیسلامی سیاسیەوە هەڕەشەی کوشتنی کراوە.

لە زۆربەی پایتەختە گەورەکان و شارە گەورەکانی ئەورووپادا ناوەندی زۆر گەورە هەنە کە تەنها لە لایەن ڕەوەندی ئیسلامیەوە بەڕێوە دەبرێن. لە پاریسی دڵی ئەورووپا کاتێک بە نێو جادەو گۆڕەپانی کۆبونەوەی ڕەوەندی ئیسلامیدا تێ دەپەڕیت سەدان جۆر لەم دوکان و بازارگایانەت دێتە بەر

چاو، ئەو دەمەی مرۆڤ لەوشوێنانەوە گوزەردەکات هەرگیز هەست بەوە ناکات لە ئەوروپا دەژی بەڵکو بە پێچەوانەوە هەست دەکات کە لە مەغرب یان جەزائیردا پیاسە دەکات

ڕۆژانی هەینیش لەبەر ئاپۆرەی موسڵمانان بۆ نوێژی هەینی لە هەندێک شوێندا پۆلیس ناچار دەبێت شەقامەکە دابخات.

گازینۆی تایبەت بە کۆبونەوەی ڕەوەندی ئیسلامی یەکێکی دیکەیە لە ڕوخسارەکانی ئەم ڕەوەندە ، ڕێستۆرانتی تایبەت و گازینۆو چاخانەی تایبەتیش ڕۆڵی خۆی هەیە لە کۆکردنەوەی ئەندامانی ڕەوەندەکەو ئاماژە دان بە ئینتیمای نەتەوەیی ئەو گروپە. لە نێو ئەو چاخانەو ڕێستۆرانتانەدا هیچ شتێک ئاماژە بە هۆڵاندا نادات، هەموو دیاردەو نیشانەکان بەرەو وڵاتی باوک دەڕۆنەوە بۆ نمونە ئاڵای تورکیا ئاماژەی ئەوەیە کە گروپی نێو ئەو گازینۆیە تورکن بەهەمان شێوەش ئەگەر ئاڵای وڵاتانی دیکە هەبوو ئەوا هەمان گوزارش هەیە بۆ ئەو وڵاتە.

### کۆمەڵگا داخراوەکان:-

بڕوا ناکەم هیچ ڕەوەندێک هێندەی ڕەوەندی ئیسلامی لە نێو کۆمەڵگای هۆڵاندا پەیوەست بێت بە کلتورو ئایینی خۆیەوە بە شێوەیەک دیوارێکی ئەستوری لە نێوان خۆی و ئەو وڵاتەدا دروست کردبێت کە ڕوخان و لابردنی زۆر ئاستەم بێت. ژمارەی قوتابخانەو مزگەوتی ئیسلامی تا بێت زیاد دەکەن ئەمەش بۆ خۆی باشترین بەڵگەی ئەو دوورە پەرێزییەیە یاخود ئەو خۆپارێزیەی کۆمەڵگای ئیسلامییە بەرامبەر هەرشتێکی ئەم وڵاتە کە ئەو بە نامۆی دەزانێت بە خۆی.

هەتا ڕەوتی ئیسلامی و پاشان ڕەوەندی ئیسلامی خۆی لە هەڵوێستی لاوازو بەرگریدا بزانێت بەرامبەر فەرهەنگی ( اباحی ) ڕۆژئاوا، دوور کەوتنەوەو تێکەڵاو نەبوونی ئەو ڕەوەندە لە نێو ئەو کۆمەڵگایانەدا زیاتر دەبێت. دیاردەی دەفری سەتەلایت باشترین نیشانەیە بۆ هەرکەسێکی ئەوروپی کە بزانێت ماڵەکەی تەنیشتی یان بەرامبەری بێگانەیە بەواتایەکی دیکە (ئیسلامە) چونکە ڕیژەی هەرە زۆری پەنابەران لە وڵاتی ئیسلامیەوە هاتونەتە ئەوروپا، گەشتێکی خێرا بە شارە گەورەکانی هۆڵاندا ئەو ڕاستیە دەخاتە بەر چاو کە هەر زوو سیاسەت مەداری کوژراو ( Pim Fortuyn ) لە

لێدوانەکانیدا ئاماژەی پێ دەدا، ئەو ڕاستیەی کە پێ ی دەگوترێت گەڕەکی (ئەستەمبوڵ) لە ئەمستەردام یان گەڕەکی مەغریبی یەکان لە لاهای..هتد، ئەم دیاردەیە کە بە دیاردەی ( گیتۆ - Getto's ) ناسراوە نەک تەنها لە تەواوی شارەکانی هۆڵاندا بەڵکو لە تەواوی ئەوروپادا بڵاوە، لەم گیتۆیانەدا کە هەژاری و دابڕانی ڕەوەندی ئیسلامی زۆر بە ئاشکرا بە دی دەکرێت، ئەندامانی ڕەوەندەکە نەک تەنها بەرامبەر بە هۆڵاندا( ئەوروپا) داخراون بەڵکو ئەگەر لە نزیکەوە لە نێو خۆی ئەو گیتۆیانە ووردبینەوە داخراوی ئەم کۆمەڵگایانەش زیاتر بەدی دەکەین تا کار دەگاتە ئەوەی کە لە نێو خودی ئایین و تایفەکانیشدا گیتۆکان دابەش بکرێن.

بۆ دیاری کردنی ئاستی دابڕان و داخراوی کۆمەڵگای ئیسلامی لە هۆڵاندا لایەنە بەرپرسەکان هەشت دیاردە دەکەنە پێوەر بۆ دیاری کردنی ئاستی داخراوی ئەو کۆمەڵگایانە لەوانەش:

( ژمارەو قەبارەی گیتۆکە، ئاستی کۆبوونەوەی عەشایەرەکان و خزمەکان لە یەک گەڕەکدا، ئاستی بڵاوبونەوەی چەندژنە کە بە یاسا قەدەغە کراوە، ژمارەی مزگەوتەکان و زیاد بوونی ، ژمارەی کۆمەڵـە ئیسلامیەکان، لەبەرکردن و پۆشینی جلی تایبەت بە تایفەو نەتەوەو ئایین بە شێوەیەکی هەمیشەیی، بڵاو بونەوەی نوسراوی دژ بە سامی و نوسینی دیوارەکان بە سلۆگانی دژ بە ئەوروپاو هۆڵاندا، بڵاوبونەوەی خانەی نەوجەوانان و قوتابخانەو کلوپە ئیسلامیەکان).

لەم شوێنانەدا کلتوری هۆڵاندی نەک هەر بوونی نیە بەڵکو بزر بووە، دانیشتوانەکەشی کە بە پێ ی لێدوانی W.Bos ی سەرۆکی فراکسیۆنی پارتی کرێکاران ڕێژەی ٩٩% یان هۆڵاندین بە ڕادەیەکی زۆر کەم زمان دەزانن بە ڕادەیەکی زۆر کەمتریش بەشداری چالاکیەکانی کۆمەڵگای هۆڵاندی دەبن. لەم گەڕەکانەدا هاوشێوەی وڵاتی باوک گروپ گروپ کوڕان لە سوچی کۆڵانەکاندا کۆبونەتەوەو زوربەی ئافرەتانیش موحەجەبەن و لە نێو ماڵدا کاری ماڵداری دەکەن، پیاوانیش بە جلی وڵاتی خۆیانەوە هاتووچۆدەکەن و کاتی نوێژکردنیش گروپ گروپ بە تەزبیح و کڵاوی سپی یەوە بەزمانی گوندەکانی خۆیان بۆ یەکتر دەدوێن، ئەمانە کە زۆربەی زۆریان پارەی شارەوانی ( سۆشیال ) یان هەیە وزۆربەی سەرچاوەی ئەو پارەیەش بە چەمکی ئەوان حەرامە ،دوودڵ نین لە باسی حەرام و حەڵال و قیامەت.

خەتەنەسوران:-

بەر لەوەی دراوسێ مەغریبیەکەم داوەتم کات بۆ ئاهەنگی خەتەنەسورانی کۆرپەکەی تەنها لەدوورەوە کۆمەڵگای مەغریبیەکانم دەبینی، هەڵبەتە ئەگەر سەردانی مزگەوت و دوکان و گازینۆکانیان بکەیت ئەوا بە هەندێک لەم کلتورە ئاشنا دەبیت بەڵام هەرگیز وەک ئەوە نیە سەردانیان کەیت و لە بۆنەو ئاهەنگەکانیان ووردبیتەوە.
ڕەنگە شانازی کردن بە کلتورو نەریتەکانی کۆمەڵگاو هەوڵ دان بۆ زیندوو ڕاگرتنی بۆ زۆر کەس کارێکی ئاسایی بێت بەتایبەت لە نێو جوگرافیاو سنوری وڵاتی باوکدا بەڵام خۆبەستنەوەی تەواو بە کلتورو خوو نەریتی وڵاتی لێوەهاتوو ئامازەیەکی دیکە دەبەخشێت.
لە سەردانمدا بۆ دراوسێ مەغریبیەکەم و بەشداری کردن لە ئاهەنگی (ئایینی) خەتەنە سورانەکەیدا هەندێ جار گومانی ئەوەم لا پەیدادەبوو کە بەڕاست من لە هۆڵاندام یاخود ئەمە خەونێکەو بۆ مەغریبی هێناوم؟
زۆربەی هەرە زۆری بەشدار بووان بە جلی (ترادسیونالی – تقلیدی) مەغریبیەوە هاتبوون، چای مەغریبی، شەوچەرەی مەغریبی، قۆری، پیاڵە، کورسی، فەرش، گڵۆپ..هتد تەنانەت جۆری دانیشتنەکەشیان هەمووی بەتەواوی مەغریبی و ئیسلامی پێوە دیار بوو.. خزمایەتی و ئینتیما بۆ یەک عەشرەت و یەک گوندو یەک ناوچە زۆر بە باشی هەستی پێ دەکرا...
لە نێو ئاپۆرەی ئامادەبووان و زۆر گوتنی هەندێکیان پرسیارم لە جۆری(چا)کە کرد بەڵام ئەوەی تەنیشتم بە سەرسوڕمانەوە بەر لەوەی وەڵامم باتەوە پرسیارێکی ئاڕاستە کردم :
- مەگەر تۆ مەغریبی نیت؟
- نەخێر خەڵکی کوردستانم، کوردستانی عێراق.
ووشەی کووردستانەکە زۆریانی بە ئاگا هێناو هەروەک ئەوەی کووردستان ئەستێرەیەک بێت لەسەر مەریخ و منیش بە سەردان بۆ سەر زەوی هاتبێتم، یەکسەر ژمارەیەکی زۆریان ڕووی پرسیاریان لە من کردو هەمان ئەو گفت و گۆو لێکدانەوانەی لەسەر تەلەفزیۆنی ئەلجەزیرە باس دەکرێت دوپات بوونەوە و پرسیاریان دەکرد:

- بۆچی کوورد هاوپەیمانی ئەمەریکایە؟ مەگەر کوورد موسلمان نییە؟ ئەی بۆچی بەرهەڵستی ئەمەریکا ناکەن و ئەچن لە شەڕی فەلووجەدا هاوکاری ئەمەریکا دەکەن..

لە نێو وەلام و گفتوگۆکاندا چەندین زاراوەی وەک ئومەی عەرەبی و عروبەت و ئیسلام وموقاوەمەو موئامەرەکانی زایۆنیزم دووپات دەبوونەوە..

لە نزیک منەوە مەلایەکی کڵاو سپی ڕیش دانیشتبوو، لە سەرەتای وتەکانەوە گوێ ی شل کردبوو بۆمان بەلام پێم وابێت قسەکانی منی بە دڵ نەبوو بۆیە وتەکانی بڕیم و بە دەنگی بەرز گوتی( اعوذ و باللە من الشیطان الرجیم ) و پاشان دەستی بە قورئان خوێندن کرد...

مامۆستا پاش تەواو کردنی ووتەکانی بۆماوەی ٤٥ خولەکی تەواو بە چەپ وڕاستدا کەوتە خوێندنەوەی ئایەت و فەرمودەکانی پێغەمبەر و باسکردنی حەرام و حەڵاڵ.

پاش خواردن و چایی خواردنەوە مامۆستا بە چەندین ووتەی دیکەی ئایینی خەتەنەکەی پەسەند کردو کۆتایی بە دانیشتنەکە هێناو پاشان منیش لە سەفەرە کورتەکەم بۆ مەغرب گەڕامەوە.

ئەوەی لەم دوو کاژێرەدا فێری بووم و دڵنیابووم لێ ی چەند خاڵێک بوو کە زۆر بە زەقی ئاماژە بۆ داخراوی کۆمەڵگای موسڵمانی هۆڵاندا (بە تایبەت مەغریبی ) دەکات:

١- لەتەواوی دانشتنەکەدا ئەو کەسانەی پرسیاریان لە من دەکرد و لە گفتوگۆکاندا بەشدار دەبوون ڕقێکی زۆر توندیان لە ئەمەریکاو ئیسرائیل و ئەوروپا بوو.

٢- لە گفتوگۆکاندا ئەو بابەتەی تایبەت بوایە بە دۆزی عێراق و فەلەستین باسی عروبە و ئیسلام هەمیشە پێکەوە دەکرا، کە منیش باسی ئەوەم دەکرد کووردیش میللەتە وەک تەواوی میللەتانی دنیاو مافی خۆیەتی لە عێراق جیابێتەوە و دەوڵەتی خۆی هەبێت دەیان گوت هەموو موسڵمانین بۆ خۆتان جیا دەکەنەوە..

٣- نە مامۆستای ئایینی و نە ئامادە بووان هەرگیز باسی ئەوەیان نەکرد کە ئەوان ئێستا لە ئەوروپادان و بەرامبەر بە ماف و ئەو ڕێزەی لە یاسادا لێیان گیراوە ئەرکیان هەیە.

٤- سێ پرسیاری زۆر خێرام لە لایەن دووان لە ئامادەبووەکانەوە لێ کرا یەکەمیان لێ ی پرسیم ( لە خوا بەزیاد بێت موسڵمانیت؟ گوتم بەڵێ گوتی سونەشی دیسان گوتم بەڵێ لە وەلامدا گوتی الحمدللە ) دووەمیان لێ ی

پرسیم ( خێزانەکەت موسڵمانە ؟ گوتم بەڵێ ئەویش دیسان گوتی لەخوا بەزیاد بێت) هەر سێ وەڵامەکە بە دڵی پرسیار کەرەکان بوون بۆیە یەکێکیان بە حەماسێکی زۆرەوە پێ ی گوتم:

- ئەی برام ئێوە خاوەنی (صلاح الدین)ی ئەیوبین خۆزگەم صەلاحەدینێکتان تیادا هەڵکەوتایەتەوە. منیش لە وەڵامدا گوتم

- برام ئەو دەمەی (صلاح الدین) مان بەرهەم هێنا سەردەمی بەرهەم هێنانی پاڵەوانە ئاینیەکان بوو، بە داخەوە پێت ئەڵێم ئەگەر میللەتی ئێمە ئەم جارە پاڵەوان بەرهەم بێنێت ئەوا پاڵەوانێک بەرهەم دێنێت کە دەوڵەتە دزراوەکەی لە برا دینیەکانی وەرگرێتەوە.

**مەولود نامە:-**

ڕێکەوت وای هێنا کە بەشداری لە پرسەی خەزوری یەکێک لە هاورێ خۆشەویستەکانم بکەم کە خۆی لە بنەڕەتدا ئەفگانیە، پرسەکە چەند ڕۆژ بوو تەواو ببوو، بەڵام هاوتای زۆربەی ئەو کەمە نەتەوانەی کە لە هۆڵاندا ڕەوەندی ئیسلامی پێک دێنن خۆبەستنەوەی ڕەوەندی ئەفگانی بە کلتورو تەرادسیۆنی خۆیەوە وای کرد کە بۆ مەولود نامە و خێری قەبری کۆچ کردوو هەموو دۆست و ئەندامانی خێزانی خاوەن پرسە لە یەکێک لە مزگەوتەکانی شار کۆبنەوە، بۆ ئەم مەبەستەش مزگەوتی (فاتح ) لە ئاییندهۆڤن کە مزگەوتی ڕەوەندی تورکە تەرخان کرابوو، ئەم جارەیان هاو شێوەی خەتەنە سورانەکە بۆنەکە بۆنەیەکی خۆش نەبوو وێرای ئەوەش سەفەرەکەم بۆ مەغرب نەبوو، ئەم جارەیان سەفەرە کورتەکەم بۆ مەزارشەریف بوو.

مزگەوتی ناوبراو کە مزگەوتی ڕەوەندی تورکی ئیسلامیە وەک کۆپی یەکێک لەمزگەوتەکانی تورکیا دروست کرابوو، تەواوی نوسراوەکانی ناو مزگەوت بە زمانی تورکی ئاماژەی دەبەخشی،

زۆربەی نوێژ کەرەکان خەڵکی تورکیا بوون، لە ناو کتێبە دانراوەکاندا چاوێکی خێرام بە سەر زۆربەیاندا خشاند تەنها قورئانەکان نەبێت کە بە زمانی بنەڕەتی.عەرەبی بوون تەواوی کتێبەکانی دیکە بە ڕاڤەکانیشەوە هەموو تورکی بوون و بە لاتینی نوسرابوون... ویستم هەوەسی زانین و فزولیەتی خۆم نەشارمەوە بۆیە فرسەتم هێناو چومە تەک کەسێکی ڕیشداری

کڵاو سپی کە پێ دەچوو خزمەتکار یاخود بەڕێوەبەری ئەو مزگەوتە بێت و بە زمانی هۆڵاندی پێم گووت:

- ماشاالله ئەو هەموو کەل و پەلە جوانە چۆن لەم هۆڵاندایە چنگ کەوتوون؟

- بەتورکی لێ ی پرسیم ( تورکی نازانیت؟ )

- نەخێر

ئەوسا بە زمانێکی هۆڵاندی زۆر خراپ وەڵامی دایەوە:

- ئارقەداش ئەمانە هەموو ( دەستی درێژ کرد بۆ کەل و پەلەکانی ناو مزگەوتەکە ) لە تورکیا هێنامان.

بەم جۆرە قسە کەرەکە کە ئیتر نەم دیتەوە و نەم زانی چ کارە بوو لەو مزگەوتە مەبەستی ئەوە بوو کە بڵێت هەموو ئەو کەل و پەلانە لە تورکیاوە بۆ ئەو مزگەوتە هێنراون.

پرسەکەش کە بەردەوام لە نێو خودی مزگەوتەکەدا بەڕێوە دەچوو هاوشێوەی پرسەی وڵاتی باوک ئەفگانستان ئەنجام دەدرا، دوو مەلای ئەفگانی وێرای ئەوەی کە بەردەوام قورئانیان بە ئاوازی دەری دەخوێند، هاوتای وڵاتی خۆیان تەراتیلیان بە فارسی تێکەڵ بە عەرەبی دوو بارە دەکردەوە، لەولاشەوە لە هۆڵێکی دیکەی هەمان مزگەوت شوێنی ئافرەتان بە جیا تەرخان کرابوو بۆ پرسەی ئافرەتان کە جگە لە گریان و نوزەو لاوانەوەیان هیچی دیکە نەدەبینراو نەدەبیسترا،

هەر هەمان شێوەی ئەوێندەرێ پاش سێ سەعات کۆتایی بە قورئان خوێندن هێنراو بە نۆرە هەر کەس سەرەخۆشی خۆی پێشکەش بە خاوەن پرسە کرد کە ئەویش بۆ ناساندنی خۆی کڵاوێکی سپی لەسەر نابوو..

نامەوێت دیسان بنوسم( بەهەمان شێوەی وڵاتی باوک) بۆ ئەوەی خوێنەر بە دووبارە کردنەوەی ووشەی لێک چوو بێزار نەکەم بەڵام لە ڕاستیدا بە شێوەیەکی کۆپی کراوی مەزارشەریف یاخود قەندووز خواردنی مەولود ئامادە کرابوو کە تاڕادەیەکی زۆر وەک خەتەنە سورانەکە پڕبوو لە گۆشت و بەڵام ئەم جارەیان برنجی ئەفگانی کە بە شێوەی ( کابولی – قوبولی )؟ ئامادە کرابوو لەگەڵ ئاپورای میوانانی ئەفگانی وای لە کەسێکی وەک من بێگانە دەکرد کە چاوبگێڕێت نەوەک هەر بە ڕێکەوت حەمید کارزای یان دۆستەم یان عەبدول ڕەحمان زەعیف و عەبدولا عەبدولا ڕێیان لەم مەولود نامەیەی (مەزارهۆڤن! ) کەوتبێت.

## ئیسلامی دیجیتاڵ:

وەزارەتی بەرگری ئەمریکا ساڵی ١٩٦٦ لە نێوخودی وەزارەتەکەی خۆیدا یەکەم تۆڕی ئەلکترۆنی بۆ پەیوەندی کردن دروست کرد، پاشان وورده وورده پەرەی پێ دراو ئێستا لە زۆربەی دنیادا پەیوەندی ئەنتەرنێت و کۆمپیوتەر بڵاو بۆتەوە.

وێرای ئەوەی ووشەی ئەنتەرنێت و ویندۆز و مایکرۆسۆفت لە هیچ ئایەت و دێڕێکی قورئانا نەهاتووە، بەڵام ئیسلامیەکان پاش مشتومڕێکی زۆر لە نێوان حەڵاڵ کردن و حەرام کردنیدا، فتوای حەڵال کردن و بەکار هێنانیان دا.

ئێستا جیهادی ئەنتەرنێت و ئەلکترۆنی زۆر بە بڵاوی تەشەنەی کردووەو بە هەزاران ماڵپەڕی ئیسلامی لەسەر ئەوتۆڕە جیهانیە پەیدابووە.

لە خوێندنەوەی قورئان و گفتوگۆی سیاسی و فەتوادان و کێشەی کۆمەڵایەتی یەوە بگرە تا دەگاتە بانگ دان و کاتی نوێژ و سروودی ئایینی هتد ماڵپەڕی ئیسلامی بەدی دەکرێت.

دیار ترین و بڵاوترین ماڵپەڕی ئیسلامی لەسەر ئەنتەرنێت بریتیە لە ئیسلام ئۆن لاین کە بە باشترین ماڵپەڕی ئیسلامی سەر تۆڕی ئەنتەرنێت دەژمێردرێت، تەنانەت سنوری حەرامەکانیش دەبەزێنێ و ئامازە بە کێشە سێکسی و دەرونیەکانی خوشک و برایانی موسڵمان دەدات.

ئەم ماڵپەڕە کە بە زمانی ئینگلیزیش لاپەڕەکانی چنگ دەکەون مزگەوتێکی دیجیتاڵی تیایە کە لە کاتی نوێژەکاندا دەبێتە مزگەوتێکی ئامادە و بچوک و پێچراوە لە نێو ماڵداو وێرای بانگدان ووتاری هەینیش پێشکەش دەکات و نوێژ کەر لە ڕێگای کۆمپیوتەرەکەی خۆیەوە دەزانێت کە جگە لەخۆی چەند موسڵمانی دیکەش بە شێوازی دیجیتاڵ خەریکی نوێژ کردنە، ئەوەی جێگەی سەرنجە زۆربەی ئەو ماڵپەڕە ئیسلامیانە لەژێر سایەی حکومەتە دیموکرات و لیبراڵەکانی ئەوروپادا بەدی دێن و بە هەمان شێوە بە تەکنەلۆژیای ئەوان بە ڕێوە دەچن چونکە کۆمپانیا پێشکەوتووەکان ئەورووپین.

بە پێ ی پێشبینیەکان بەکار هێنانی ئەنتەرنێت ڕوو لە زیاد بوونە، پێ دەچێت ساڵی ٢٠٠٥ پتر لە ٢٤٥ ملیۆن کەس بەکاری بێنن، لە کۆی تەواوی دانیشتوانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە ٢٦٠ ملیۆن کەس دەبن تەنها ١٧ ملیۆن

کەس ئەنتەرنێت بەکار دێنێت، لەم ژمارەیەش دوو ملیۆن بەشداربووی تورکیا و یەک ملیۆن بەشداربووی ئیسرائیل و چارەکە ملیۆنێک بەشداربووی ئێرانی لێ دەرکەین ئەوە دەردەکەوێت کە بڵاو بوونەوەی ئەنتەرنێت لە جیهانی عەرەبی و ئیسلامیدا زۆر زۆر کەمە و دیاری کراوە، لە کاتێکدا رێژەی ٧٠% ی هۆڵاندیەکان لەماڵەوە هێڵی ئەنتەرنێتیان هەیە و پێ دەچێت لە زۆربەی وڵاتانی ئەوروپادا بە هەمان شێوە رێژەی بەشداربووی ئەنتەرنێت بەرز بێت.

گرفتی هەرە سەرەکی ئەم دیاردەیە لەوەدایە کە تۆرەکانی ئیسلامی سیاسی لە رێگای ئەنتەرنێتەوە زۆربەی پەیوەندیەکانی خۆیان گرێ دەدەن. بە پێ ی ئەو زانیاریانەی کە زیندانەکانی گوانتانامۆ ئاشکرایان کردووە بە فەرمانی د. ئەیمەن ئەلزەواهیری ، کەسی دووەمی رێکخراوی ئەلقاعدە، خولی فێربوونی کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت بۆ هەموو ئەندامانی ئەلقاعدە یەکێکە لەو بابەتانەی کە ئەندامانی پێ پەروەردە دەکرێت، بەم جۆرە ئەمرۆ بە پێچەوانەی جارانەوە ئەو تیرۆریستەی کە کاری خۆ کوژی ئەنجام دەدات یان رێکدەخات نەک ریشی نیە و سمێڵ دەتاشێت و شارەزاشە لە زۆر کارو باری کۆمپیوتەر بەڵکو ئەلکهولیش دەخواتەوەو دەچێتە دیسکۆش تەنها لە پێناوی ئەوەی دوژمن بە هەڵەدا بەرێت.

شەری ئەلکترۆنیش بۆتە بەشێک لە شێوازەکانی بە گژا چونەوەی تیرۆر، بەلام ئەم کارە هێندەئاسان نیە، بەهێندی ئاڵۆزی و دژواری دۆزینەوەی تۆرە تیرۆریستیەکان هێندەش دۆزینەوەو لێدانی تۆرە ئەلکترۆنیەکانی تیرۆریستان ئاڵۆزە.

موجاهیدەکانی ئەنتەرنێت تەواوی چالاکیەکانی خۆیان دەخەنە سەر ئەنتەرنێت و بەم جۆرەش ئەنتەرنێت دەبێتە تاکە بڵند گۆ بۆ ئەوەی ئەو گروپانە بیرو باوەرو چالاکیەکانی خۆیانی لێوە نمایش بکەن، بۆیە تۆرەکانی ئەلقاعدەو هاوپەیمانەکانی وێرای ئەوەی چەندین ماڵپەری رۆژانەی خۆیان دروست دەکەن، چەندین ماڵپەری دیکەش هەنە کە مرۆڤ فێر دەکەن چۆن تەقەمەنی و کاری خۆکوژی و ژهراوی کردن و مادەی کیمیاوی بکوژ بەرهەم بهێنێت و دژی ئەمەریکاو کافرەکان بەکاری بهێنێت.

لە بارودۆخێکی ئاوادا هێرشی ئەلکترۆنی هاوتای هێرشەکانی سەرزەمین لە دژی ئەو گروپانە کارێکی حەتمی دەبێت، رۆژانە هەست دەکەین کە ماڵپەری گروپە توند رەوەکان دەکەوێتە بەر هێرش و لە جیاتی نوسراوی

گروپەکە خۆی وێنەی نەشیاو دەخەنە سەری، بەڵام پاش ڕۆژێکی دیکە دەبینین هەمان ماڵپەڕ لەسەر ئادرەسێکی دیکە پەیدا دەبێتەوە.
ئەوەی تەواوی ئیسلامیەکانی ئەوروپا پەیڕەوی دەکات، ئیسلامی سیاسیش لە هۆڵاندا پەیڕەوی دەکات، ئەوەی دووەم و یەکەمی ڕەوەندی ئیسلامی نەک زمانی عەرەبی باش نازانێت بەڵکو لە خوێندنەوەی قورئانیش شارەزا نیە بۆیە موجاهدەکانی ئەنتەرنێت ئەم کارەیان بۆ ئاسان دەکەن و بە زمانی هۆڵاندی تەواوی بڕگەکانی قورئان چنگ دەکەون و ڕاڤە کردنی ( تەفسیر ) زۆربەی ئیمامەکان و حەدیسەکانیش بە هەمان شێوە لەسەر ماڵپەڕەکان بەدەست دەکەون.
گفتوگۆی سەر ماڵپەڕەکانیش لە نێوان موجاهیدەکاندا زۆرجار هەر بە زمانی هۆڵاندی ئەنجام دەدرێت.

## بەشی سێهەم:-

### ڕەوەندی ئیسلامی و ئاوێتە بوون:-

کرۆکی سەرەکی کێشەی ئیسلام و ئیسلامی سیاسی نەک لە هۆلاندا بەڵکو لە تەواوی ئەوروپا لێرەوە دەست پێ دەکات. ڕەوەندی ئیسلامی نەک ئەم ولاتانە هی خۆی نییە و وەک کۆچ بەرێک ڕووی تێ کردووە بەڵکو کەوتۆتە نێو کلتورو خوو نەریتێکیش کە تەواو پێ ی نامۆیە. بەلام هەر وەک لە بەشەکانی پێشوودا باسمان کرد ئەم ڕەوەندە تازە بۆتە هەڵگری شوناسنامەیەکی ئەوروپی ( بە کلتوور مەسیحی ) بۆیە هەر وەک تەواوی دیاردە کۆمەلایەتیەکان شتێکی ئاساییە کە ئەم ڕەوەندە لە گەڵ دەوروبەری خۆیدا کارلێکردن ( تفاعل ) بکات. بەو پێ یەی کە ئێستا ئەو ڕەوەندە شە ریکە لەم ولاتەدا دەبێت ئەرک و مافی خۆی بزانێت، بەلام ئەم ئەرک و مافانە بە لێکدانەوەی هۆلاندیەکان جۆرێکە و بە لێکدانەوەی ئەوانیش جۆرێکی دیکەیە، بەلام سەرەکی ترین بابەت لە تاوتوێ کردنی ئەم ئەرک و مافانەدا مەسەلەی ئاوێتە بوونە.

## ئاوێته بوون چی یه؟

ئاوێته بوون به واتا کۆمه‌لایه‌تیه‌که‌ی[۹] بریتیه له تێکه‌ڵ بوونی ڕوانگه‌ی جیاوازی دوو گروپ یان چه‌ند گروپێکی جیاوازی کۆمه‌ڵگا به‌مه‌به‌ستی له‌یه‌ک تێگه‌شتن و پێک هێنانی کۆمه‌ڵگایه‌کی هاوتاو که‌م کێشه.

هۆلاندا ئاوێته بوون وه‌ک ئامانجێکی گرنگ سه‌یر ده‌کات چونکه وه‌ک له سه‌ره‌تادا باسمان کرد پێکهاته‌ی ئه‌تنی و کلتوری ئه‌م وڵاته واده‌کات که هه‌موو که‌مینه نه‌ته‌وه‌کان و گروپه ئه‌تنیه‌کان له‌و کۆمه‌ڵگایه‌دا وه‌ک یه‌ک کارلێک بکه‌ن و به‌شدار بن له پرۆسه‌ی سیاسی و کۆمه‌لایه‌تی و ئابوریه‌کان، هه‌ر له به‌ر ئه‌مه‌شه هۆلاندا قورسایی زۆری بۆ ئاوێته بوون داناوه، وێرای ئه‌وه‌ش وه‌زاره‌تێکی بۆ ته‌رخان کردووه.

سیاسه‌تی ئاوێته بوون یاخود ( ئاوێته کردنی کۆمه‌ڵگا) له سه‌ره‌تای هه‌شتاکانه‌وه داڕێژراوه هۆی ئه‌وه‌ش ئه‌وه‌یه که له سه‌ره‌تای هه‌شتاکانه‌وه پێداوستی تێکه‌لاو بوونی ئه‌و هه‌موو گروپه خۆی به‌سه‌ر حکومه‌تی هۆلاندا سه‌پاند، ئامانج له‌م سیاسه‌ته بریتیه له به‌دی هێنانی کۆمه‌ڵگایه‌کی یه‌کسان که تیایدا ته‌وای گروپه جیاوازه‌کان یه‌کسان ده‌بن و هاوتا ده‌بن له ئه‌رک و فه‌رمان و مافه‌کانیاندا.

سیاسه‌تی گشتی ئاوێته بوون داوا له هه‌موو ئه‌وکه‌سانه‌ده‌کات که ئه‌م سیاسه‌ته ده‌یانگرێته‌وه واته هه‌موو تاکه‌کانی نێو کۆمه‌ڵگای هۆلاندا خواستی ئاوێته بونیان هه‌یه و ده‌یانه‌وێت له‌م کۆمه‌ڵگایه‌دا پێگه‌یه‌کیان هه‌بێت، ده‌بێت ئاماده‌بن و هاوکار بن و کاربکه‌ن بۆ به دی هێنانی ده‌رئه‌نجامه‌کانی ئه‌م سیاسه‌ته، به واتایه‌کی دیکه هه‌موو ئه‌و که‌سانه‌ی که هۆلاندی(ناڕه‌سه‌ن) یان بێگانه‌ن، ده‌یانه‌وێت له‌م کۆمه‌ڵگایه بژین و پێگه‌یان دیار بێت پێویسته له سه‌ریان خۆیان ئاوێته‌ی کۆمه‌ڵگای هۆلاندی بکه‌ن، واته له‌گه‌ڵ کۆمه‌ڵگای هۆلاندیدا تێکه‌لاوبن و ئه‌م تێکه‌لاو بوونه‌ش ته‌نها هۆیه بۆ ئه‌وه‌ی که ئه‌و هاولاتیانه ببنه که‌سانێکی به‌نرخ و به سوود.

به‌هه‌مان شێوه ئه‌م سیاسه‌ته داوا له هۆلاندیه‌کانیش ده‌کات که بوارێکی ڕاسته‌قینه و پێگه‌یه‌کی گونجاو بده‌ن به ته‌واوی ئه‌و هاولاتیانه‌ی که ئاماده‌ن له‌م کۆمه‌ڵگایه‌دا ئاوێته بن.

سیاسه‌تی ئاوێته بوون به پێ ی ئه‌وه‌ی له برگه یاسایی یه‌کاندا تۆمار کراوه، هه‌موو پرۆپی هۆلاندی ( ڕه‌سه‌ن و ناڕه‌سه‌ن ) هان ده‌دات ڕێزی بیرکردنه‌وه‌ی یه‌کتربگرن و هه‌ردوو لا ماوه به یه‌کتر بده‌ن که وه‌ک یه‌ک

بەهرەمەندبن لە مافەکانیان و وەک یەکیش بەرپرسیاربن بەرامبەر بە ئەرکەکانیان.
ئەم پێشەکیەی سەرەوە پێ دەچێت زۆر رۆمانسی و ئەرخەوانی بێت چونکە لە بواری پراکتیزە کردنەوە گەورە ترین کێشە رووبە رووی هەردوولا دەبێتەوە، ئاوێتە بوون لە ژیانی رۆژانەدا چەندین بواری ژیان دەگرێتەوە، لە هەریەک لەم بوارانەدا ئاوێتە بوون لایەنی لاوازی هەیەو هەمیشە لایەنە لاوازەکانیش زیاترە لە لایەنە بە هێزەکان ( بێ گومان ئاوێتە بوون لە گروپ و کەمایەتی ئەتنیەوە بۆ یەکێکی دیکە کەم تا زۆر جیاوازە) بەڵام هەردوولا ( هۆڵاندی و بیانی یاخود رەسەن و نارەسەن ) سەریان دەیدات بە دیوارێک لە رێگرو مەرجی قورس کە ئەمەش وادەکات هەر دوولا پەرچە کرداری نەخوازراو بنوێنن بە جۆرێک کە بێگانەکان والێ دەکات
بگەرێنەوە بۆ کلتوری خۆیان و دەست لە تیکەڵاوی لەگەڵ کۆمەڵگای هۆڵاندیدا بشۆن و هۆڵاندیەکانیش وا لێ بکات کە هەمیشە دوور کەونەوە لە کلتورو بنەمایەک کە هی خۆیان نیەو داوابکەن ( هۆڵاندا تەنها بۆ هۆڵاندیەکان بێت ).

## بوارەکانی ئاوێتە بوون:-

ئاوێتە بوون دوو دیوی هەیە دیوی یەکەم ( بونیادی و رووکەشی) ە کە پێ ی دەگوترێت( Stucturele Integratie) ئەم دیوە خوێندن وکارکردن دەگرێتەوە، دیوی دووەم دیوی کۆمەڵایەتی و کلتوریە ( Sociaal& cultuur ) ئەم لایەنەی ئاوێتە بوون زیاتر بە ها کۆمەڵایەتی و کلتوریەکانی کۆمەڵگا دەگرێتەوە. ئەم دوو دیوەی ئاوێتە بوون پەیوەندی زۆر توندو تۆڵیان لەگەڵ یەکتر هەیە، ئاوێتە بوونی کۆمەڵایەتی وکلتوری رۆڵی سەرەکی دەبینێت لە پرۆسەی ئاوێتە بووندا، ئاوێتە بوونی بونیادی (هەیکەلی)ش وەک خەرامانێک هەمیشە پاشکۆی ئەوە.
لێرەدا باسی هەردوو دیوی ئاوێتە بوون دەکەین و تیشکی زیاتر دەخەینە سەر ئاوێتە بوونی رەوەندی ئیسلامی و سەرەتا بە ئاوێتە بوونی بونیادی دەست پێ دەکەین کە خوێندن و کار دەگرێتەوە:-

## كاركردن:

كاركردن بنەمايەكى سەرەكيە بۆ ئاوێتە بوون لەنێو كۆمەڵگاى هۆڵانديدا چونكە هەموو كەسێكى كارگەر ياخود خاوەنكار لە ڕێگاى ئەو خزمەتەى كە دەيگەيەنێت بە شدارى لە بنيات نانى ئەم وڵاتە دەكات. بە پێ ى ياساكانى هۆڵاندا هەموو ئەوكەسانەى لە ڕووى جەستەيى و تەندروستى يەوە تواناى كاريان هەيە دەبێت كار بكەن، بەرامبەر بەمەش پێويستە هەموو تاكێكى هۆڵاندى ( ڕەسەن و ناڕەسەن ) فرسەتى چونيەكيان هەبێت بۆدەستكەوتنى كارى گونجاو.

لە بوارى كاركردندا ئاوێتە بوون چەندين گرفتى گەورەى دێتە پێش كە گرنگترينيان بريتيە لە كێشەى شارەزايى و دبلۆما ( شەهادە ) ئەوەى هەڵوێستى بێگانە لاوازدەكات ئەوەيە كە زۆربەى زۆرى دبلۆماكان بە هەمان بەهاو نرخى دبلۆماى هۆڵاندى هەڵناسەنگێنرێت بۆ يە زۆر جار ڕوودەدات كەسى بێگانە خاوەنى هەر دبلۆمايەكيش بێت زۆر ماندوو دەكرێت تادەتوانێت دبلۆماكەى هاوتاى دبلۆماى هۆڵاندى بكات كە ئەمەش زۆر جار كارێكى قورسە.

تێكەڵاوكردنى هەڵوێستى سياسى و ڕەوشى كۆمەڵايەتى كلتورى بەربەستێكى ديكەيە لەبەردەم دەستكەوتنى كارى گونجاو بۆ كەسى بێگانە.

فێربوونى زمان و ( Inburgering ) تأقلم:-

فێربوونى زمان و خۆگونجان و پرۆگرامى Inburgering بەشێكى ديكەى سياسەتى ئاوێتە بوونە، ئەو بێگانانەى دەمێكە لەم وڵاتەدان وئەوانەى تازە دێن پێويستە لە سەريان ئەم پرۆگرامە بەڕێوە بەرن چونكە فێربوونى زمان نەك هۆيەكە بۆ دەستكەوتنى كارى گونجاو بەڵكو هۆيەكە بۆ تێگەشتن لە بەهاكانى ئەم وڵاتە و ڕێگاى ئاوێتە بوونيش نزيكتر دەكاتەوە.

## کلتور:-

باسکردنی کلتورو شی کردنەوەی، ئاڵۆزترین بابەتە لە لێکدانەوەی ئاوێتە بووندا چونکە هەروەک لە سەرەتادا باسمان کرد ئاوێتە بوونی کلتوری و کۆمەڵایەتی کرۆکی باسەکەیە.
کلتور بۆ خۆی دەتوانێت گەورە ترین ڕۆڵی ئاوێتە بوون بگێڕێت لە هەمان کاتیشدا دەتوانێت خراپترین ڕۆڵی هەبێت دژی ئاوێتە بوون.
هەتا کلتورەکان لەیەک دووربن ئاوێتە بوونی پێکهاتە کۆمەڵایەتیەکان ئاڵۆزتردەبێت، بەر لەوەی بچینە سەر باسی ووردەکاریەکانی بنەما کلتوریەکانی ڕەوەندی ئیسلامی، پێویستە چەردەیەکی کەم لەسەر کلتور بدوێین.
ووشەی کلتور بە تەنها واتای دروستکردن دەگەیەنێت، لە بنەڕەتی زمانی ئینگلیزی و فەرەنسیدا بۆ کشتوکاڵ( agriculture ) بەڵام بە واتای ژێربێژی و لێکدانەوەی وشەکە ئەفراندن و بنیات نان و دروستکردن دەگەیەنێت. بەم جۆرە هەر شتێک لە لایەن مرۆڤەوە دەستی ئەفراندن و گۆڕان و دروستکردنی پێ بگات بە بنەمایەکی کلتوری ناوزەد دەکرێت، بە پێچەوانەشەوە تەواوی ئەو شتانەی بەدوورن لە دەستکاری مرۆڤ، یاخود دەستی مرۆڤی پێ نەگەشتووە بە سادە ( Simple - primitive ) ناوزەد کراوە.
ئەنترۆپۆلۆجی فەرەنسی بەناوبانگ Lévi - Strauss بۆ شرۆڤە کردنی ئەم چەمکە زۆر بە جوانی و سادەیی لە دوو توێ ی کتێبێکدا بە ناوی ( کاڵ و برژاو ) کلتورو ناکلتور لە یەک جیادەکاتەوە، بەم جۆرە ئەو سەلکە پەتاتەیەی لە زەویدایە تەنها ئەو دەمەی دەکوڵێت و دەستی مرۆڤ تام ولەزەتی پێ دەدات دەبێتە کلتور، کەواتە سنوری جیاکردنەوەی کلتور لە ( Natur ) تەنها دەستی مرۆڤە. دەستەکان و شێوەی دەستکاری کردن جۆراوجۆرن لەبەر ئەوەش چەندین کلتوری جیاواز هەیە.

### سیفەتەکانی کلتور:-

بۆئەوەی پەرچەکرداری جیاوازی گروپە جیاوازەکان بەرامبەر بە ئاوێتەبوون تێ بگەین ئەوە پێویستە سیفەتەکانی کلتور دیاری بکەین کە ئەمانەن:

١- کلتور ستراتیژی ژیانە، مرۆڤ بۆ بەردەوامی و مانەوە پێویستە کردەوەی ڕۆژانە ئەنجام بدات وەک کارکردن، پەیوەندی کۆمەڵایەتی، هەروەها پێویستە پێداویستیە ڕۆحی ومادی و سۆزیەکانی بەدەست بهێنێت.
٢- کلتور کردەوەیەکی کۆمەڵایەتی یە، کلتور هەرگیز کارێکی تاکەکەسی نی یە، بەڵکو تاکە کەس لەگەڵ تەواوی تاکەکانی دیکەدا کلتور بەش دەکات و بە هەموویانەوە کلتوری تەواو پێک دێنن.
٣- کلتور بریتیە لە پێکەوەبەستنی کۆمەڵێک ڕەگەزی مادی و نامادی کە هەموویان پێکەوە تاڕادەیەکی کەم یان زۆر هاوسەنگی دروست دەکەن، هاوسەنگی لە نێو خودی تاکدا، پاشان هاوسەنگی لە نێوان تاکەکاندا، ئەو ڕەگەزانەش بینراوو نەبینراون وەک ڕەوشتی مرۆڤەکان ، کاراکتەری مرۆڤەکان، نمونەی بەرزیان، بەها پیرۆزەکانیان. ئەو ڕەگەزانەش بۆ هەموو ئەوتاکانەی بەشداری لە پێکهێنان و بەردەوامی ئەوکلتورە دەکەن واتای تایبەتی هەیە و خەتی سورو سەوزی بەژێردا ڕاکێشراوە.
٤- کلتور لە ئەنجامدا مۆدیلێکە زۆر بە سستی و هێواشی دەگۆڕێت، کلتور زیاتر بابەتێکە لە نێو هزری مرۆڤەکاندا چەسپیوەو نەوە لە دوای نەوە بە ڕەگەزە تازەکانیشەوە دەگوێزێتەوە. بۆیە دەکرێت بڵێین لە نێوان کلتوری ئەمساڵ و پارو چەند ساڵ پێش ئێستادا گۆڕانکاری زۆر کەمە بەڵام لە نێوان ئێستاو کلتوری پەنجاساڵ پێش لە ئێستا جیاوازی زۆر بەدی دەکرێت.[١٠]
کەواتە کلتور بریتیە لە پەیوەستێکی هاوبەش کە بە شێوەیەکی ئاگا یان نائاگا، پرۆسەی بیرکردنەوەو ئایدیاکانی گروپێکی دیاری کراو لە خەڵک کە بە ماوەیەکی درێژی بێ کۆتا بنیات نراوە بە ڕێوە دەبات، بۆیە بە وورد بونەوە لەژیانی ڕۆژانەی تاک و کۆمەڵ ، بە ڕێوەبردنی ئابوری و شێوازی بەکاربردن و ئاستی تەکنەلۆژیاو بەکارهێنانی، ڕەهەندە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانیان..هتد کلتوری ئەو کۆمەڵگایەمان بۆ دیاری دەبێت، هەموو ئەو نیشانانەی سەرەوە کە ئاماژەمان پێدا شیوازو فۆرم چوارچێوەی ژیان دیاری دەکەن.

هەرچەندە بنیادی گەورەی ئەم کلتورە تەمەنێکی درێژی ژیان کۆی دەکاتەوە بەڵام کۆڵەکە سەرەکیەکانی لە چەندین ڕەگەزی وەستاوو نەوەستاو پێکهاتووە بەم جۆرەی خوارەوە:-

کۆڵەکەی یەکەم ئابوری/ ڕەگەزێکی نەوەستاوە
کۆڵەکەی دووەم کۆمەڵایەتی / ڕەگەزێکی نەوەستاوە
کۆڵەکەی سێهەم ئایینی/ ڕەگەزێکی وەستاوە

**کلتوری من و ئەوی دی ، ئێمەو ئەوان:-**

جیاوازی لە نێوان کلتوری ڕەوەندی ئیسلامی لە هۆلاندداو کلتوری هۆلاندا خۆی لەم خاڵەوە سەرچاوە دەگرێت. کلتوری ( من ) گوزارش لە تاکە کەس دەکات وەک سەرچاوەی سەرەکی کلتورەکەو وەک شوناسی سەرەکیشی، باس ئەو کلتورە دەکات کە تیایدا تاکەکان ( خودموختاری ) تاکە کەسیان بە دەست هێناوەو چی دی لە ژێر ڕکێفی کۆمەڵدا نەماون، هەرچەندە ئەم تاکانە خۆیان بە خۆیان و مەملەکەتی تاقانەی خۆیانەوە سەرەنجام کلتوری مەدەنیCivic ی کۆمەڵگا پێک دێنن، بەڵام ئەم کلتورە بە پێچەوانەی کلتوری ( ئێمە ) وە دەرگای چونە ژوورەوەو هاتنە دەرەوەی لەسەر پشتە و کاتی بۆنی یە، تێکستەکانی دەستور، برگەکانی یاسا، ڕەهەندە کۆمەڵایەتیەکان .هتد تادوور ترین سنور گوزارش لە خواستی تاک دەکەن، تاک بە شوناسی تاک بوونی خۆیەوە، بە شوناسی هاوڵاتی بوونی خۆیەوە وەک قەوارەیەکی ئازاد ئەندامە لە کۆمەڵگاو کلتوری کۆمەڵگاکە لەگەڵ ئەوانی دیکەدا هاوتاو ئازاد دابەش دەکات .

لە کۆمەڵگای خۆرهەڵاتی ( بەتایبەت کۆمەڵگا ئیسلامیەکان)دا زیاتر گوزارش لە کلتوری ( ئێمە ) دەکرێت، لەم کلتورەدا هەموو ئەوتاکانەی یاخود هەموو ( من ) ێک بە خواستی خۆی یان بەدەر لە خواستی خۆی دەچێتە بۆتەی کلتوری ئەوانی دیکەوە هەموویان پێکەوە کلتوری ( ئێمە ) یاخود کلتوری ( کۆمەڵ / جەماعەت ) دروست دەکەن.

لە نێو تێکستە ئایینیەکاندا تاک بوونی نیە و لە شوێنی تاک کۆمەڵ یاخود ( جماعە ) دەبێتە پێکهێنەری کلتوری ( ئێمە ) و ئەو دەمە کۆمەڵ نەک گوزارشی لێ دەکرێت بەڵکو پیرۆزیش دەکرێت،لە تێکستە ئایینیەکاندا زمانی کۆ بەکار دێت ( یاایهاللذین ) و ئیسلام وەک ئۆمەت ( امە ) گوزارشی لێ دەکرێت،

( ان ید اللە مع الجماعە ) بۆیە لامان سەیر نیە کە زۆربەی حزبە ئیسلامیەکان ( جماعە ) ن وەک ( الجماعە الاسلامیە - الجماعە المسلحە .. هتد ) . لێرەوەیە کە هەموو پرۆژەکانی تاک یاخود

( بە دەست هێنانی خود موختاری تاک ) پەراوێزە دەکرێت و دەخرێتە ژێر ڕکێفی جەماعەتەوە تەنانەت لە پێکهێنانی پارت و ڕێکخراوە

سیاسیەکانیشدا ( جماعە ) بڕیاردەرو جێ بە جێ کەریشە. لە پرۆسەی کۆمەڵایەتیدا هۆزو ئێل و لە پرۆسەی سیاسیشدا حزب و ڕێکخراو گوزارش لە کلتوری ( ئێمە) دەکات لە کلتوری (من ) دا ستاتۆی یەک کەس وەک تاکێک یاخود وەک مرۆڤێک یان هاوڵاتیەک سەیر دەکرێت، بۆیە بەدەر لە سنوری تاکە کەس ڕەگەزەکانی کلتورو سیفەتە کلتوریەکان زیاتر تێ پەڕناکەن، لەم کلتورەدا شوناسیش سنوری دیاری کراوەو پرسیار لە شوناسی کۆمەڵ یاخود شوناسی کۆمەڵگا بوونی نی یە بەڵکو بە پێچەوانەوە شوناسی کۆمەڵگا کۆی هەموو ئەو شوناسانەیە کە تاکە خود موختارەکان دروستیان کردووە، شوناسێکی بێ تەم و مژو دیاری کراوە، بەڵام لە کلتوری ئێمەدا پرسیار لە تاک ناکرێت بەڵکو هەمیشە تاکە وون بووەکان هەموو پێکەوەن و پرسیارەکەشیان ئەوەیە: ئێمە کێین؟ بەم جۆرە ئیتر لە وەڵامی پرسیارەکاندا کۆمەڵێک سنور لە نێو کۆمەڵگادا پێک دێن، ئەوسنورانەش هێڵی تەواوی پێکهاتەکانی کۆمەڵگا دیاری دەکات:

| | |
|---|---|
| خێزانی ئێمە | خێزانی ئەوان |
| گوندی ئێمە | گوندی ئەوان |
| ناوچەی ئێمە | ناوچەی ئەوان |
| هۆزی ئێمە | هۆزی ئەوان |
| ئێلی ئێمە | ئێلی ئەوان |
| ئایینی ئێمە | ئایینی ئەوان |
| ئێمەی موسڵمان | ئەوانی کافر |

بەم جۆرە هەتا بازنەی گروپ ( ئێمە ) گەورەتر بێت، بازنەی ئەوانیش گەورەتر دەبێت و بازنە بچوکەکە فەرامۆش دەکرێت ( بابە شێوەیەکی کاتیش ) بێت، بۆنمونە ئەودەمەی بەرامبەر بونەوەی( ئێمەو ئەوان) لە بازنەی ناوچەدایە هەرگیز ئاماژە بۆ بازنەی گوند یاخود خێزان ناکرێت، ئەگەر بەرامبەر بونەوەش لە نێو بازنەی ئاییندا بێت ( ئایینی ئێمە بەرامبەر بە ئایینی ئەوان ) ئەوا هەرگیز کلتوری ئێمە کێشەکانی هۆزو تایفەو تەنانەت وڵاتیش ناهێنێتە ئاراوە.

لە کلتوری ئێمەدا شەرەف و ناموس ڕەگەزێکی زۆر گرنگە و جگە لە پێگەی ئابوری شوناسی تاکەکانیش دیاری دەکات، لێرەدا لۆژیکی کلتورەکە کە سیستەمی پاتریاکی ڕەگی قوڵی تیادا داکوتیەوە بەم جۆرەیە: هەتا پێگەو ستاتوی شەرەفت پاک و بێگەرد بێت ئەوەندە ڕێز لە شەرەفت گیراوەو ئەوەندەش لە نێو ( ئێمەدا ) شوێنت دەبێت[11]

لێرەدا ئاوێتە بوونی تاکێکی بێ شوناس کە لەنێو کلتوری کۆمەڵداخۆی تواندۆتەوە، دیسانەوە دەبێتەوە پرسێکی ( کۆمەڵ – جەماعی ) ، کەواتە لەم بارەدا ئاوێتەبوون هێندەی پشت بە کلتوری کۆمەڵایەتی دەبەستێت، هێندە پشت بە ڕەگەزەکانی خودی تاکەوە نابەستێت چونکە لە کلتوری (ئێمەدا) تاک هێشتا خودموختاری خۆی بەدەست نەهێناوەو مل کەچی کۆمەڵە.
لە پرۆسە ئەقڵیەکانیشدا دیسانەوە تاک پاشکۆی ئەقڵیەتی کۆمەڵەولە یەک لایی کردنەوەی کێشەکاندا هەمیشە تاک لە پێناوی بەرژەوەندی کۆمەڵدا سەرکوت کراوە، بگرە تاکە یاخی بووکانیش زۆر بێ ڕەحمانە سزای (کۆمەڵ) دراون.
لە کلتوری ئێمەدا هەمیشە تاک نەک لە تاکی خراوەو پەراوێز کراوە بەڵکو بێ نرخ و بێ قیمەتیش کراوە، تاکەکان لە کاتی مامەڵەی سیاسیدا دیسانەوە دەکرێنەوە بە کۆمەڵ و وەک ( گەلە- ڕەوە) لەسەودا سیاسیەکانیشدا مامەڵەیان پێوە دەکرێت ، ئەگینا دەبێت واتای ئەوە چی بێت کە هەمیشە لە کاتی ئاڵوگۆڕی سەربازە دیلەکاندا یەک بە سەد سەودا دەکرێت[١٢]؟
تەنانەت لە زاراوە فەرهەنگی و زمانەوانیەکانیشدا فەرهەنگی ئێمە بە زمانی ( کۆ) دەدوێت (زمانی عەرەبی زمانێکی جەماعیە نەک فەردی) .
بەم جۆرە جیاوازی نێوان کلتورەکان دەبنە هۆی جیاوازی ڕادەی بەرەو پیرەوەچونی ئاوێتە بوون لە کۆمەڵگای هۆڵاندیدا.
لێرەدا بۆ تێگەشتن لە ڕادەی ئاوێتە بوونی ڕەوەندی ئیسلامی لەنێو کۆمەڵگای هۆلاندیدا پێویستە پرسیارێک بکەین ئەویش ئەوەیە: ڕەوەندی ئیسلامی بەو کلتورە تەواو جیاوازەوە لەگەڵ کلتوری هۆڵاندیدا ڕادەی ئامادەبوونی بۆ ئاوێتە بوون تیایدا چەندە؟
لەبەر ئەوەی ڕەوەندی ئیسلامی یەک پێکهاتەی کلتوری نی یە ئەوا یەک وەڵامیشمان لا دروست نابێت، بۆ نمونە شێوازو ڕادەی ئاوێتە بوونی پێکهاتە سەرەکیەکانی ڕەوەندی ئیسلامی ( تورک، مەغریبی، ئەندەنوسی...هتد ) وەک یەک نیە هەروەها ڕادەی ئاوێتە بوونی نەوەی یەکەم(Eerste generatie) جیاوازە لە نەوەی دووەم(Tweede generatie ).
هەروەک لە شیکردنەوەی ڕەگەزەکانی کلتووردا ئاماژەمان پێدا ئایین کۆڵەکەیەکی زۆر گرنگی کلتورە و بریتیە لە ڕەگەزێکی وەستاو لە کلتووردا چونکە تەواوی ئایینەکان بۆ فۆرمیلە کردنی ژیان و تێگەیشتن و ڕوون کردنەوەو شیکردنەوەی تەواوی دیاردەکانی ژیان پەرتوکی پیرۆزیان هەیەو

هەڵگران و پەیڕەوانی ئایینەکەش ئەو کتێبە پیرۆزانە کە سەدان و هەزاران ساڵ بەر لە ئێستا نوسراونەتەوە، دەکەنە سەرچاوەی تێزەکانیان بۆیە هەموو جیاوازیەک لە نێوان ئەو ئایینانەدا دەبنە سەرچاوەی دوورخستنەوەی بۆ چونەکان و دەبنە هۆی زیادکردنی جیاوازیەکانی کلتورە جیاوازەکان بۆیە لەگەڵ سەرهەڵدانی هەر جۆرە بەریەک کەوتنێک لە نێوان کلتورە جیاوازەکاندا ئاوێتە بوون هەنگاوێک بەرەو دوواوە دەچێت و دەلاقەکانی نێوان کۆمەڵگاش زیاتر دەم دەکەنەوە. بۆ نەوەی دووەم ڕەنگە ئاوێتە بوون زەحمەت تر بێت، چونکە ئەوان دەکەونە نێوان بەرداشی دوو کلتورەوە کلتوری ماڵی خۆیان ( وڵاتی خۆیان ) و کلتوری نوێ.

خێزان لە زۆرلە حاڵەتەکاندا دەبێتە هۆی چەواشەکردنی ئەو منداڵەی نەوەی دووەمەو نەک لە هۆڵاندا لەدایک بووە بەڵکو پەیوەندیەکانیشی بە وڵاتی باوکەوە زۆر لاوازن.

خێزان لێرەدا دەبێتە هۆکاری بەرهەم هێنانەوەی هەمان نەریت و هەمان کلتوری ڕۆژهەڵاتی خۆی لە تاراوگە کۆپی دەکاتەوە و وڵاتێکی شێواو لە کلتور و سیخناخ لە هەندێک پەیوەندی زۆرەملێ لە هەندەران بۆ نەوەکەی بەرهەم دێنێتەوە، لە دەورو بەریشدا هەمان ڕووداو دووبارە دەبێتەوە چونکە زۆربەی ئەومیوانانەی سەردانی ئەم ماڵە دەکەنەوە، هەڵگرانی هەمان کلتورو هەمان شوناسن هەتا قەبارەی ڕەوەندەکەش گەورەبێت ئەگەری دیسان بەرهەم هێنانەوەی نیشتیمانی خۆی لە ئەوروپا زیاتر دەبێت و کانسی ڕاهاتن و ئاوێتە بوونی کەمتر دەبێتەوە، خۆ ئەگەر زانیمان لە ئەوروپا ئەو گەڕەک و باڵەخانانەی کە ڕەوەندی ئیسلامی تیایدا کۆدەبێتەوە هەمووی پێکەوەن ، ئەوە قەبارەی مەترسی ئەم بەرهەم هێنانەوەیەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە.

کەناڵەکانی سەتەلایت لە پرۆسەی بەرهەم هێنانەوەی کلتوری ڕۆژهەڵات و وڵاتی باوک هەمان ڕۆڵیان هەیە چونکە ڕەوەندەکانی تاراوگە بە هۆی کەناڵەکانی سەتەلایتەوە هەمیشە دەبنە هۆی پێکهێنانی کەش ( تەقس ) ێک کە وادەکات ئەندامی ڕەوەندەکە بە جەستە لە تاراوگە بێت و بە ئەقڵ و فەرهەنگ ڕۆژانە لەوڵاتی خۆیدا بێت یان بەلای کەمەوە ڕۆژانە خۆی بە فەرهەنگی ئەوێندەرێ دەمەزەرد دەکاتەوە.

## وێنەی ڕەوەندی ئیسلامی:-

ڕاگەیاندن ڕۆڵێکی بەرچاو دەبینێت لە دروستکردنی ڕای گشتی بەرامبەر بە تەواوی ئەو ڕووداوانەی ڕۆژانە لەم وڵاتەدا ڕوودەدات. ڕاگەیاندن هەڵدەستێت بە داڕشتنی ئەو کێشە سیاسی یان کۆمەلایەتیانەی ڕەوەندی ئیسلامی کە خۆی بەسەرجادەدا سەپاندووە، لە ڕێگای مێزگرد و ئاڵوگۆڕی بیرو باوەڕەوە ڕای گشتی دروست دەکات و کێشەکە هەڵدەداتە سەر مێزی سیاسی ، ئەودەمە حکومەت و لایەنە بەرپرسەکان ناچار دەکرێن بڕیار وچارەسەری بۆ بدۆزنەوە.

ڕاگەیاندن بەشداریکی زۆر گرنگە لە ( جوان کردن یاخود ناشرین کردن) ی ئەو وێنەیەی کە خراوەتە سەرشاشەی تەلەفزیۆن یاخود ڕووپەڕی ڕۆژنامە، هەربۆیەش لە دنیادا زۆرترین سەرمایە لە بوارەکانی ڕاگەیاندن وەگەڕدەخرێن و زۆرترین هەوڵەکانیش بۆ پێکهێنانی ڕای گشتی تەرخان دەکرێن،ئەمڕۆ نەک تەنها لە هۆڵاندا بەڵکو لە تەواوی دنیای ڕۆژئاوادا پاش ڕووداوەکانی یازدەی سێپتەمبەری مانهاتن ڕۆژانە و بگرە هەموو کات و ساتێک باس و لێدوان لەسەر ئیسلامی سیاسی و تیرۆرو جەنگی دژ بە تیرۆر لە ئارادایە، ڕووداوەکانی ڕۆژانە لەمەڕ ڕەوەندی ئیسلامیەوە دەکرێنە بابەت و سەرچاوەی لێدوان و تاوتوێ کردن.

ئەو وێنەیەی میدیای هۆڵاندا بەڕەوەندی ئیسلامی بەخشیوە، ڕەنگە تاڕادەیەکی زۆریش لە چاو ئەمەریکاو وڵاتانی دیکەی خۆرئاوادا کەمتر ئەگرەسیف بێت و لەبەر چەندین هۆی جۆراو جۆر (لەوانە ترس لە وروژاندنی تەواوی ڕەوەندەکە) ڕەنگە میدیای هۆڵاندا کەمتر لەوانی دیکە زیادە ڕۆیی بکات.

## ئیسلامیە شەڕفرۆشەکان:-

ڕەنگە باشترین بەڵگە کە خودی ئیسلامی سیاسی خۆی بەدەستەوەی دەدات بۆ ئەوەی ڕەوەندی ئیسلامی بەگشتی و بە بێ جیاوازی بکرێنە بنێشتەخۆشەی ژێر دانی میدیاکان ئەو وێنەی ڕۆژانەیە بێت کە

تیرۆریستێکی ئیسلامی بە دەم وچاوی هەڵپێچراوەوە فتوای سەربڕینی مرۆڤێکی ئەوروپی دەخوێنێتەوە کە لە عێراق بەدیل گیراوە یان ڕفێنراوە، وێنەی دەم و چاوی هەڵپێچراوی فەلەستینیەکان بە کۆمەڵێک پاکەتی ( TNT ) یەوە کە خۆشحاڵانە پاش کارێکی خۆکوژی لە شوێنێکی گشتیدا لە ئیسرائیل خۆی دەناسێنێت. ئەوها وێنەیەک هەمیشە باشترین کەرەسە یە بۆ میدیای ئەوروپاو هۆڵانداش کە تەواوی ڕەوەندی ئیسلامی پێوە بگلێنێت، وێنەی خۆپشاندانی جەماوەریی موسڵمانە تووڕەکان لە تەسلیمە نەسرین یاخود لە سەلمان ڕوشدی و پەلاماردانی تەڕو ووشک لە کاتی خۆپیشاندانەکانداو دووپاتکردنەوەی کەسێک بە بستێک ڕیشەوە کە دەڵێت (ئیسلام دەبێت حاکم بێت، ئەمە تەنها لە هۆڵانداداوا ناکەین بەڵکو لە تەواوی دنیادا دەیچەسپێنین، لە تەواوی دنیادا دەبێت یاسای خوا بەرقەرار بێت) باشترین نامەی دژ بە ڕەوەندی ئیسلامی یە کە تەنها یەک خولەک کات لە میدیا دەگرێت و باشترین بەڵگەی بێ ئاگایی و توند ڕەوی موسڵمانە خۆ نیشاندەرەکانە.

سەرکەوتوویی میدیای ڕۆژئاوا لەم بوارەدا بە ئاشکرا دیارە چونکە ڕۆژانە کردەوەی تیرۆریستی ئیسلامی سیاسی هێندە زۆرن کە بەردەوام میدیاکان بتوانن لە وێنەی نوێ بەهرەمەند بن بۆ سەرلەنوێ دەمەزەرد کردنەوەی زەینی بینەرو خوێنەرەکانیان بەرامبەر بەو ئیسلامیە شەڕانگێزو تیرۆریستیانەی کە دەیانەوێتماڵی ئەوروپیەکانیش بکەنە مەیدانی خوێن ڕشتن، ڕووداوەکەی قوتابخانەیەکی سەرەتایی لە( بێسلان) دزێو ترین ئەو وێنەیە بوو کە ئیسلامی سیاسی لەسەر سینیەکی زێڕین بە تەواوی میدیای جیهانی بەخشی.

**ئیسلام وەک ئاینێکی دوواکەوتوو:-**

دژایەتی کردنی ئیسلام وئیسلامی سیاسی و کلتوری ئیسلامی باشترین هۆیە بۆ سەرکەوتنی ئەستێرەی هەر نوسەرێک یان سیاسەت مەدارێک یان هونەرمەندێک. یەک مێزگردی تەلەفزیۆن بەسە بۆ ئەو کەسەی دەیەوێت پێشکەوێت و ناو دەرکات، بەو مەرجەی ڕاشکاوانە لە کەناڵەکانی میدیاوە ئیسلام وەک ئاینێکی دووا کەوتوو مەزەندە کات و تێزەکانیشی بەو هەموو ڕووداوانەی ڕۆژانە کە ڕوودەدەن پشت ڕاست کاتەوە.

یەکەم سیاسەت مەداری هۆڵاندی کە ئەم بابەتەی ووروژاندو لە چەند
ـەشێکی ئەم نووسینەدا ئامـاژەمان پێداوە ( پیم فۆرتـاین ) بـوو. هـەروەهـا
چەندین نوسەرو ئەندام پەرلەمانی دیکەی وەک
( ولدەرز و عەیان حرسی عەلی ) لەم بوارەدا بوونەتە ئەستێرەی ئاسمانی
سیاسەت.

چەندین سیاسەت مەداری دیکەی وەک ( **Bolkestein** ) پێشتر هەمیشە پشت
ئەستور بە نمونە خراپەکانی دکتاتۆریەتی ئیسلام لە ئێران و ڕووداوەکانی
پاکستان و تیرۆری ئیسلامی سیاسی ڕاشکاوانە گوتویانە (کلتوری ئیسلامی
لەگەڵ دەوڵەتی هۆڵاندا ناگونجێت و دەبێت ڕادەیەک دانرێت بۆ چالاکی
ئیسلامیەکان لە هۆڵانددا).

بۆ خستنە ڕووی ئاشکراترو ڕوونتری ئەم وێنەیە هەمیشە لە میدیای
هۆڵاندا وەک بەهاکانی کۆمەڵگای ئەوروپی باس لە ناوەڕۆکی دیموکراسی و
لیبرالیزم دەکرێت کە هەرگیز لە نێو ئیسلامدا پێگەیەکیان بۆ دروست
نابێت، تەنانەت ئەو دیموکراتیەتەی لە هەندێک وڵاتانی بە کلتوور
ئیسلامدا هەیە وەک تاکتیکی ئیسلامی سیاسی بۆ گەیشتنە دەسەڵات ناو
دەبەن، هەر ئەوەندە دەسەڵاتیان گرتە دەست ئیتر خۆیان لە تەواوی چەمکە
دیموکراتی و لیبراڵەکان دەدزنەوە.

لە چەندین بابەتی گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا بە منەتەوە ڕوو لە موسڵمانەکان
دەکەن و دەڵێن ( ئەو مافەی لێرە لە سایەی دیموکراتیەتی ئەوروپادا
بەدەستان هێناوە لە هیچ وڵاتێکی ئیسلامی خۆتاندا پێتان نەدراوە). ئەگەر
خوێنەری هێژا لە ڕاستی و دروستی ئەو نوسراوە خۆی هەڵە نەکات ئەوا
میدیای ڕۆژئاوا ئامانجی خۆی باش دەپێکێت، چونکە نەک مافەکانی
ڕەوەندی ئیسلامی کە ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و بەکارهێنانی میدیا پارێزراوە،
بەڵکو زۆربەی ئەندامانی ڕێکخراوە ئیسلامیەکانی ئەوروپا لە وڵاتی خۆیان
دەرکراون یاخود ڕاوەدوو نراون و زیندانی کراون و ئەشکەنجە دراون بەڵام
لە ئەوروپا نەک مافیان پێ دراوە چالاکی سیاسیان هەبێت بەڵکو بە پێ ی
یاسای سڤیل پاسپۆرتیشیان وەرگرتووە

**پەنابەرە تاوانبارو برسیەکان:-**

وێنەی پەنابەر لە هۆڵاندا بەشێکی دیکەی وێنەی ڕەوەندی ئیسلامی دروست دەکات، ئەم وێنەیە تا ڕادەیەکی ئەوتۆ لە میدیادا قێزەون کراوە، لە زۆربەی بارەکاندا هەرئەوەندەی کەسێکی بێگانە وەک پەنابەر خۆی دەناسێنێت، کەسی بەرامبەری نەک تەنها هەڵوێستێکی پڕگومان وەردەگرێت بەڵکو لێشی دەترسێت.

دۆسیەی پەنابەران یەکێکی دیکە لەو بابەتە گەرم و گوڕانەیە کە سیاسەت مەداری زیرەک هەمیشە دەیکاتە هۆکارێک بۆ سەرکەوتن بەسەر پەیژەی سیاسیدا، لە ڕاستیدا نەک تەنها میدیاکان بەڵکو سیاسەت مەدارو حزب و ڕێکخراوەکانیش وێنەیەکیان بە پەنابەر بەخشیوە کە هەندێک جار مرۆڤ ئەگەر پەنابەر بێت بەزەیی بە خودی خۆشیدا بێتەوە[١٣].

لەم وێنە بەخشراوەدا پەنابەر هێرش دێنێ بۆ ئەوروپاو داگیری دەکات، پارە بەوڵات سەرف دەکات و بە هەدەری دەبات، لەبەر نەخۆشی و کەم خوێندەواریان و زۆری ژمارەی منداڵەکانیان خەرجی دەوڵەت هەڵدەلوشن، ئەگەر کاریش بکەن ئەوا پارەی ئەم وڵاتە ڕەوانەی وڵاتی خۆیان دەکەنەوە و لە بەرژەوەندی ئابوری هۆڵاندا وەگەڕی ناخەن. بە هۆی دوواکەوتویی و هەژاری وڵاتەکانیانەوە لە برسا ڕوو لە ئەوروپا دەکەن... هتد

وێنەکە لێرەدا تەواو نەبووە بەڵکو زیاتر ناشیرین دەکرێت و پەنابەران دەکرێنە دڕندەیەکی حەوت سەر، پەنابەران بەو پێ یەی لاوازترین گروپن لەناو بێگانەکاندا ئاسانترین کەرەستەشن کە هەر کەناڵێکی میدیا یاخود پارتێکی سیاسی بتوانێت بۆ ئامانجەکانی خۆی بەکاری بهێنێت.

زۆربەی پەنابەران بە شێوەیەکی گشتی لە وڵاتانی ئیسلامیەوە هاتوون ئەمەش وای کردووە پرسی زۆربوونی ژمارەی پەنابەران بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ واتا زۆربوونی ژمارەی موسڵمانان بگەیەنێت کە ئەمەش نەخوازراوە، پەنابەران بەهۆی ئەوەی کە هێشتا شارەزا نین و لە یاساو زمانی وڵات نازانن و مافی نیشتەجێ بوونیان نییە( یاخود نەبوونەتە هاوڵاتی ) ئاسانتر لە بێگانەکانی دیکە دەبنە ئامانج بۆیە پەنابەران زۆرترین بەشی ئەو تۆمەتانە وەردەگرن کە ئاڕاستەی بێگانەکان دەکرێت، بنکەی پۆلیسی هەرێمی (Groningen) ساڵی ٢٠٠١ ڕاپۆرتێکی بڵاو کردەوە

کەتیایدا هاتووە ( پەنابەران شەش هێندەی هۆڵەندیەکان زیاتر کاری تاوان ئەنجام دەدەن) لەو ڕاپۆرتەدا کە پاشان ئاشکرا بوو هەڵەی زۆری تیایە و ڕەخنە لە ڕاستگۆیی گیرا هاتووە کە پەنابەرانی ئەو دەڤەرە ٣٨٩٠ کەس بوون و ٢٩٩ تاوانیان ئەنجام داوە(١٤).

لە زۆر بەی ڕاپۆرت و مێزگردەکانیشدا ئاماژە بەوە دەکرێت کە هۆڵاندا دەوڵەتێکی زۆر بچوکەو ئەو هەموو پەنابەرانە هەڵناگرێت، بەبێ ئەوەی باس لەوە بکەن ئەو پەنابەرانە بەپێ ی یاساو ڕێکەوتن نامەیەک دێنە ئەم وڵاتو داوای مافی پەنابەری دەکەن کە ئەم وڵاتە خۆی مۆری کردووە. بەبێ ئەوەی ئاماژەیەک بەوە بدەن کە هۆڵاندا وەک دەوڵەتێکی ئەوروپی و پێشکەوتوو لە بواری تەکنەلۆژیدا بە فرۆشتنی چەک و تەقەمەنی و مەوادی کیمیاوی دەستی هەبووە لە تێکدان و وێران کردنی چەندین دەوڵەت.

ڕەنگە (**Frans Van Anraat**) کە یەکێکە لەو بازرگانە هۆڵاندیانەی چەکی کۆکوژی بە ڕژێمی عێراق فرۆشتووە باشترین نمونە بێت، ئەم بازرگانە هەتا ڕۆژی ئازاد کردنی عێراق لە بەغدا بوو، پاشان گەڕایەوە هۆڵانداو پاش، ئەوەی لەلایەن ناوەندی هەڵەبجە دژ بە ئەنفال و جینۆساید درایە دادگا بە پانزە ساڵ زیندانی حوکم درا.

### مافی ژنان و مەسەلەی خێزان:-

یەکێک لە بابەتە گرنگەکانی میدیای ئەوروپا بە گشتی لەمەڕکێشەی ڕەوەندی ئیسلامی و پەنابەران و تەواوی بێگانەکانی بە ڕەگەز ئاسیاوی و موسڵمان، بریتیە لە چەسپاندنی وێنەیەکی زۆر ناشیرین لەمەڕ کێشەی ژنان و مەسەلەی منداڵ و پەروەردە لە نێو خێزانی ئیسلامیدا، ئەگەر ڕۆژانە نەبێت ئەوا هەفتانەو مانگانە هەندێک جاریش بە زنجیرە بەرنامە و ڕیپۆرتاژ دووا گۆڕانکاری و نوێ کردنەوەو تاوتو ێ کردنی وێنەکە دەخرێتە ڕوو.

کوشتنی ژنێک لە نێو یاریگایەکی شاری کابوڵ بە دەستی چەکدارەکانی تاڵیبان گوزارش لە نەبوونی هیچ ئازادیەک و مافی ژنان لەنێو کۆمەڵگا ئیسلامیەکاندا دەکات، خەتەنە کردنی کچان لە سۆمال و سودان و باشوری میسر ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی لە تەواوی وڵاتانی ئیسلامیدا ئەم کارە بە ڕێوە دەچێت.

کوشتن لەسەر شەرەف و ناموس و سەپاندنی کلتوری ئیسلامی ولاتی باوک بەسەر مندالێکدا کە لە ئەوروپا گەورە بووەو نەک هەرگیز ولاتی باوکی نەدیوە بەڵکو زمان و کلتورەکەشی لا ئاشنا نییە.. ئەمانە هەموو ئەو بابەتانەن کە پێکەوە وێنەی ڕەوەندی ئیسلامی تەواو دەکەن، بابەتەکانی سەر میدیای هۆلاندا ئەوسنورانەش تێ دەپەڕێنێت و دەگاتە نیشاندانی ڕێژەی ئەو ژنانەی بەدەستی مێردەکانیان دەکوژرێن یان نیوە مردوو دەکرێن. تێکستەکانی قورئان و لێدوانەکانی پێغەمبەرو ڕاڤە کردنی ئیمامەکانیش بە نمونە دێننەوە.

- باوکێکی تورک کچەکەی خۆی دەباتەوە بۆ تورکیاو لەوێ دەیکوژێت.

- باوکێکی مەغریبی تاوانی کوشتن دژی کچەکەی خۆی ئەنجام دەدات.

زۆرن تایتڵی دیکەی لەو بابەتە کە ئاماژە بە نەگونجان و ئاوێتە نەبوونی ڕەوەندی ئیسلامی دەکەن و وێنەیەک دەبەخشن بە تەواوی ئەو ڕەوەندە هێندە قێزەونە تەڕووشک پێکەوە دەسوتێنێت.

هەڵبەتە لێرەدا من مەبەستم پاکانەکردن نی یە بۆ ڕەوەندی ئیسلامی ، چونکە ئەم وێنەیە لە زۆر ڕووەوە ڕاست و ڕەوانەو وێنەیەکی تەواوە، بەلام لە جیاتی ئەوەی ئەوکێشانە بە پێ ی یاسا چارەسەری گونجاوو سزای توندیان بۆ دانرێت، بەهۆی میدیاوە دەکرێنە تاوانێک و بە ملی هەموو بێگانەیەکدا هەڵدەواسرێن، کەم نین ئەو هۆلاندیانەش کە هەمان تاوان ئەنجام دەدەن کەچی بۆ ئەوان دۆسیەکە دۆسیەی تاوانباریی کەسێکە بەلام بۆ بێگانە دۆسیەکە دەکرێتە دۆسێی یەکی کلتوری، ڕەنگە ڕووداوی کچەکەی نولدە (Het metsje van Nulde)[١٥] باشترین نمونە بێت.

خودی لایەنە بەرپرسەکانی هۆلانداش لە وەلامی ئەم پرسیارانەدا نکوڵی لە تاوانی لەو جۆرە لە نێو کۆمەڵگای هۆلاندیە ڕەسەنەکان ناکەن وەلێ جیاوازی بەدی دەکەن و لەسەر بنەڕەتی ئەو جیاوازیانەشە کە بەو جۆرە ڕووداوەکان هەڵدەسەنگێنن، ئەوانە دەڵێن تەواوی ئەوتاوانانەی کە هۆلاندیە ڕەسەنەکان ئەنجامی دەدەن تەنها وەک تاوانی کوشتن و توندو تیژی ئەنجام دەدرێن بەبێ ئەوەی ئەو تاوانانە پاشخانێکی کلتوری یان ئایینی هەبێت، بەلام ڕەوەندی ئیسلامی لەسەر مەسەلەی شەرەف و ناموس و ئایین ئەو تاوانانە ئەنجام دەدەن، ڕەنگە لێرەشدا ڕووداوەکەی (عەلی)[١٦] باشترین نمونە بێت و پەندێکی پێشینانی تورکیش هەیە کە دەڵێت ( مرۆڤ بۆ ناموس دەژی و بۆ ناموسیش دەمرێت) باشترین ئاماژە بێت بۆ پەیوەندی قوڵی نێوان کلتورو سزای شەرەف.

ڕەنگە گرفتی پەروەردەکردنی منداڵ یەکێک بێت لەو گرفتە زۆرانەی کە باس لە لێکترازاوی ئەو خێزانانە بکات، ئەو منداڵانەی لە هۆڵاندا لەدایک دەبن و لە تەمەنی منداڵیەوە دەخرێنە بەر خوێندن و بە هەموو شێوەیەک فەرهەنگی ڕۆژئاوایی فێردەکرێن کە تەواو پێچەوانەی ئەوی دیکەیە، لە نێوان ئەو دوو کلتورەدا منداڵ دەبێت لە قوتابخانە یاخود لە شوێنە گشتیەکان بە جۆرێک هەڵس و کەوت بکات و لەماڵیشەوە لە ترسی باوک و دایک بەجۆرێکی دیکە، ئەمەش وادەکات کە کێشەی خێزان لە نێوان ئەو منداڵانەدا زۆر بێت بە تایبەت لە تەمەنی هەرزەکاریدا، ژمارەیەکی زۆر لەو کەسانەی کە توشی ئەم کێشەیە دەبن لە دەست خێزانەکانیان هەڵدێن و پەنا بۆ پۆلیس دەبەن و پۆلیسیش لە چەندین شوێنی تایبەتیدا داڵدەیان دەدەن، ئەمانە لە لایەن میدیاوە باش چاودێری دەکرێن و دەکرێنە بابەتی ڕۆژ.

ئەو نمونانەی سەرەوە تەنها چەند نمونەیەکی زەق بوون یاخود چەند وێنەیەکی زەق بوون کە لە هۆڵاندا بوونەتە شوناس و وێنەی نەخوازراوی ڕەوەندێکی نزیک یەک ملیۆن.

کارەساتەکە تەنها لەوەدا نی یە کە نزیکەی یەک ملیۆن مرۆڤ بکرێنە گورزەیەک و شێوەیەکیان لە مرۆڤێکی ڕیشنی چاو زەق بە دزداشەیەک و جوتێک نەعلەوە، تەزبیحێکی بەدەستەوەیە و تەنها ووشەی جیهاد دەزانێت، لێ دروست بکرێت،کارەساتەکە لەوەدایە کە خودی ئەو ڕەوەندە بەشدارە لە پێکهێنان و تەواو کردنی ئەو وێنە نەخوازراوە، بەبێ ئەوەی هەوڵێک بدەن تا هیچ نەبێت خۆیان لە پێشکەش کردنی وێنەکەدا ڕۆڵێکی پۆزەتیفانە بگێڕن.

لە کاتێکدا تاکە سەرچاوەی زانیاری و دەنگ و باسی ڕەوەندی ئیسلامی(عەرەبی زمان) تەنها کەناڵی سەتەلایتی عەرەبی و کۆمەڵێک ڕۆژنامەی دیاری کراون کە دەگەنە ئەوروپا، دەبوو ئەو کەناڵانە ڕاستەو خۆ بەشدار بوونایە لە ووریاکردنەوەو پێشخستنی ڕەوەندی ئیسلامی کەچی بە پێچەوانەوە دەبینین ئەو کەناڵانە هەمان ئایدۆلۆجیای توندڕەوی ئسولی ئیسلامی سعودیە و موشایەخەکانی نەوت (دۆلار) بەهۆی پەخشەکانیانەوە دەهێننە نێو ماڵی یەکە - یەکەی ئەو ڕەوەندە...

کەناڵی سەتەلایتی ( ئەلجەزیرە) کە ملیۆنەها بینەری لە ئەوروپا هەیە بۆتە یەکەمین سەرچاوە بۆ پڕ کردن و ئاخنینی مێشکی ڕەوەندی ئیسلامی بە فەرهەنگی دژ بە ڕۆژئاوا لە کاتێکدا گەورە - ترین بنکەی سەربازی

ئەمەریکا لە ناوچەکەدا تەنها چەند کیلومەترێک لە خودی کەناڵەکەوە دووره، ئەم کەناڵە لە هەندێک بەرنامەی تایبەتیدا کە تەنها پڕوپاگەندەیەکی گروپی ئیسلامی سیاسیە هەمان ئەو وێنە نەخوازراوەی ڕەوەندی ئیسلامی پێچەوانە دەکاتەوە و دەیکاتە وێنەیەکی نەخوازراو بۆ ئەوروپیەکان و فەرهەنگی ( أباحی ) ئەوروپی.

لە دیدی ئەم کەناڵەدا ئەوروپیەکان هەموو موسڵمانێک بە تیرۆریست دەناسێنن و بارودۆخی ئێستای ئەوروپاش بۆ ڕەوەندی ئیسلامی بە سەردەمی ( محاکم التفتیش) دەچوێنن بۆ زیاتر شارەزا بوون بنوارە ماڵپەڕی ئەلجەزیرەو ئەو ڕاپۆرت و شیکردنەوانەی کە دەیخاتە بەردەم خوێنەر. زۆربەی ئەوکەسانەی بەرنامەکانی ئەلجەزیرە پێشکەش دەکەن ناسیونالستی عەرەبی و ئیسلامین و زۆربەی بەشداربووەکانیشیان بە هەمان شێوە لەو کەسانەن کە هەمان هێڵی ئایدۆلۆژی و بۆچونیان هەیە.

ئەو ڕۆژنامە عەرەبیانەی کە دەگەنە بەردەستی ڕەوەندی ئیسلامی لە باشترین حاڵەتدا ڕۆژنامەی ناسیونالستی عارەبین و زەمەنی بیرکردنەوەی ( عبدالناصر) یان هێشتا تێ نەپەڕاندووەو لاپەڕەکانیشیان پڕە لە پڕۆپاگەندە بۆ ئەو کردەوە تیرۆریستیانەی کە بە (استشهادی ) ناوی دەبەن.

ڕۆژنامەی( القدس العربی) ئەو مەودایەش تێ دەپەڕێنێت و کۆکتێلێکی ناسیونالستی و ئیسلامی عەرەبی وا پێشکەش دەکات کە ڕەوەندی ئیسلامی ئەوروپا بە شێوەیەکی زۆر ئاشکرا هان دەدات زیاتر لە نێو کۆمەڵگای داخراوی خۆیدا پەنگ بخواتەوە، لەوەش زیاتر هاندانی جیهاد و کاری خۆکوژی و تەنانەت پیاهەڵدانی خودی ( بن لادن ) یش بۆتە کارێکی بەرنامە بۆ داڕێژراوی ئەو ڕۆژنامەیە.

هەست کردن بە لاوازی لە نێو ئەندامانی ڕەوەندی ئیسلامی ئەوروپا خاڵێکی لاوازی ئەو ڕەوەندەیە کە هەمیشە خۆی لە سەنگەری پاشەکشەدا دەبینێت بۆیە هەموو هەنگاوێکی حکومەتە ئەوروپیەکان بە پیلان و ( موئامەره ) لێک دەدەنەوە، بەرامبەر بەم پیلانە هەمیشە ڕەوەندەکە خۆی لە نێو گروپی خۆیدا قەتیس دەدات و زیاتر خۆی بەو کلتورەوە دەبەستێتەوە کە تەنانەت لە وڵاتی خۆشیاندا هێندە پێوەی هۆگر نەبوون، هەموو ئەم کارانە بوونەتە هۆی پێ زیادە ڕاکێشانێکی ناڕەوای ئەو ڕەوەندە لە نێو دڵی ئەو وڵاتانەی تیایدا دەژین و کلتورەکەشیان تەواو پێچەوانەی کلتوری ئیسلامە، لەچک کردنە سەر منداڵی سێ ساڵە و چوارساڵە، سەربڕینی مەڕو بزن لەبەرچاوی خەڵکەوە[١٧] ڕەخنەگرتن لە

هەموو کارێکی باش و خراپی حکومەتەکان ، زیادکردنی بێ ئەندازەی مزگەوتەکان لە کاتێکدا ئەو وڵاتانە مەسیحین و لەوڵاتانی ئیسلامیدا زۆر بە کەمی ماوە دەدرێت بە کردنەوەی پەرستگایەکی نائیسلامی و پەرستگا مەسیحیەکان هێرش دەکرێتە سەریان.... هتد هەموو ئەم ڕەفتارانەی خودی ڕەوەندی ئیسلامی ئاماژەی نەگەتیفن بۆ ئاوێتە بوونی ڕەوەندەکە و خۆ پەراوێزکردنی.

**ئەوبوارانەی ئاوێتە بوون تیایدا شکستی خواردووە:**

لەگەڵ هەموو ئەو گرفتانەی باسمان کردن پێویستە ئاوێتە بوون تاسەر کاری بۆ بکرێت و بەردەوام بێت، هەڵبەتە ئامادەبوونی مرۆڤ بۆ ئاوێتە بوون لە ڕەوەندێکەوە بۆ ڕەوەندێکی دیکە جیاوازە هەروەها لە نێو خودی ڕەوەندێکیشدا جیاوازە، تەمەن ورەگەزیش ڕۆڵی هەیە لە ئاوێتە بووندا، بەڵام بەگشتی هۆڵاندا ئەو سیاسەتە پەیڕەو دەکات کە دژی توانەوەیە و لەگەڵ ئەوەدایە کە مرۆڤ کلتوری خۆشی بپارێزێت و لەماڵی خۆیدا سەروەری خۆی بێت، بەڵام لە نێو کۆمەڵگای هۆڵاندا پێویستە بەشدارێکی کاریگەرو بەنرخ بێت و بەهاو نەریتەکانی ئەو کۆمەڵگایە دژایەتی نەکات.

لەبەشەکانی پێشوودا ئامارژەمان بۆ ئەوە کرد کە دیوی کۆمەڵایەتی کلتوری لە ئاوێتەبووندا ڕووبە -ڕووی چەندین ڕێگری گەورە دەبێتەوە، کە ڕێگرو ئاستەمەکانی زیاتر جیاوازی کلتور دروستی دەکات، بۆ لێکدانەوەو شیکرنەوەی بنەڕەتی کێشەی نێوان کلتوری ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی و کلتوری مەسیحی ئەوروپا پێویستە ئامارژە بە تێزەکانی( صمۆئیل هنگتون ) لەمەڕ کێشەی شارستانیەکان بکەین کە چەندین توێژینەوەی لە بارەوە کراوە لەوانە جیاوازی گەورەی نێوان هەردوو کلتوری ناوبراو و ئاوێتە نەبوونیان پێکەوە، بەڵام دیارە ئەم بابەتە دەمانباتە سەر چەندین تیۆری فەلسەفی کە ئامانجی ئەم نوسینەی ئێمە نی یە، بەڵام لە دیوی بونیادی **Stucturele Integratie** کە خوێندن و کارکردن دەگرێتەوە، هەڵسەنگاندنێک پێشکەش دەکەین.

بە پێ ی لێکدانەوەی لایەنە بەرپرسەکان ڕێژەی بێکاری لە نێو بێگانەکاندا لە هۆڵاندا هەمیشە زیاترە لە ڕێژەی بێکاری لە نێو هۆڵاندیەکاندا.

ژمارەی ئەو بێگانانەی کە ساڵی ٢٠٠٤ لە بنکەی داهات و کارکردن (C.W.I) تۆمار کراون ١٦٩.٥٠٠ کەسن، ئەم ژمارەیە ساڵی ٢٠٠٣ بریتی بوو لە ١٧٨.٦٠٠ . لە چاو کۆی گشتی بێکاراندا لە وڵات ٦٩٢.٠٠٠ ساڵی ٢٠٠٤ ڕێژەی ئەو بێگانانەی کە بێکارن هەمیشە سێ ئەوەندەی ڕێژەی هۆڵاندیەکان دەبن و لە هەمان ماوەی ساڵی ٢٠٠٤ ئەو ڕێژەیە ٢٨.٥% ی ڕێژەی گشتی بێکارانی پێکهێناوە.

هۆیەکانی ئەم ڕێژە بەرزەی بێکاری لە نێو بێگانەکاندا لە هۆڵاندا یەکجار زۆرە، هۆی سەرەکی بریتیە لە نەبوونی دبلۆما ( شەهادە ) ، زۆربەی ئەو بێگانانەی کە ڕوویان لە هۆڵاندا کردووە لە وڵاتی خۆیان یاخود خوێندەواریی یەکی ئەوتۆیان نەبووە یاخود ( دبلۆما ) ی بەرزیان نی یە ،

بڕوانە ئەم خشتەیەی خوارەوە

سەرچاوە: Jaar boek minderheiden 2001 SPVA-94

**ئاستی دبلۆمای گروپە ئەتنیەکانی هۆڵاندا بە بەراوورد لەگەڵ هۆڵاندیەکاندا**

| ئاستی خوێندن | تورک | مەغریبی | سورینامی | ئەنتالی | هۆڵاندی |
|---|---|---|---|---|---|
| هیچ | ٢٧ | ٥٠ | ١٢ | ٥ | ٠ |
| سەرەتایی | ٤١ | ٣١ | ٢٤ | ٢٢ | ٢٢ |
| خوێندنی پیشەیی نزم LBO | ٨ | ٦ | ١٧ | ٢١ | ١٩ |
| خوێندنی پیشەیی ناوەندی VMBO | ١٠ | ٥ | ١٧ | ١٥ | ١١ |
| خوێندی پیشەیی دواناوەندی MBO | ٤ | ٢ | ١٣ | ١٢ | ١٢ |
| خوێندنی ئامادەیی گشتی HAVO | ١ | ٢ | ٤ | ٥ | ١٤ |
| خوێندنی ئامادەیی تایبەتمەندی VWO | ٤ | ٢ | ٢ | ٣ | ٥ |
| ئامادەیی پیشەیی باڵا HBO | ٢ | ١ | ٨ | ١٣ | ١٨ |
| خوێندنی باڵای تایبەتمەندی WO | ١ | ١ | ٢ | ٦ | ٩ |

ئەگەر بەووردی سەرنجی خشتەکە بدەین ئەوا بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە ڕێژەی نەخوێندەواری لە نێو هۆڵاندیەکاندا سفرە ( واتە نییە) لە کاتێکدا لەنێو هەردوو پێکهێنەرە سەرەکیەکەی ڕەوەندی ئیسلامی زۆر بەرزە، مەغریبی بە ڕێژەی ٥٠% و تورک بەڕێژەی ٢٧% ، بە پێچەوانەوە بە بەراوورد بە هۆڵاندیە ڕەسەنەکان سەیر دەکەین ئاستی خوێندەواری و دبلۆما لە نێو ڕەوەندی بێگانە بەگشتی و ڕەوەندی ئیسلامی بەتایبەتی زۆر نزمترە.

هۆیەکی دیکەی بەرزی ڕێژەی بێکاری لە نێو ڕەوەندی ئیسلامی و بێگانەکاندا لە هۆڵاندا بریتیە لە جیاوازی بەهای دبلۆماکانی وڵاتانی دیکەو هۆڵاندا، زۆربەی ئەو بێگانانەی کە دبلۆمای وڵاتی خۆیان هەیە لێرە نەک دبلۆماکانیان بە هەمان بەهای وڵاتی خۆیان سەیر ناکرێت بەڵکو دەبێت دیسانەوە ئەم دبلۆمایە بەراوورد بکرێت و بکرێتەوە بە دبلۆمای هۆڵاندی ئەم کارەش پێویستی بە خوێندن و فێر بوونی زمانێکی بەهێز دەبێت وێرای ئەوەش کە زۆر جار پارەیەکی زۆری دەوێت.[١٨]

ئەم گرفتانە وادەکەن کەسانێکی زۆری خاوەن دبلۆما نەتوانن لە بواری شارەزایی خۆیاندا کار بکەن، یاخود لە ڕوی دەرونیەوە ئامادە نەبێت کارێک بکات کە لە ئاستی دبلۆماو تواناکانی خۆیدا نایبینێت.

لەم خشتەیەی خوارەوەدا ئاستی کارەکانی بێگانە لەچاو هۆڵاندیەکاندا دەخەینە ڕوو

سەرچاوە: Jaar boek minderheiden 2001 SPVA

ئاستی کاری بێگانەکان لە چاو هۆڵاندیە ڕەسەنەکاندا

| ئاستی کار | تورک | مەغریبی | سورێنامی | ئەنتالی | هۆڵاندی |
|---|---|---|---|---|---|
| لانی کەمی پێویست | ٣٦ | ٤٠ | ١٩ | ١٦ | ٧ |
| نزم | ٣٣ | ٣٠ | ٣٥ | ٢٤ | ٢٧ |
| مام ناوەندی | ٢٥ | ٢٥ | ٣٤ | ٣٧ | ٣٥ |
| بەرز | ٦ | ٥ | ١١ | ١٩ | ٢٤ |
| زانستی پێشکەوتوو | ٠ | ١ | ٢ | ٤ | ٧ |

بە هەمان شێوەی چاوەڕوان کراو سەیر دەکەین کە هەتا بەرەو ئاستە نزمەکانی کار کردن بڕۆین ڕێژەی بێگانەکان زیاد دەبن و هەتا لە ئاستە

بەرزەکانیش نزیک بینەوە ڕێژەی بێگانەکان کەم دەبێتەوە، ئەمەش بۆخۆی وادەکات کە هەمیشە وێنەی ڕەوەندی ئیسلامی بەتایبەت و بێگانە بە گشتی لە مەڕ کاردا وێنەیەکی نەخوازراو بێت.
دۆزینەوەی کارەکەش بەو ئاستە هێشتا ئاسان نی یە چونکە ئەو مەرجانەی بۆ کار پێدان لە کەسێکی بیانی داوا دەکرێت لە زۆرترین حاڵەتدا هەمان ئەو مەرجانەن کە لە کەسێکی هۆڵاندی داوا دەکرێت، ئەمەش وادەکات دیسان کەسێکی بێگانەی خاوەن دبلۆما ماوەیەکی زۆر بە شوێن دۆزینەوەی کارێکی گونجاودا وێڵ بێت.
گرفتی خوێندن تەنها ئەوکەسانە ناگرێتەوە کەلە وڵاتی باوک خوێندنیان تەواو کردووەو پاشان دێنە هۆڵاندا بەڵکو هەموو ئەوانەش دەگرێتەوە کە لێرە لەدایک دەبن یاخود لێرە خوێندن دەست پێ دەکەن، بەڵام ڕێگر لەبەردەم ئەم تەرزە لە لاوان بریتی نییە لە بیروکراسیەتی حکومەتی
هۆڵاندا بەڵکو بریتیە لە چەندین هۆ کە زۆربەی هەرە زۆری بۆ خودی کۆچ بەران دەگەڕێتەوە.
سەرەکی ترین هۆی ئەمەش بریتیە لەوەی کە زۆربەی بێگانەکان ماوەیەکی درێژیان پێویست دەبێت تا دڵنیادەبن کە ئیتر ناڕۆنەوە بۆ وڵاتی خۆیان یاخود (دەرناکرێن !) ئەگەر پەنابەر بێت، یان کۆچ دەکەن بۆ وڵاتێکی دیکە، ئەم هەڵواسراوی و دڵە ڕاوکەیە لە نێوان وڵاتی باوک و وڵاتی دووەم دەبێتە هۆی ئەوەی کە نەوەکانیان نەتوانن بڕیاری ڕاستەوخۆ بدەن و لەم وڵاتەو بەزمانی ئەم وڵاتە خۆیان ڕابێنن. نەبوونی پشتگیری و هاندان لە نێو خودی خێزان و دۆست و هاوڕێیانی ئەوکەسەی کە دەیەوێت لەم وڵاتە بخوێنێت و پێشکەوێت وێڕای ئەوەش نەبوونی زانیاری تەواو لەسەر سیستەمی خوێندن لەم وڵاتە وادەکات کە دایک و باوکیش نەتوانن بە شێوەیەکی تەواو یاخود گونجاو ڕوڵەکانیان بۆ خوێندنی باڵا ئامادەبکەن.
کلتوریش بۆخۆی ڕۆڵێکی دیکە دەبینێت لە پێشنەخستن یاخود لە ڕاگرتنی تواناکانی لاوانی بێگانە ، ئەو خوێندنانەی کە لەوڵاتی یەکەم سوودی نییە یاخود بێ نرخە، ئەو خوێندنەی لەگەڵ ئایین و کەلەپوری ئەواندا ناگونجێت، خوێندنێک کە پێویستی بەوەیە ماوەیەکی درێژ لە دەرەوەی وڵات بیت ..هتد هەموو ئەم هۆیانە بۆ کچان و کوڕانی بێگانە یان دەبنە هۆیەک بۆ وازهێنانی زوو لە خوێندن و یان خوێندنیان تا ڕادەیەکی مام ناوەندی زیاتر نەبێت.

یەکێک لەو گرفتە گەورانەی ئەمڕۆ دووچاری حکومەتی هۆڵاندا دەبێت، کێشە بۆ ئاوێتە بوون دروست دەکات بریتییە لە واز هێنانی ژمارەیەکی بەرچاو لە خوێندەڤانی بێگانە لە خوێندن و کەوتنە سەر جادەیان.

هۆیەکی دیکەی بێکاری لەنێو بێگانەکاندا بریتییە لە جیاوازی کردن و Discrimination ڕەگەزپەرستی، ئەم هۆیە زۆر بە ئاشکرا لەنێو کارگەو کارخانەو فەرمانگاکاندا دەردەکەون[١٩]، ئەو دەمەی کەسێکی هۆڵاندی داوای کار دەکات کانسێکی زۆرتری هەیە لە کەسێکی دیکەی هۆڵاندی کە بەڕەگەز بێگانەیە و هەمان شارەزایی و مەرجی کاری هەیە. زۆر جار بەر لەوەی خاوەنکار چاوی بەو کەسە بکەوێت کە داوای کارەکەی کردووە تەنها لە جۆری ناوەکە ( ئەگەر بزانێت داخوازیکار ناوەکەی هۆڵاندی نییە) بە نامە یاخود بە تەلەفۆن وەڵامی نەگەتیف وەردەگرێت[٢٠]

دیارە هۆڵاندیەکانیش بەڵگەی خۆیان هەیە بۆ ئەوەی کەسێکی دیکە لەوی دیکە بە پەسەند تر بزانن کە ئەمەش زۆر جار ( بە ووتەی خاوەنکارەکان) دەگەڕێتەوە بۆ چەندین هۆی تایبەت بە بەرژەوەندی کۆمپانیاکە، بۆ نمونە ئەوان دەڵێن کەسێکی بێگانە سێ جار زیاتر لە کەسێکی هۆڵاندی نەخۆش دەکەوێت، یاخود دەڵێن کەسێکی بێگانە بنەماکانی کارکردن و خۆبەستنەوەی بە یاساکانی کارەوە کەمتر بەهەند وەردەگرێت وەک لە هۆڵاندیەک، دوواکەوتنی بەردەوام لەسەر کارو چەندین هۆی دیکەش دەکەنە بەڵگەی وەرنەگرتنی کەسی بێگانە چونکە هەموو ئەو هۆیانە پێکەوە دەبنە ئاکامی ئەوەی کە نرخی کەسێکی بێگانە بۆ خاوەنکار گرانتر بکەوێت لە هۆڵاندیەک.

ئەودەمەی باس لە شکستی ئاوێتە بوونی ڕەوەندی ئیسلامی و بێگانەکانی هۆڵاندا دەکەین ناکرێت ئاوڕ لە ڕێژەی تاوان نەدەینەوە، تاوان لە لێکدانەوەیەکی ئاساییدا وەک دیاردەیەک دەکرێت بڵێین هیچ کۆمەڵگایەک نییە ڕێژەیەکی دیاری کراوی تیادا نەبێت، چونکە تاوان بە هەموو جۆرەکانیەوە لە نێو تەواوی کۆمەڵگاکاندا دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیە، بەڵام لەنێو کۆمەڵگایەکی هەمەڕەنگ و فرە کلتوری وەک هۆڵاندا دەبێت لێکدانەوەکە ووردترکەینەوە، چونکە بەرزبونەوەی ڕێژەی تاوان لە نێو گروپێکی دیاری کراوی کۆمەڵگادا هەمیشە واتا ئەوەیە کە ئەو گروپە نەیتوانیوە بە پێ ی پێویست لەگەڵ کۆمەڵگای هۆڵاندا ئاوێتە بێت.

بە پێ ی لێکۆڵینەوەی سەنتەری زانستی ڤەکۆڵین و ئەرشیفکردن W.O.D.C سەربە وەزارەتی داوەری گشتی (Openbaar ministerie) ڕێژەی تاوان لە

هۆڵاندا لەنێو بێگانەکاندا زۆر زیاترە لە ڕێژەی تاوان لە نێو هۆڵاندیەکاندا، ئەم ڕاستیە هەمیشە زۆر بە ئاشکرا ناخرێتە ڕوو، ئەوکەسەی بیەوێت بزانێت کە ڕاستی ڕێژەی تاوان لە لایەن بێگانەکانەوە لە نێو هۆڵاندا لە چ بارێکدایە دەبێت خۆی زۆر ماندوو بکات، هەڵبەتە ئەمەش لەخۆڕا نییە چونکە هەندێک زیندان ( بە پێ ی ووتە ی چاودێران) جگە لە پۆلیس و فەرمانبەرەکان هۆڵاندی تیادا بەرچاو ناکەوێت...

لە باسکردنی ئەم بابەتەدا کۆمەڵێک خاڵی گرنگ دەکەونە بەر چاو:-

١- ڕەوەندی ئیسلامی زۆرترین ژمارەی تاوان ئەنجام دەدات.

٢- لە نێو ڕەوەندی ئیسلامیدا هەرچەندە ژمارەی مەغریبی پاش تورک دێت، کەچی ڕێژەی ئەو تاوانانەی کە ڕەوەندی مەغریبی ئەنجامی دەدات زۆر زیاترە لەوەی کە تورک ئەنجامی دەدات

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئاوێتە بوونی مەغریبی زۆر زیاتر لە پاش ئاوێتە بوونی تورکەوەیە.

٣- ڕێژەی تاوان لە نێو ئەندامانی نەوەی دووەم واتە ئەو بێگانانەی کەلە هۆڵاندا لەدایک بوون و تەنها بەکلتوری ئەم وڵاتە ئاشنان زیاترە لە ڕێژەی تاوان لەنێو ئەوانەی کە لەهولاندا لەدایک نەبوون ئەمەش بۆخۆی زەنگێکی زۆر مەترسی دارە.

ئەم خشتەیەی خوارەوەش ژمارەو ڕێژەی تاوانەکانی بێگانە(٢٠٠٢ ) لە هۆڵاندا دەخاتە ڕوو

سەرچاوە: www.heemland.nl/crimialiteitoderallochtonen

| ژمارەی تاوان | ئەوگروپەی ئەنجامی داوە | ڕێژەی تاوان |
|---|---|---|
| ١٤.٨٢٤ | سورێنامی | %٧،٣ |
| ١٢.٢٤٣ | مەغریبی | %٦،١ |
| ٨.٠٥٢ | تورک | %٤،١ |
| ٧.٩٨١ | ئەنتالی و ئەروبی | %٣،٩ |
| ١٩.٣٣٩ | گروپەکانی دیکەی بێگانە | %٩،٦ |
| ١٣٣.١٤٦ | هۆڵاندی | %٦٩ |
| ٦٢.٣٤٩ | کۆی گشتی تاوانی بێگانە | %٣١ |
| ٢٠٠.٤٩٥ | کۆی گشتی تاوان | %١٠٠ |

ئەو تاوانانەی سەرەوە هەمە ڕەنگن واتە هەموو ئەو تاوانانەش دەگرێتەوە کە دادگا ( بە سزادانی پارە ) تاوانبارەکەی حوکم داوە، دزین و

بازرگانی تلیاک و بازرگانی قاچاخ و کاری ڕەش(کاری نایاسایی ) و کوشتن، زۆرترین ئەو تاوانانەن کە بێگانەکانی تیادا دەستگیر کراون.
ساڵی ٢٠٠٣ نزیکەی ١٤ هەزار کەس لە زینداندا حوکم درابوون، لە کۆی ئەم ژمارەیە ٧.٧٠٠ کەس واتە بە ڕێژەی ٥٥% بیانی بوون[٢١]،ئەگەر زانیشمان کە بڕی تێچونی یەک کەس بۆ ماوەی ساڵێک لە زینداندا ٥٠ هەزار( یۆرۆ)یە کەواتە ساڵی ٢٠٠٣ بڕی ٣٨٥ ملیۆن یۆرۆ تەنها بۆ زیندانیە بێگانەکان تەرخان کراوە.
ڕەوەندی ئیسلامی زۆر جار بەرامبەر ئەم ژمارە بەرزەی تاوان نەک دەستەوەستان وەستاوە بەڵکو تاوانەکەشی دەخاتەوە ئەستۆی حکومەتی هۆڵانداو ڕاشکاوانە لەبەرنامە تەلەفزیۆنیەکاندا دەڵێن( هەمووی خەتای هۆڵاندیەکان) ە ئەگەر کردەوەی ڕەگەزپەرستی دژی ئێمە ئەنجام نەدەن و هەلی کاری گونجاو بڕەخسێنن و لە تەلەفزیۆنەکاندا تەنها وێنەی خراپ نیشان نەدەن ئەوە هیچ کەس ناچێت دزی یان تاوان ئەنجام بدات...مزگەوتەکانیش لە پرۆسەی ئاوێتەبووندا خراپترین ڕۆڵ دەگێڕن، لە هەندێک لەو مزگەوتانە هێشتا مەسەلەی حەلاڵ یان حەرام بوونی ئاوێتە بوون یەکلا نەبۆتەوە، وێرای ئەوەش هێندەی خۆیان بە کاری سیاسی یەوە سەرقاڵ کردووە خۆیان بە پەروەردە کردنێکی پۆزەتیفانەی ڕەوەندی ئیسلامی یەوە خەریک نەکردووە.
لە ڕستیدا مزگەوتەکان لە هۆڵاندا، بەهەمان شێوەی مزگەوتی دەوڵەتە ئیسلامیەکان کار دەکەن، بەڵکو زیاتریش بوونی دیموکراسیەت لەم وڵاتانەو ئاوەڵابوونی بەردەوامی دەرگای مزگەوتەکان بە شێوەیەکی بەردەوام بۆتە هۆی ئەوەی مزگەوت ڕۆڵیکی کاریگەری زیاتری هەبێت لەنێو ڕەوەندەکەدا، بەڵام لەبەرچاو نەگرتنی جیاوازی هەل و مەرج لە ئەوروپا لە هەل و مەرجی خودی وڵاتە ئیسلامیەکان، بەکارهێنانی دیموکراسیەت و چاوپۆشینی حکومەتە ئەوروپیەکان بۆتە هۆی ئەوەی کە ئەم خاڵە بە نەگەتف بەکار بێت و لە جیاتی ئەوەی مزگەوت بکرێتە شوێنی باشتر ئامادە کردنی ڕەوەندی ئیسلامی تا بتوانێت بەشداریەکی باشتر لەم کۆمەڵگایەدا بکات، دەبێتە هۆکاری ئەوەی کە زیاتر تاکی ڕەوەندی ئیسلامی لە کلتوری ئەو وڵاتەی کە تیایدا دەژی دابڕێت.
بە هەمان شێوەش ئەو دەوڵەتانەی کە خاوەنی ئەو ژمارە زۆرەی ڕەوەندی ئیسلامین نەیان توانیوە کاریگەریەکی باش بکەنە سەر ڕەوەندەکەیان و زەمینەیەکی گونجاویان بۆ فەراهەم بکەن تا بتوانن سوود لە پێشکەوتن و

توانای ئەو دەوڵەتانە وەربگرن، لەوەش خراپتر زۆربەی ئەندامانی ڕەوەندی ئیسلامی دژی دەوڵەتەکانی خۆیانن یاخود لە دەوڵەتەکانی خۆیاندا کەسانی چالاکی ئۆپۆزسیۆن بوون، بۆیە هەرگیز حکومەتەکانیان نەک ناتوانن کاریگەریان هەبێت لەسەریان بەڵکو فەرامۆشیش کراون.
لە بارودۆخێکی ئاوا نالەباردا ئیتر ئاوێتە بوون دەبێتە جێگای پرسیارو هەبوونی خودی ئەو ژمارە زۆرەی بێگانەش کە ناتوانن و ناخوازن ئاوێتە بن و بونەتە بارێکی قورس بەسەر ئەم وڵاتەوە کاری سیاسی و بڕیاری توندی پێویستە، کەلەمەودووا لە هۆڵاندا زۆر بە ئاشکرا بەدی دەکرێت.

## بەشی چوارهەم:-

### هۆڵاندای ئەمرۆ:-

ئەو ڕاستیانەی لە بەشەکانی پێشوودا باسیان لێوە کرا نابنە هۆی ئەوەی کە بڵێین ئاوێتە بوون لە هۆڵاندا بەتەواوی شکستی خواردووە، هەروەک چۆن دەتوانین بڵێین ئاوێتە بوون لەنێو هەندێک لە پێکهاتەکانی ڕەوەندی ئیسلامی شکستی خواردووە.

لە نێو مەیدانە جیاوازەکانی کارکردن و بوارە هەمە ڕەنگەکانی ژیاندا کارێکی شیاوە گەر کۆمەڵگای هۆڵاندی شانازی بە ژمارەی ئەو بێگانانەوە بکات کە زۆر سەرکەوتوانە خزمەتیان بە تەواوی پێکهاتەکانی کۆمەڵگای هۆڵاندی کردووە.

سەیرێکی خێرای ڕووداوەکانی ڕۆژانەو خوێندنەوەیەکی سەرپێیانەی ڕۆژنامەو گۆڤارەکان ئاشکرای دەکات کە درزی نێوان هۆڵاندی ڕەسەن و ناڕەسەن ( هۆڵاندی و بێگانەکان) تابێت زیاد دەکات و ئاوێتە بونیش تا بێت زیاتر لە ئامانجەکانی خۆی دوور دەکەوێتەوە. هۆڵاندیەکان

هەست بە ئاسایش ناکەن و تادێت ترسیان لە ئیسلام زیاد دەکات، بەرامبەر بە ڕەوشی ئەمڕۆی شارە گەورەکانیان کە پڕ بووە لە بیانی نیگەرانن. زۆربەی گرفت و کێشە و نەهامەتیەکانیان دەخەنە ئەستۆی بێگانە بەگشتی و ڕەوەندی ئیسلامی بە تایبەتی.

کلتوری کۆچ بەرەکان کاریکی زۆری کردۆتە سەر هۆڵاندا، زۆربەی هۆڵاندیەکان پێ یان وایە کە کلتوری خۆیان کەوتۆتە بەر هەڕەشەی کلتوری ڕۆژهەلاتیی بێگانە، هەر لەسەر جادەوە دەڕوانن تادەگەنە شوێنی کار و ناو ماڵی خۆیان، هۆڵاندا لەبەر چاویاندا وەک جاران نەماوە، شەقامەکان جمەی دێ لە ئافرەتی سەرپۆش لەسەر و پیاوی ڕیشن، شارەکانیان پڕبووە لە مزگەوت و قوتابخانەی ئیسلامی، گەڕەکە مەغریبی و تورک نشینەکان تا بێت گەورەتر دەبن، چەندین ساڵ کاری ڕەش دەکەن وباج بە دەوڵە ت نادەن و لەپڕ دوکان و ریستورانت و هۆتیل دەکرن... کار بەوەشەوە ناوەستێت بەڵکو زمانی هۆڵاندیشیان کردۆتە ئامانج و ووشەو ئیدیۆمی خۆیان ئاخنیوەتە نێو فەرهەنگی هۆڵاندیەوە[٢٢].

بەرامبەر بەوەش ڕەوەندی بێگانە بەگشتی و ئیسلامی بە تایبەتی تابێت زیاتر لە نێو کۆمەڵگای هۆڵاندیدا نامۆ دەبن، ئەو نەوەیەی لێرە لەدایک دەبێت زیاتر دژایەتی کلتور و کۆمەڵگای هۆڵاندی دەکات وەک لەوەی کە لێرە لەدایک نەبووە یاخود بەشێکی تەمەنی لە وڵاتی خۆی بەسەر بردووە، لۆیاڵ بوون و دڵسۆزیان بۆ ئەو وڵاتەی کە پاسپۆرتی هەڵدەگرن( واتە هۆڵاندا) زۆر لاوازە. کۆبونەوەی ڕەوەندی ئیسلامی لە گەڕەکی تایبەت و زیاد بوونی لە ڕادە بەدەری مزگەوتەکان و قوتابخانە ئیسلامیەکان هەموو ئاماژەن بۆ ئەوەی کە ئەو ڕەوەندە نەک نەیتوانیوە ئاوێتە ببێت لەگەڵ کۆمەڵگای هۆڵاندیدا بەڵکو لە نێو خودی کۆمەڵگاو ڕەوەندەکەی خۆیاندا قەتیس ماون.

ئەو تێکەڵاویە کەمەی لە نێوان ڕەوەندی ئیسلامی و هۆڵاندیەکاندا ڕوو دەدات زۆر جار لەبەرژەوەندی هۆڵاندا نی یە و تەنانەت لە بەرژەوەندی سیاسەتی ئاوێتە بونیشدا نیە، زۆربەی ئەو ئافرەتە هۆڵاندیانەی خێزان لەگەڵ کەسێکی ڕەوەندی ئیسلامی پێک دێنن بە تایبەت ( ئەگەر ئەو کەسە موسڵمانێکی پراکتیکی بێت) ناچار دەبن سەرپۆش لەسەر کەن و بە جلی موحەجەبەی ئیسلامیەوە دەرکەون، تەنانەت ئەو پیاوانەشی کە کچێکی موسڵمانی پێشکەش دەکرێت بەهەمان

شێوه دەبێت توند خۆیان به ئایینی ئیسلامەوه ببەستنەوه[٢٣] بەرامبەر ەمەش دەبێت چەندین موسڵمان کە ئایینی خۆیان وازلێ دێنن یاخود دەبنه مەسیحی نەک ناوێرن به ئاشکرا لەسەر تەلەفزیۆن دەرکەون بەڵکو لەکاتی ئاشکرابوونیشیان هەڕەشەی کوشتنیان لێ دەکرێت.[٢٤]

**ترس لە ئیسلام:-**

ئیسلامۆفۆبیا یاخود ترس لە ئیسلام دیاردەیەکی ئاشکرای نێو کۆمەڵگای ئەوروپایەو ڕاشکاوانه قسەی لەبارەوه دەکرێت، ترس لە ئیسلام لە پاش ڕووداوەکانی ١١ سێپتێمبەرو ١١ ئازاری مەدرید و ٧ ی یولیۆ ( گەلاوێژ ) ی لەندەن به شێوەیەکی بەرچاو زیادی کردووه، تاکه سەرچاوەی ئەم ترسەش تەنها کردەوه تیرۆریستیەکان نی یه بەڵکو مەسەلەی جیاوازی نێوان کلتورو نەریت دەوری باڵا دەبینێت، هەر ئەم هۆیەش لە پشت زیندوو بونەوەی تەوژمی دژ به بێگانه و ڕاست ڕەوییه، وێرای ئەوەی کە ئیسلامی سیاسی لەنێو هۆڵاندادا هێشتا کردەوەیەکی ئەوتۆ تیرۆریستیانەی هاوشێوەی ئەوانەی سەرەوەی ئەنجام نەداوه بەڵام ترس لە ئیسلام لەنێو کۆمەڵگای هۆڵاندیدا دوو هێندەی ئەو ترسە یە لە چاو ئیسپانیەکان و ئیتالیەکان.
ساڵی ٢٠٠٤ سەنتەری لێکۆڵینەوەی ( NIPO ) لە ڕاپرسیەکدا بۆی دەرکەوت که تەنها ١٩%ی هۆڵاندیەکان هەبوونی موسڵمان لە هۆڵاندا به هەڕەشه نازانن، ڕێژەی ٦٧% ی هۆڵاندیەکان هیچ پەیوەندیەکیان بە موسڵمانانەوه نی یه و ڕێژەی ٥٠% ش دەڵێن هەرئەوەندەی گەڕەکەکەیان( ڕەش بێتەوه) واته بێگانەی تیادا دەرکەوێت ئەوان ماڵ دەگوێزنەوەو دەڕۆن.
هەمان سەنتەری لێکۆڵینەوه لە ماڵپەڕی بەناوبانگی( RTL nieuws ) ڕۆژی ٥-٨-٢٠٠٥ لە تازه ترین ڕاپرسی خۆیدا دەڵێت ( ٦٣% ی هۆڵاندیەکان داخوازی ئەوه دەکەن کە یاسایەک دژی لەبەر کردنی سەرپۆشی ئیسلامی و هەموو جل و بەرگێکی ئیسلامی هەموار کرێت، هەروەها ڕێژەی ٧٧% پێ ی خۆش نی یه ژنێکی موسڵمان بە سەرپۆشەوه ببێت به پۆلیس و ڕێژەی ٨١% یش دژی ئەوەن که داوەرێکی موسڵمان بە سەرپۆشەوه لە دادگادا کاریان بۆ بەڕێوه بەرێت).
میدیای هۆڵاندی زۆر جار ئاماژه بۆ ئەو ترسه دەکات و لێدوان و ڕیپۆرتاژ ساز دەکات ، پرۆگرامی تایبەتی بۆ تەرخان دەکات، لەو پرۆگرامانەدا باس

لەوە دەکرێت کە گەورەترین گرفت لەبەر دەم ئاوێتە نەبوونی ڕەوەندی ئیسلامیدا، ئایینی ئیسلام خۆیەتی چونکە ئەو ئایینە تا ئێستا کاریگەریەکی زۆری بەسەر وردەکاریەکانی ژیانی ئەو ڕەوەندەوە هەیە تارادەی ئەوەی تێکەڵاو کردنێکی زۆر لەنێو شێوازەکانی ژیانیاندا بەرپا بکات، ئەوانە زۆریان بڕوایان بەوە هەیە ئیسلام دەستورو یاساو کلتوریشیان بێت، بەرامبەر بەوەش هۆڵاندیەکان دەڵێن ئایینی ئیسلام ١٤ سەدە بەر لە ئێستا نوسراوە ناکرێت وەک یاساو دەستور بەکاربهێنرێت، خۆ ئەگەر پێیان خۆشە وەک یاساو دەستوری خۆیان بەکاری بهێنن ئەوە دەبێت لە وڵاتەکانی خۆیاندا ئەوە بکەن نەک لە ئەوروپا چونکە کۆمەڵگا ئەوروپیەکان دەمێکە ئایینیان لە دەوڵەت جیاکردۆتەوە.

ئەم تێنەگەیشتنەی ڕەوەندی ئیسلامی لە خراپ بەڕێوە بردنی پەیوەندیەکانی خۆی لە نێو ئەم کۆمەڵگایانەدا هۆیەکی دەرونیشی لە پشتەوەیە کە ئەویش ( گرێ ی خۆ بە لاواز زانین ) ە .

هەتا ڕەوەندی ئیسلامی خۆی بە لاواز بزانێت ئەوە زیاتر پاشەکشە دەکات بۆ ناو کلتورەکەی خۆی لەترسی بەرامبەرەکەی ( بێگانەیەکی مەسیحی بەهێز ) زیاتر خۆی لە پشتی ئایینەوە دەگرێت.

لە نێو خودی دەوڵەتە عەرەبیەکانیشدا هەمان ترس بوونی هەیە و هەموو وتەو هەنگاوەکانی ئەوی دیکە بە پیلان ناودەبەن.

ئەو دەمەی دەوڵەتە ئیسلامیەکان بەهێز بوون و گرێ ی خۆبەلاواز زانینیان تیادا دروست نەببوو هەتا ساڵی ١٤٩٢ لە ژێر سایەی خەلافەتی موسڵماناندا لە ئیسپانیا جولەکەو مەسیحی و موسڵمان باشترین شێوەی پێکەوە ژیانیان هەبوو، تەنانەت پاش دەرکردنی موسڵمان و جولەکەکان لە ئیسپانیا بەشێکی جولەکەکان بەرەو مەغرب ڕۆشتن و تائێستاش هەر لەوێن.

گرێ ی خۆبەلاواز زانین زۆر جار ڕەوەندی ئیسلامی والێ دەکات بەرامبەر هەنگاوە باشەکانی میدیاش دیسان هەڵوێستی خراپ بنوێنن، ئەو دەمەی ڕۆژنامەی(de Volkskrant) پاشکۆیەکی تەواوی خۆی بۆ خستنە ڕووی شێوازی جوانکاری لە هێڵکاری و نوسینی خەتی قورئاندا تەرخان کردبوو، لەلایەن کۆمەڵێک ڕێکخراوی ئیسلامیەوە شکاتی لێکرا گوایا ئەمە سوکایەتی یە بە قورئان چونکە ڕۆژنامە دەکرێت بە سفرەی خواردن و فڕە دەدرێت و دەبێت بە ژێر دەست و پێ وە! لە کاتێکدا لەم وڵاتانەدا هەرگیز ڕۆژنامە فڕە نادرێت بەڵکو مانگانە لەگەڵ کارتۆن و وەرەقەی دیکەدا کۆ دەکرێنەوە، وەک

ئەوەی هەرگیز لە وڵاتە عەرەبیەکان قورئان لەسەر ڕووپەڕی ڕۆژنامەکان نەنوسرێن یاخود هەرگیز ڕۆژنامە فڕە نەدرێت.
خۆبەلاواز زانین لەم بارەدا ناوەستێت بەڵکو ئیسلامی سیاسیش کە تێهەڵکێشی ڕەوەندەکە بووە دێتە سەر خەت و وێرای ئەو جیهادەی کە بە چەک ڕای گەیاندووە ئاستی داخوازیەکانیش بەرەو پێش دەبەن و داوای زیاتر دەخەنە ڕوو لەوانە:-
١-چەسپاندنی شەریعەتی ئیسلامی ! ( وەک ئەوەی تەواوی حکومەتە عەرەبی و ئیسلامیەکان ئەم کارەی ئەنجام دابێت و ئیتر نۆرەی دەوڵەتە ئەوروپیەکان بێت).
٢- لەبەر کردنی بۆرقا ( ئەو جلەی کە ڕژێمی تالیبان لە ئەفگانستان سەپاندبووی بەسەر ژناندا ) بۆ ژنان، لە کاتێکدا مەسەلەی حیجاب گفتو گۆی لەسەرە .
٣- بۆردی شەقامەکان ( بۆردی مروری سەرجادەکان )، ناوی شەقامەکان، ناوی شوێنە گشتیەکان بە عەرەبیش بنوسرێت!
هەموو ئەمانە وادەکەن کۆمەڵگای هۆڵاندی نەک تەنها دەست لەوە بشوات کە ڕەوەندی ئیسلامی چی دی هۆڵاندی نین و بەکۆمەڵگا نامۆن بەڵکو پەرچەکرداری زۆر توندیش بەرامبەریان بنوێنن کە لەمەودوا باسیان لێوە دەکەین...

## ڕەگەزپەرستی و توندو تیژی:-

ئەو ساتەی ئیتر کێشەکان دەبنە کێشەی هەموو هاوڵاتیەک هەر لە سەرجادەوە تا ژووری پەرلەمان بە چەندین شێوەی جیاواز گوزارشی لێ دەکرێت، ئەم گوزارش کردنە دەکرێت بە شێوەی سیاسی یاخود ئاخاوتن بێت، دەکرێت هەڵوێستی دەست وەشاندن و توندو تیژیش لە خۆ بگرێت.
جیاوازی کردن و هاوتاماەڵەنەکردن ( Discrimination ) یەکێکە لەو پەرچەکردارانەی کە هەردوولا بەرامبەر بە یەکتر ئەنجامی دەدەن، بەڵام مەرج نییە هەمیشە لێرەدا لایەنی دەست پێشخەر هۆڵاندی بێت یاخود بە پێچەوانەوە کەسێکی بێگانە بێت، بەڵکو هەردوو لا ئەم کارە دەکەن بەڵام زیاتر کاریگەری ئەم کارە بۆسەر بێگانەیە وەک لە هۆڵاندی چونکە زۆر جار

ڕوودەدات کە بەهۆی ئەم هەڵوێستانەوە بێگانە کاری دەست ناکەوێت یاخود کارەکەی لەدەست دەدات.

دەستوری هۆڵاندا بە ئاشکراوتوندو تۆڵ دژی ڕەگەزپەرستی و هاوتامامەڵە نەکردن هەنگاوی ناوە[٢٥]، یاساکانیش سزای هەموو ئەو کەس و لایەنانە دەدەن کە ئەم جۆرە کارانە ئەنجام دەدەن، بەڵام دیسانەوە ئەم دیاردەیە تازە بووەبە کارێکی ڕۆژانەی هێندە قێزەوەن کە زۆر بە ئاشکرا هەستی پێدەکرێت و تەڕو وشک پێکەوە دەسوتێنێت.

ساڵی ٢٠٠٠ لە تەواوی هۆڵاندا ٣٥٣٠ داوا تۆمار کراوەو ساڵی ٢٠٠١ یش ٣٩١٣ داوا تۆمار کراوە، بیرۆی دژ بە جیاوازی کردن و ڕەگەزپەرستی لە هۆڵاندا ساڵی ١٩٩٨ ڕای گەیاند کە لە ١٧ تا ٢٠ لەو کردەوانەی دژ بە بێگانە ئەنجام دەدرێت، تەنها یەک دانە تۆمار دەکرێت.

لـەم خـشتـەیـەی خـوارەوەدا کـردەوە ڕەگـەز پـەرسـتـیـەکـان و ئـەو گـروپ و کەسانەی بەرامبەریان ئەنجام دراوە نیشان دەدەین:

**Anti Discriminatie Bureaus en meld puntn, rapport 2001**
سەرچاوە:

| ناوی شار / هۆکاری ڕەگەز پەرستی | هۆکاری دژی سامی | کارکردن | باری خێزان | هۆکاری ڕەگەز | هۆکاری ئایینی | کەم ئەندامی | ڕەنگی پێست | تەمەن | هۆکاری ناسیونالستی | هۆکاری سیاسی | هۆکاری سێکسی | هۆکاری دیکە | بەگشتی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| Amterdam | ٥٢ | - | ٤ | ٣٢ | ٤٩ | ٧ | ٣٦٩ | ١٥ | ١٢ | - | ٩٤ | ٣١ | ٦٦٨ |
| Alkmaar | - | - | - | ٤ | ١٦ | ٧ | ١٢٧ | ٢ | - | - | ٢ | ٢٩ | ١٨٨ |
| Den Bosch | ٢ | ١ | - | ١ | ٧ | ٢ | ٧٨ | ٢ | ٢ | ٤ | ٣ | ١٢ | ١١٤ |
| Den Haag | ١٠ | - | ١ | ٧ | ٣٥ | ١١ | ٣٤٨ | ٢٧ | ٤ | ٣ | ٢٠ | ٢٨ | ٥٠٤ |
| Dordrecht | - | - | - | ١ | ٤ | ٣ | ١٢٢ | ٣ | - | - | ١ | ٦ | ١٤٠ |
| Enscheda | - | - | - | ٢ | ٣ | ٤ | ١٠٠ | ٢ | ١ | - | ٥ | ٧ | ١٢٥ |
| Leeuwarden | ٢ | - | - | ١ | ٢ | ١ | ٥٨ | ٢ | - | - | ٨ | ٢٥ | ١٠١ |
| Maastricht | - | - | - | ١ | ١ | ٢ | ٨١ | - | - | - | ٧ | ٦ | ٩٩ |
| Rotterdam | ١٥ | - | - | ١٦ | ٣٧ | ١٤ | ٣٧٦ | ١٤ | ٥ | ٢ | ٦٤ | ٨٠ | ٦٢٤ |
| Veenendaal | - | • | - | - | ٩ | ٢ | ٧٢ | ١ | - | - | - | ٨ | ٩٢ |
| Vlissingen | ٢٢ | - | - | ٦ | ٥ | ٣ | ٨٣ | ٤ | - | - | ٤ | ٩ | ١٤٦ |
| Zaandam | - | - | - | ٦ | ٧ | ١ | ٥٠ | ٢ | ١١ | ١ | ٣ | ١٣ | ٩٥ |
| شارەکانی دیکە | ١٨ | ٤ | ٢ | ٣٠ | ٥٣ | ٢٢ | ٤٤٧ | ٣٤ | ٢٣ | ٥ | ٤٢ | ١٨٨ | ٨٥٨ |
| بەگشتی | ١٢٢ | ٥ | ٧ | ٩٨ | ٢٣٠ | ٨٢ | ٢٤٥٤ | ١١١ | ٥٩ | ١٥ | ٢٥٨ | ٤٧٠ | ٣٩١٢ |

ئەوەی لەم خشتەیەدا سەرنج ڕاکێشە ئەوەیە کە لە شارە گەورەکانی وەک ئەمستەردام و ڕۆتەردام و دانهاخ زۆرترین ڕێژەی جیاوازی کردن و ڕەگەزپەرستی ڕوودەدات، هۆکاری ڕوودانی ئەم کردەوە ڕەگ،ڕپەرستانەیە لە بەرزترین ڕێژەدا لەبەر هۆکاری ( بنەڕەت - ڕەچەڵەک ) ڕەنگی پێست واتە ( ڕەش یان سپی یان ئەسمەر) ئەنجام دراون. ئەو هۆکارانەش لێرەدا تەنها بێگانەکان دەگرێتەوە، ئەو بێگانانەی کە زیاتر لە ئاسیاو ئەفەریقاوە هاتوون چونکە بێگانەکانی دیکە بە تایبەت ئەوروپای ڕۆژهەڵات و ڕوسیا نە پێستیان ڕەشە نە موو، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کردەوە ڕەگەزپەرستیەکان زیاتر ڕەوەندی ئیسلامی دەگرێتەوە، ئەم کارە ڕەگەز پەرستیانانەش کەمترین حاڵەتیان تیادا تۆمارکراوە،بە پێ ی زانیاریەکانی هەمان سەرچاوەی ناوبراو لە کۆی ١٧ کردەوەدا تەنها یەک کردەوە تۆمارکراون ، ئەو حاڵەتانەشی تۆمار کراون تەنها ئەو حاڵەتانەن کە نەگەشتۆتە ڕادەی توندو تیژی چونکە لەو حاڵەتانەدا پۆلیس و ئاسایش دۆسیەکە دەگرنە دەست.

کردەوە ڕەگەز پەرستیەکان زۆر جار بکەرەکەی دیارەو لە ڕێگای ڕەفتارێکەوە یاخود ئاماژەیەکەوە یاخود زۆربەی جاریش هەر وەک لەفەرمانگە و شوێنە فەرمیەکانی دەوڵتدا ڕوو دەدەن کار ئاسانی بە بیانی پێشکەش ناکرێت و بە ناوی یاساو پەیڕەو کردنی یاسادا دژایەتیەکی زۆری بێگانە دەکرێت و کارەکانی بۆ جێبەجێ ناکرێت.

هەندێک جار کردەوەکان بکەرەکانیان نادیارە و نازانرێت چ کەسێک ئەنجامی داون بۆ نمونە لە ئەمستەردام بە نوسینێکی گەورەو جوان لەسەر دیواری ماڵەموسڵمانێک دەنوسرا ( بنکەی سەرکرداتی تاڵیبان)، یاخود لە سەر دیوارو دەرگای ماڵە موسڵمان جنێوی سوک یاخود ( مردن بۆ ئیسلام ) دەنوسرێت، یاخود ئۆتۆمبیلی تورکێک لە شارێکی وەک **Enschede** بە (پاشەڕۆکی سەگ) پیس دەکرێت... هتد.

پەرچە کردارەکان دژ بە بێگانە و بەتایبەت دژ بە ڕەوەندی ئیسلامی لەم ئاستەدا ناوەستێت، بەڵکو پەرە دەسێنێت و شێوازی توندو تیژو هەڕەشە ئامێز لە خۆ دەگرێت.

ساڵی ٢٠٠١ پاش ڕووداوەکانی ١١ی سێپتەمبەر لە تەواوی ئەوروپاو هۆڵاندا کردەوەی دژ بە ئیسلام و ڕەوەندی بێگانە بە گشتی ڕووی لە زیاد

بوون کرد، لە هۆڵاندا لەماوەی نێوان دوومانگ و نیوی پاش ڕووداوەکە( ١٩٠) ڕووداوی دەستدرێژی دژ بە ڕەوەندی ئیسلامی و بێگانە ئەنجام درا.
پاش ڕووداوی کوشتنی هونەر مەندی دەرهێنەری سینەمایی( تەیو ڤان خۆخ) ڕۆژی ٢-١١-٢٠٠٤ دیسانەوە هەستی دژ بە ڕەوەندی ئیسلامی بەرەوی سەندو ١٧٤ کردەوەی توندو تیژ دژی ئەنجام درا( بڕوانە خشتەکەی خوارەوە ) کە بەشی هەرە زۆری دژ بە ڕەوەندی ئیسلامی بوو، بەشێکی کەمیشی لە لایەن ڕەوەندی ئیسلامیەوە دژ بە هۆڵاندا ئەنجام درا.

سەرچاوە ڕۆژنامەی **metro 16-12-2004**:

| جۆری کردەوە | ژمارە |
|---|---|
| هەڕەشەکردن | ٤١ |
| ئاگرتێبەردان | ٣٦ |
| پیسکردن و بۆیە کردن | ٢٨ |
| شکاندن و زیان پێ گەیاندن | ٢٣ |
| ڕووبەڕووبوونەوە | ١٨ |
| توندو تیژی ئەنجام دان | ١٢ |
| پوچەڵکردنەوەی بۆمب | ١١ |
| هێرشی بۆمبی | ٤ |
| کوشتن | ١ |
| کۆی گشتی | ١٧٤ |

هەروەک لە خوێندنەوەی خشتەکەدا بۆمان دەردەکەوێت لە نێوان بێگانەکان( بە تایبەت ڕەوەندی ئیسلامی ) و هۆڵاندیەکان شەڕێکی ئاشکرا بەڕێوە دەچێت، دەرئەنجامەکانی ئەو شەڕەش هەروەک لە برگەی ( ئاگرتێ بەردان) دا دیارە جگە لە سوتاندنی ١٥ مزگەوت و قوتابخانەی ئیسلامی، سوتاندنی چەندین کەنیسەشی لێ کەوتەوە. کار بەوەشەوە نەوەستا بەڵکو بۆمب و چەکی قورسیش هاتنە بەکارهێنان هەموو ئەمانەش ئامازەی ئەوەیە کە ئەندامانی هەردوو بەرە زۆر باش خۆیان لە گروپ و کۆمەڵە تیرۆریستیەکاندا ساز داوە.
زانکۆی لایدن کە ئەو خشتەیەی سەرەوەی ئامادە کردووە، لە لێکۆڵینەوەکانی خۆیدا زیاتر ئامازە بۆ ڕۆڵی ڕێکخراوە ڕاست و

توندەڕەوەکانی هۆڵاندا دەکات کە ١٥% ڕێژەی هێرش و دەستدرێژیەکان بە ڕێوە دەبەن، بە پێ ی لێکۆڵینەوەکە نزیکەی ١٥٠٠ لە ئەندامانی ئەو ڕێکخراوانە زۆر چالاکن لە کردەوەکانیاندا دژی بێگانە بەگشتی و ڕەوەندی ئیسلامی بە تایبەتی.
ئەو ڕێکخراوانە کە لە دوو ساڵی پێشودا بە شێوەیەکی بەرچاو لە هۆڵاندا پەرەیان سەندووە، لاپەڕەی ئەنتەرنێت و ماڵپەڕی تایبەت بە خۆیان هەیە هەمان شێوەی گروپی( نازی تازە )ن کە لە زۆربەی ولاتانی ئەوروپا لە دژی بێگانە برەویان سەندووە[٢٦]، هەڵبەتە تەشەنە سەندنی بیروباوەڕی دژ بە بێگانەو ئیسلام تەنها لە هۆڵاندا بڵاو نیە، بەڵکو بگرە تائێستاش ناوبانگی هۆڵاندا وەک کۆمەڵگایەکی لە خۆ بووردوو وای کردووە ڕێژەی ئەنجام دانی کاری توندو تیژی دژ بە بێگانە ڕێژەیەکی زۆر کەمی هەبێت لەچاو ولاتانی دیکەی ئەوروپا.
ڕێکخراوە ڕەگەزپەرست و نازیە تازەکان بە شێوەیەکی بەرفراوان چالاکیەکانیان زیاد دەکات و تا بێت ئەندامانیشیان زۆر دەبێت، ڕووپەڕی ڕۆژنامەکان و هەواڵی تەلەفزیۆنەکان بەردەوام خۆپیشاندانی نازیە تازەکانی دنیاو ڕاست ڕەوەکانی هاوپەیمانیان دژی بێگانە و کۆچ بەرەکان نیشاندەدات و هێرشەکانیان بۆ سەر ئەو ئامانجانە لە برەوسەندندایە، لە هەندێک لە ولاتە ئەوروپیەکاندا کەسی بیانی لە پلەی دووەم و سێهەمی هاولاتی بووندا دێت.
سەرباری ئەوەی کە هۆڵاندا لە سالانی جەنگی دووەمی جیهانیدا لە بەر هێرشێکی دڕندانەی نازیەکاندا بوو کەچی هێشتا دەبینین لە هۆڵانداش بزوتنەوەی نازیە تازەکان بوونی هەیە و هاوپەیمانە لەگەڵ نازیە تازەکانی ئەڵمانیا، تا ئێستا ڕێکخراوی ڕەگەزپەرستی و نازی بە پێ ی یاساکانی ئەوروپا قەدەغەن و ماوەی کاریان پێ نادرێت، بەلام ئەو ڕێکخراوانە توانیویانە زۆر بە باشی بوونی خۆیان بپارێزن و ئەنتەرنێت و ماڵپەڕەکان بکەنە سەنگەری خۆیان ، تەنها بە زمانی ئەڵمانی نزیکەی ٢٠٠ ماڵپەڕ بە ناوی ( هایل هتلەر) گۆرانی بە بالای هتلەرو نازیەتدا هەڵدەدات و ١٤٠٠ لاپەرەو ئادرەسی دیکەش هەن کە بانگەوازی نازیەت بلاو دەکەنەوەو کۆنفرانسی سەرتا سەری خۆیانی تیادا گرێ دەدەن.
ماڵپەڕی نازیە تازەکان چەندین ناوی تایبەت بە هتلەر و نازیەت و دژ بە سامیەکان و بێگانە لە خۆیان دەنێن و چالاکانە تارادەی نەخشە کێشان بۆ ئەنجام دانی کاری توندوتیژی کاردەکەن، لەم بارەوە ساڵی ١٩٩٨ پۆلیسی

ئەڵمانیا کەسێکی نازی دەستگیر کرد کە لە ڕێگای ماڵپەڕێکەوە بەناوی ( دەستەی قەڵاچۆکردنی داود ) ١٠ هەزار مارکی وەک پاداشت تەرخان کردبوو بۆ هەر کەسێک کە مامۆستایەکی چەپ بکوژێت، لە لێکۆڵینەوەکاندا دەرکەوت کە ئەو کەسە ئەندامە لە گروپێکی ئەوروپی بەناوی ( پێشەنگە نازیەکانی ئەوروپا ).

تەنها لە ئەڵمانیا کە بەهێزترین ڕێکخراوی نازی کاری تێدادەکات و ژمارەی ئەو ڕێکخراوانە ١٦٠ دەبێت،ساڵی ٢٠٠١ نزیکەی ١٠٥٥٠ کردەوەی دەستدرێژی و ساڵی ٢٠٠٢ نزیکەی ١١ هەزار کردەوەیان ئەنجام دا‌وە.

هەموو ئەو کارە توندو تیژانەی ئەم گروپانە ئەنجامی دەدەن لە پاشاندا بەرپرسیاری خۆیانی لێ ئاشکرا دەکەن هەر وەک چۆن لە ساڵی ٢٠٠٠ هەستان بە سوتاندنی کامپێکی پەنابەران لە شاری لۆزانی سویسرا. لەوڵاتانی دیکەی ئەوروپاشدا لەوانەش نەمساو فەرەنساو دانیمارک و سوید و سویسراو بەلژیکا سەدان ماڵپەڕی هاوشێوە هەنە کە ساڵانە نەخشەی سەدان هێرش بۆسەر بێگانەو جولەکەو چەپەکان دادەڕێژن. لە هۆڵاندا ئەمانە کە ژمارەیان بە ١٥٠٠ کەس مەزەندە کراوە، بە زۆربەی کارەکانی وەک سوتانی مزگەوت و هێرش بۆ سەر قوتابخانەی ئیسلامی و گڕ تێ بەردانی و هەراسان کردنی بێگانەکان بە نوسین و هەڵسوکەوتی نەشیاو هەڵدەستن.

ئەم ڕێکخراوانە کە لە ڕووی دارایی یەوە دەوڵەتمەندن، ساڵانە هەزاران بڵاوکراوەو ( سی دی ) ی تایبەت بە خۆیان بە خۆڕایی بەسەر ئەندامەکانیاندا دابەش دەکەن، گۆرانی بێژو تیپی مۆسیقای تایبەت بە خۆیان هەیە، سەردانی ڕاسترەوی نەمسا ( هایدەر ) بۆ لای دکتاتۆری پێشووی عیراق سەدام حسێن لە خۆڕا نەبوو چونکە نازیەکان لە تەواوی دنیادا وێنەی هتلەرو سەدام پێکەوە هەڵدەواسن[٢٧]،لە چەندین پایتەختی دنیادا باشترین پەیوەندیان لەگەڵ باڵوێزخانەی عێراق دروست کردبوو تەنانەت لە زۆر ڕۆژنامەو ڕاگەیاندنیشدا قسە لەسەر ئەوە دەکرا کە چەندین ڕێکخراوی نازی لە پشت ناردنی چەکەوە بووبن بۆ سەدام حسێن.

برەو سەندنی نازیە تازەکان و بزوتنەوە ڕایسیستەکانی ئەوروپا کار لە یەکتر دەکەن هۆڵاندا سنورێکی درێژی لەگەڵ ئەڵمانیادا هەیە ئەمەش وای کردووە هاوکاری هەماهەنگی نێوان گروپە نەژادپەرستەکان و دژ بە بێگانەکان ئاسان تر بێت، ئەو دەمەی نازیە تازەکانی هۆڵاندا خۆپیشاندان و چالاکی ئەنجام دەدەن، نازیەکانی ئەڵمانیا کە هەمیشە سەری خۆیان سفر

تاشیوە دێنە هاوکاریان، وێرای ئەوەش لە پەیڤ و ئەدەبیات و بۆچونیاندا سوود لە یەکتر وەردەگرن.

هەرچەندە ( پارتی ناسیۆنالستی تازە- Nieuwe nationale Partij NNP ) کە بە یەکێک لە پارتە ڕاست ڕەوە ڕەگەز پەرستەکان دەژمێردرێت زۆر چالاک نی یە و ژمارەی ئەندام و لایەنگرانی دیاری کراوە، بەڵام ڕێکخراوی گەلی هۆڵاندا ( Nederlandse Volks Unie N V U ) کە لەسەر تۆڕی ئەنتەرنێت چەندین ماڵپەڕی هەیە و لە نێو هۆڵانداشدا چەندین بڵاوکراوەی هەیە یەکێکە لە ڕێکخراوە ڕاست ڕەوەکان کە زۆر ئاشکرا لە بەرنامەکانی خۆیدا دژایەتی بێگانە دەکات و لە یەکێک لە بڕگەکانی بەرنامەکانیدا زۆر ڕاشکاوانە داوای داخستنی تەواوی مزگەوت و پەرستگای هندۆسەکان دەکات، وێرای ئەوەی کە لە بەندی یەکەمی خۆیدا ڕاستەوخۆ دژ بەوەیە کە چی دی بێگانە بێتە وڵات و داخوازی دەستبەجێ ڕاگرتنی کۆچ و مافی پەنابەری دەکات.

ئەمڕۆ ئیتر لەتەواوی هۆڵاندا کێشەی بێگانەکان بە تایبەت کێشەی ئیسلامی سیاسی و ڕەوەندی ئیسلامی بۆتە گفت و گۆی ڕۆژانە، هۆڵاندیە ڕاست ڕەوەکان پێیان وایە کە چەپەکانی وڵاتیان دەستیان هەبووە لە دەرگاکردنەوەدا بە ڕووی ئەو هەموو ژمارەیەی بێگانەدا کە ڕوویان لەم وڵاتە بچوکە کردووە، پێیان وایە کە کلتوری ئەو بێگانانە خۆی بەسەر ئەوانیشدا سەپاندووە، بۆیە هەمیشە لە گفتوگۆی سیاسیداو لە کێشەکانی نێو خودی پارلەماندا ئەم باسە گەرمترین بابەتە کە ئیتر دوواخستن هەڵناگرێت، دەنگێکی سیاسی و یاسایی جیاواز لە دەنگی نایاسایی و ئاژاوە چی لە نێو خودی پارلەماندا بە زمانێکی پۆلەتیکی گوزارش لەو توێژانەی کۆمەڵگای هۆڵاندی دەکات کە داخوازیان ئەوەیە ( هۆڵاندا بدرێتەوە بە هۆڵاندیەکان ).

## ڕاستی تازە:

زۆربەی ئەو پارت و ڕێکخراوە چەپانەی ساڵەهایە ناو حکومەت یاخود دەرەوەی حکومەت لەژێر فشارێکی زۆری میدیاو ڕای گشتیدا نەبونایە هەرگیز وەڵامێکی ئەوتۆیان بەرامبەر بەو پرسیارە زۆرانە پێ نەبوو کە لەمەڕ زیادبوونی بێ ئەندازەی ژمارەی بێگانە و ڕەوەندی ئیسلامی ئاراستەی دەوڵەت دەکران بۆیە لەگەڵ تێپەڕ بوونی کات و زەق بوونەوەی

کێشەکاندا لە ژێر ناوی جیاوازو لیستی جیاوازدا ڕاستی تازە سەرهەڵدەدەن و بەرنامەکانی خۆیان دەخەنە ڕوو هەرچەندە لە خستنە ڕووی ئەڵتەرناتیڤدا لاوازن بەڵام گوێچکەی زۆر هەیە کە بۆیان قوڵاغ بووەو
دەنگیان دەداتێ، وێرای ئەوەش لە نێو خودی پارتە چەپ و لیبراڵەکاندا بەرنامەکان بەرەو ئەو ئاڕاستەیە دەبرێن کە وەڵامێک بن بۆ ئەو گرفتانە ی چی دی دوواخستن ناخوازێت.

## دیاردەی Pim Fortuyn

سەرهەڵدانی (فۆرتاین/ ١٩٤٨-٢٠٠٢ ) ئەو ڕووداوە بوو کە گۆمی مەنگی سیاسەتی لەنێو هۆڵانداو هۆڵاندیەکاندا شڵەقاند، ووتە بێژو ڕیش سپی تەواوی ئەو هۆڵاندیانە بوو کە چاوەڕێ ی مەهدی - یەکیان دەکرد لەدەست بێگانەو موسڵمانەکان ڕزگاریان کات..
فۆرتاین[٢٨] مامۆستای زانکۆ بوو، چەندین پارتی سیاسیشی تاقی کردبۆوە بەڵام لەبەر ئەوەی لەماوەیەکی زۆر کەمدا لایەنگرو ئەندامانی زۆر زیاد بوون بە تەنها خۆی لیستێکی بەناوی (لیستی فۆرتایین) پێک هێنا تا بەشداری لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ٢٠٠٢ دا بکات. هۆی سەرەکی پێشقەچونی ئەم پیاوە ڕاوەستانی ڕاشکاوانەی بوو بەرامبەر بە کلتورو ئایینی ئیسلام و زۆربوونی ژمارەی بێگانەو پەنابەران، بۆ هەموو ئەم بابەتانە بەڵێنی دەدا چارەسەری بنەبڕی بکات.
سەبارەت بە کلتور تێبینی زۆری هەبوو، ئەو پێکەنینی بەو هۆڵاندیانە دەهات کە دەیانگوت ( ئێمە ئیتر بڕوامان بە ئایین نەماوە) ، چونکە فۆرتایین ئایینی مەسیحی تەنها وەک ئایینێک سەیر نەدەکرد بەڵکو بەرامبەر بە کەم بوونەوەی بایەخی هۆڵاندیەکان بۆ کلتوری خۆیان نیگەران بوو، دەیگوت ( کەم بوونەوەی بایەخی کلتور بەهاکانی کۆمەڵگای هۆڵاندی لەکەدار دەکات) ئەو هەرچەندە مەسیحیەکی زۆر باوەڕدار نەبوو بەڵام شانازی بە مەسیحی بوونی خۆی( کاتۆلیکی ) دەکرد و دەیگوت ( ئەوە تەنها ئایین نیە بەڵکو کلتوریشە).
خاڵی سەرەکی بیرکردنەوەی فۆرتاین ئایینی ئیسلام بوو ئەو زۆر ڕاشکاوانە ڕەخنەی لە ئیسلام دەگرت و بە ئایینێکی پاش کەوتوو ناوی دەبرد، نامۆ بوونی کلتوری هۆڵاندای بە ئیسلام باس دەکرد و پێ ی وابوو کلتوری ئیسلام لە نێو کلتوری هۆڵاندا جێگەی نابێتەوە. خوێندنی ئیسلامی و قوتابخانەی ئیسلامی لەنێو دڵی کۆمەڵگای هۆڵاندی ( مەسیحی )دا بە

ناماقوڵ دەزانی، بانگەوازی داخستنی تەواوی قوتابخانە ئیسلامیەکانی دەکرد و دژی ئیسلامیزەکردنی کلتوری هۆڵاندا بوو، ئەو پێ ی وابوو کە (لە نێوان ئایینی ئیسلام و ئایینی مەسیحیدا هیچ بەراووردێک نی یە، ئایینی مەسیحی ئایینێکە دەمێکە لە دەوڵەت جیاکراوەتەوەو کراوەتە کاری شەخسی، کۆمەڵگاسکیولاریست – عەلمانی - کراوە بەڵام ئایینی ئیسلام ئایینێکی زۆر دوواکەوتوە موسڵمان تەنها خێمەیەک و تۆزێک خواردنی بەسە و هیچی تر ).

فۆرتاین لەگەڵ ئەوەدا بوو کە( پێویستە ئەوەی لەم وڵاتەدا دەژی ڕێزی بەها مەسیحیەکانی ئەم وڵاتە بگرێت دەنا دەبێت بڕواتەوە بۆ وڵاتی خۆی، قوتابخانەی ئیسلامیش دەبێت تەنها لە مزگەوتەکاندا بن نەک بە پارەی حکومەت هاوکاری بکرێن، ئەوکەسانەی سەدان ساڵە خەریکی دامەزراندن و بنیات نانی ئەم وڵاتەن ئەوانە مافیان زیاترە و قسەش دەبێت قسەی ئەوان بێت ).

تێزەکانی ئەم پرۆفیسۆرە بە ئاشکرا دژی ڕەوەندی ئیسلامی بوو چونکە بێ دوودڵی لە چاوپێکەوتن و نوسراوەکانیدا جیاوازی دەکرد لە نێوان ئایینەکانی دیکەی وەک جولەکەو کاتۆلیکی و پرۆتستانتی، ئەو کلتورانەی بە بەشێک لە کلتوری وڵات دەزانی ڕەخنەی توندی لە سیاسەتی ئاوێتە بوون دەگرت کە چاوپۆشی کردووە لە بێگانەکان و تا ئێستا زۆربەی هەرە زۆریان وێرای ئەوەی ماوەیەکی زۆرە لەم وڵاتەدان زمانی هۆڵاندی فێر نەبوون و لە نێو گەڕەکەکانیشدا کۆبوونەتەوەو بە شێوازی ئەستەنبول و مەغرب دەژین. هەروەها دژی ئەوە بوو کە پەنابەری ڕۆژهەڵاتی بە لێشاو ڕووبکەنە ئەم وڵاتەو تیایدا نیشتە جێ بن.

هەمیشە ڕەخنەی لە شێوازی مامەڵەکردنی لایەنە بەرپرسەکان دەگرت کە چەندین ساڵ پەنابەر گل دەدەنەوە بەبێ ئەوەی دەری کەن یاخود مافی بدەنێ بۆ ئەوەی زوو بەزوو بتوانێت زمان فێر بێت و کاربکات و بەشداری پۆزەتیفانە لە کۆمەڵگادا بکات، کەچی پەنابەران چەندین ساڵ دەخرێنە نێو کامپەکان و دەرامەتێکی زۆری دەوڵەت هەروا بە هەدەر دەڕوات.

فۆرتاین لە لایەن دۆست و دوژمنەوە بە ڕاستی و دروستی تێزەکانی نەخرایە بەر چاو، لایەنگرەکانی، ئەویان بە ( هایدەر) ی هۆڵاندا ناودەبرد، لەگەڵ وێنەی هایدەردا وێنەکەیان بەرز دەکردەوە، دوژمنەکانیشی لە چەپەکان ئەویان بە ڕاسترەوێکی نەژاد پەرست ناو دەبرد تا ڕۆژی ٦-٥-

٢٠٠٢ بەر لەوەی پرۆسەی هەڵبژاردنی پارلەمان ئەنجام بدرێت لە لایەن کەسێکی چەپەوە بەناوی ( Van der G ) تیرۆر کرا.
لە هەڵبژاردنەکاندا لیستی فۆرتاین ٢٦ کورسی لە کۆی ١٥٠ بەدەست هێنا، کە ئەمەش وەک یەکەم هەنگاو سەرکەوتنێکی گەورە بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی پاش خۆی هیچ کەس نەیتوانی میراتگری تێزەکانی بێت، پاش هەڵوەشاندنەوەی حکومەت و سەرلەنوێ ئەنجام دانەوەی هەڵبژاردن ئەم لیستە بە تەواوی تێکشکا.

## سەرهەڵدانی Wilders

دەتوانین بڵێین میراتگری بیرو بۆچون و جەماوەرەکەی فۆرتاین ئەندام پارلەمانی لاو (Geert.Wilders - ١٩٦٣ ) ڕۆژی ٢ ی سێپتەمبەری ٢٠٠٤ ئەم ئەندام پارلەمانە لە لیستی پارتەکەی خۆی ( VVD - پارتی گەلی ئازادی و دیموکراسی ) جیابۆوەو لە نێو پارلەمانی هۆڵاندا تەنها خۆی بە نوێنەرێکی سەربەخۆی پارلەمان مایەوە.
ئێستا ئەم ئەندام پارلەمانە ( کە قژی خۆی هەمیشە لە ڕەنگی زەرد – بلۆندی ئەوروپی – هەڵدەکێشیت) سەرقاڵی ئەوەیە کە لەگەڵ کۆمەڵێک ئەندامانی پێشوی لیستەکەی فورتایین پارتێک دروست بکات و ببێتە نوێنەری ئەوپەڕی ڕاست لە نێو پارلەماندا.
( وڵدەرز) مانیفێستی خۆی بەناوی مانیفێستی سەربەخۆیی ڕاگەیاندووە، لەم ڕاگەیاندنەدا بابەتی گرنگ کراونەتە پرۆژەی کاری داهاتووی ئەم گروپە، دۆزی ئاسایش لە وڵات ، بارودۆخی خوێندن، بیروکراسیەتی دەوڵەت، یەکیەتی ئەوروپا، تەندروستی و خزمەتگوزاری..) هەموو ئەو بابەتانەن کە ڕۆژانە لە پارلەمان گفتوگۆی لەسەر دەکرێت. بەڵام گرنگترین خاڵ لە مانیفێستی ئەم گروپەدا ڕووبەڕووی ڕەوەندی ئیسلامی و ئیسلامی سیاسی دەبێتەوە کە لە دوو خاڵدا یەکدەگرنەوە:-
١- زۆربوونی ژمارەی کۆچ بەری موسڵمان و ڕەوەندی ئیسلامی.
٢- ئاوێتە نە بوونی ئەو ڕەوەندەو هەنگاوی پێویست.
(وڵدەرز) لە پەیامەکانیدا زۆر ئاشکرا پەیڤەکانی خۆی ئاڕاستەی هەموان دەکات و ڕاشکاوانە دەڵێت ( هۆڵاندا نابێت بکرێتە دەوڵەتێکی ئیسلامی ) ، بە ئاشکرا دژی زیادبوونی ژمارەی کۆچ - بەرانی ڕۆژهەڵاتیە و کۆچ

بەرانی ڕۆژئاوایی بە کێشە نازانێت چونکە خۆی دەڵێت( کێشەکەمان لەگەڵ ئیسلامدایە، ئیسلام و دیموکراسی پێکەوە ناگونجێن، کلتوری ئێمە کلتورێکی مەسیحی - جولەکە - مرۆڤانەیە، جیاوازە لە کلتوری ئیسلام ).
چەندین جار لە چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەو گۆڤارو تەلەفزیۆندا پرسیارێک ئاڕاستەی ئەم سیاسەتمەدارە دەکرێت کە داخۆ ئەو بەم پەیڤانەی ڕەگەز پەرستی نانوێنێت بەوەی تەنها دژ بە کۆچ بەری ڕۆژهەڵاتیە؟ وڵدەرز لە وەڵامدا برگەی یەکەمی دەستوری وڵات دەکاتە بەڵگە و دەڵێت ( بەپێ ی دەستوری وڵات بۆ بابەتە هاوتاکان پێویستە مامەڵەی هاوتا هەبێت، بەڵام بۆچی ئەوانەی هاوتای ئێمە مامەڵە لەگەڵ یاساو بەهاکانی ئەم وڵاتەدا ناکەن پێویستە بە هاوتایی مامەڵە بکرێن؟).
ناوبراو دژی ئەوەیە کە قوتابخانەی ئیسلامی هەبێت و بانگەوازی داخستنیان دەکات، دژی ئەوەیە مزگەوتەکان بکرێنە بڵندگۆی توندڕەوەکان و داوا دەکات ئەو ئیمامەی بە پێ ی یاساکانی ئاوێتە بوون هەڵسوکەوت ناکات دەست بەجێ لە وڵات وەدەرنرێت، لە یەکێک لە گفتوگۆکانیدا ڕایگەیاند کە ئەگەر ئەو وەزیری ناوخۆبێت ئەوە دەست بەجێ بە خشت و چیمەنتو دەرگای مزگەوتەکان هەمووی دادەخات.
( وڵدەرز) نایەوێت هەموو موسڵمانەکان بکاتە دوژمنی خۆی چونکە ئەو باش دەزانێت کە زۆربەی هەرە زۆری ئەوانە هۆڵاندین و هەرگیز ناتوانێت هەرهەموویان دەرکات بۆیە لە ناڵیش دەدات و لە بزماریش بۆیە ئەم جارەیان لە وەڵامی پرسیاری ئەوەی کە داخۆ ئەو دژی ئیسلامە یان دژی ئیسلامی سیاسییە دەڵێت: ( کێشەی گەورەی ئێمە لەگەڵ ئیسلامی توند ڕەودایە، بێ گومان جیاوازی هەیە لە نێوان ئیسلامی سیاسی توندڕەو و ئەوانی دیکە کە توند ڕەو نین، بەڵام تەواوی ئەو هەنگاوانەی من دەمەوێت هەڵنرێت هەمووی دژی ئیسلامی توندڕەوە، لە بەرژەوەندی ڕەوەندی ئیسلامیشدایە چونکە ئەوانیش هەرهەموویان خراونەتە ناو قەفەزی تاوانەوە).
ڕێژەی تاوانەکان لە هۆڵاندا نەک تەنها بۆ ئەم سیاسەت مەدارە بەڵکو بۆ هەموو ئەوانەی دیکەش کە دەخوازن دەوڵەت لە دژی ڕەوەندی ئیسلامی هەنگاوی خێرا هەڵنێت باشترین بابەتە کە بووروژێنرێت، بە پێچەوانەی ڕاستیەکانەوە( کەلە بەشەکانی پێشوودا بە ژمارە ئامارژەمان پێ دا) ئەم سیاسەت مەدارە زۆربەی تاوانەکان دەخاتە ئەستۆی ڕەوەندی ئیسلامی و دەڵێت ( من نامەوێت کەس بریندار کەم بەڵام بڕوانە ڕێژەی زیندانەکان

٩٩% ی تاوان ئەو کەسانە ئەنجامی دەدەن کە لە کۆمەڵگا ئیسلامیەکانەوە هاتوون، ئەوکۆمەڵگایانەی ئیسلام تیایدا زاڵە کلتورێکی سیاسی پاشکەوتووی هەیە).

سەبارەت بە پەنابەرانیش وولدەرز هەرچەندە ئاگادارە کە ژمارەی پەنابەران بە رێژەیەکی زۆر گەورە دابەزیوە بەڵام جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە پەنابەران پێویستە هەرلە وڵاتی خۆیاندا پەناگای هێمنیان بۆ دابین بکرێت و یارمەتی بدرێن، بەڵام پەنابەرانی سیاسی ئەوانەی دەتوانن بیسەلمێنن کە هیچ پەناگایەکیان نەماوە ساڵانە دەبێت رێگا نەدەین لە ٥ هەزار کەس زیاتر مافی نیشتەجێ بوون وەرگرن. سەبارەت بە یەکیەتی ئەوروپاش تێبینی زۆرەو داخوازی ئەوەیە کە ئەو یەکیەتیە تەنها کاری ئازادی بازرگانی بکات و هەر وڵاتێکی ئەندامیش سەرقاڵی کاروباری ناوخۆی خۆی بێت، ئەو لەگەڵ ئەوەدا نی یە کە دەستورێک لە دەرەوەی هۆڵاندا بێت و بسەپێنرێت بەسەر وڵاتدا. لەمەڕ بوونە ئەندامی تورکیاش پێ ی وایە کە هەرگیز نابێت تورکیا بکرێتە ئەندام و ئەگەر شتی وا ڕوو بدات ئەوا هۆڵاندا دەبێت لە یەکیەتی ئەوروپا بێتە دەرەوە، بەم هەڵوێستەش ئیتر راسترەو بوونی ئەم گروپە دەگاتە لوتکە.

هەرچەندەسیاسەت مەداری ناوبراو وەک ( فورتاین ) گوتار بێژ نیە و لە مەیدانی سیاسەت و زانستی کۆمەڵایەتیدا زۆر سەرقاڵ نەبۆتەوە و خوێندنی یاساشی بە نامە( مراسله ) خوێندووە، بەڵام هەتا ئێستا توانیویەتی لانی کەم ووتە بێژی زۆربەی ئەوانە بێت کە داوای سنورێک بۆ رەنگاورەنگ بوونی وڵاتەکەیان دەکەن.

ئەم سیاسەت مەدارەکە دەیان جار هەرەشەی کوشتنی لە لایەن ئیسلامی سیاسیەوە لێکراوەو تا ئێستاش لە ژێر چاودێری توندی پۆلیسدایە، لە راپرسیەکدا کە ئەنجام درابوو ٣٠ کورسی لە هەڵبژاردندا بەدەست دەهێنا ئەگەر هەڵبژاردن ئەو دەمە لە ئارادا بوایە، بەڵام بەهۆی هەنگاو نانی پارتەکانی دیکەوە بەهەمان ئاراستە جەماوەری ئەم گروپە رۆژ لە دوای رۆژ کەمتر دەبێتەوەولە دووا راپرسیدا ١٨ کورسی بەدەست دەهێنا ئەگەر هەڵبژاردن لە ئارادا بوایە.

لە راستیدا هەمیشە گروپە راسترەوەکان لە رێگای خستنەرووی کێشەکانی کۆمەڵگاوە دەتوانن کار بکەنە سەر توێژە جیاوازەکانی کۆمەڵگا بە تایبەت ئەوانەی کە لە شارە گەورەکاندا دەژین و رۆژانە لەگەڵ گرفتەکاندا مامەڵە دەکەن، بەڵام هاوشێوەی لیستەکەی فۆرتاین کاتێ دێنە سەر باسی

پراکتیزەکردن و چارەسەرکردنی کێشەکان چەندین ئاستەنگ پەیدادەبن، ئەو دەمە نەک چارەسەرەکان دوادەکەون بەڵکو دەبنە هۆی نانەوەی پشێوی لە نێو خودی پارلەماندا هەروەک چۆن لیستی ڕاستڕەوەکان حکومەتەکە ی ساڵی ٢٠٠٢ یان هەڵوەشاندەوەو هەڵبژاردنی ئاییندەش بە شکستی تەواوی خۆیان کۆتایی هات. بەڵام هەتا ئیسلامی سیاسی و توندڕەو لە نێو ڕەوەندی ئیسلامیدا چالاک و دەنگ بیستراو دەست ڕۆشتوو بن، ئەگەری زیادبوون و سەرکەوتنی زیاتری ئەو ڕاستڕەوانە زیاتر دەبێت کە فشارەکانی توندڕەوی ئیسلامی و ڕێگرتنیان لە ئاوێتە بوون دەکەنە بەڵگەی بەرنامەکانیان و هەڵوێستی ئەندامە ئاوێتە بووەکانی ڕەوەندی ئیسلامیش کە پێگەی باشیان لە نێو کۆمەڵگادا هەیە لاوازتر دەبێت.

## یاخی بوونی کچە سۆمالیەکە:-

عەیان هێرسی عەلی( Ayan Hersy Ali ) لەدایک بووی ١٩٦٩ لە مەقادیشێو، بەرلەوەی خوشکە پەنابەرەکەی لە ئەوروپا توشی نامۆیی بێت و بڕیاری گەڕانەوە بۆ سۆمال بدات و پاشان لەوێ بە بیانووی ئەوەی کە شێت بووەو شەیتان چۆتە لەشیەوە لەژێر شەلاقی چەند مەلاو ڤاڵگرەوەیەکدا گیانی لەدەست بدات! بەر لەوە عەیان هێرسی تەنها( وەرگێڕ ) ێک بوو کاری بۆ سەنتەری وەرگێڕان دەکردو لە نێوان هۆلاندی و سۆمالیەکاندا دەبووە وەرگێڕی زمان.

عەیان لە ڕێگای وەرگێڕانەوە ئەندێشەی ئافرەتەکانی کۆمەڵگای خۆی باش هەڵسەنگاندبوو بەڵام بە کوژرانی خوشکەکەی ئیتر بڕیاری دا لە کلتوری ئیسلامی و کۆمەڵگاکەی خۆی یاخی بێت و لە بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنیدا هەرچی لەژێر بەرەی کۆمەڵگای ئیسلامی هەیە بیخاتە سەر بەرە.

ئەم کچە سۆمالیە هەر لەو شەوەوە و لەو بەرنامەیەوە سەنگەری لە ئیسلام و ئیسلامی سیاسی گرت و هەر لەو شەوەشەوە ئیسلامی سیاسی لێ ی کەوتنە هەڕەشە و بە نامەو فیشەکی نێو دوو توێ ی نامەکان بڕیاری کوشتنیان دا.

هێرسی عەلی ئەو دەمە تەنها ئەندامێکی ئاسایی بوو لە پارتی کرێکاران (PvdA) و داوای لە پارتەکەی کرد هەنگاوی پێویستی بۆ هەڵگرن بەرلەوەی

بەدەردەکەی فۆرتاین بچێت و تیرۆربکرێت بەڵام ئەو پارتە هەرەشەکانیان بە هەند وەرنەگرت و بایەخێکی ئەوتۆشیان بە گرفتەکەی نەدا بۆیە بڕیاری دا سەنگەر بۆ ناو پارتی لیبراڵەکان بگوێزێتەوەو هەر لە بڵند گۆی ئەوانیشەوە زیاتر دەمی خۆی بەرامبەر بە ئایینی ئیسلام و پێشێلکاری مافی مرۆڤ و ئافرەت گەرمترکات و بیداتە بەر ڕەخنەی توند.
پارتە نوێیەکەی عیان هێرسی عەلی( VVD ) ئەم هەلەی باش قۆستەوەو لە ڕێگای ئەم کچە یاخی بووەوە کە خۆی لە خێزانێکی موسڵماندا چاوی هەڵهێناوە کەوتنە فراوان کردنی بەرنامەکانیان دژ بە ڕەوەندی ئیسلامی و ئایینی ئیسلام و ئیسلامی سیاسی.
بۆ هەڵبژاردنە نوێیەکانی ساڵی ٢٠٠٢ ئەم پارتە ئەو کچەی کردە یەکێک لە کاندیداکانی پارتەکەیان و بەهۆیەوە توانیان دەیان هەزار دەنگی دیکە بۆ خۆیان و لیستەکەیان بەدەست بهێنن و عەیانیش بۆ یەکەم جار بە دەنگێکی جەماوەری زۆرەوە توانی کورسیەکی پارلەمان بۆخۆی مسۆگەر بکات.
شەڕی ئەم جارەی عەیان هێرسی لە پارلەمانەوە دەستی پێ کرد، لە پارلەمانەوە بە پاڵپشتی حزبەکەی کەوتە وێزەی ( ئایینی دوواکەوتوی ئیسلام و ڕەوەندە پاشکەوتووەکەی، کە هەرگیز ناتوانن لەگەڵ کۆمەڵگای هۆڵەندیدا ئاوێتە بن). هەر لە مینبەری پارلەمانەوە داوای ئازادکردنی ئافرەتانی موسڵمانی دەکرد لەدەست کلتوری پاشکەوتووی ئیسلام. بابەتەکانی خەتەنە کردنی ژنان و لێدان و چەند ژنەو زاڵ بوونی پیاو بەسەر ئافرەت و باوک سالاری و... هتد دەوروژاند.
هەڕەشەکانی ئیسلامی سیاسی لەم کچە تا دەهات جدی تر دەبوو بەڵام ئەم جارەیان حکومەتی هۆڵاندا لە کوشتنەکەی ( فۆرتاین)ەوە دەرسی وەرگرتبوو بۆیە سەرباری تەرخان کردنی پارێزگاری پێویست بۆی، بۆ ماوەیەکی کورتیش بردیانە دەرەوەی هۆڵانداو شاردیانەوە..
یەکەم خۆشاردنەوەی عەیان ماوەیەکی زۆری پێ نەچوو، پاش هێمن بوونەوەی بارودۆخ گەڕایەوە نێو پارلەمان و دەستی بە کاری خۆی کردەوە، ئەم جارەیان بڕیاری دا زیاتر چالاک بێت، لەگەڵ دەرهێنەری سینەمایی(ڤان خۆخ ) ڕێککەوتن و پێکەوە کاریان لە بەرهەم هێنانی فلێمێک کرد بە ناوی( Submission - مل کەچی ) ئەم فلیمە کە باس لە پێگەی ژنان لە نێو کلتورو کۆمەڵگای ئیسلامیدا دەکات، لەگەڵ پیشاندان و بڵاوبنەوەیدا ڕەوەندی ئیسلامی و ئیسلامی سیاسی کەوتنە دەربڕینی

نارەزایی و بەرهەم هێنانی ئەم فلیمەیان بە سوکایەتی کردن بە ئیسلام لە قەڵەم دا.

ئیسلامی سیاسی و تۆرەوابەستەکان بە رێکخراوی تیرۆریستی جیهانی ئەلقاعیدەوە بریاری خۆیان دابوو، بەڵام لەبەر ئەوەی دەستیان بە ئاسانی نەدەگەیشتە عەیان هیرسی سەرەتا لە دەرهێنەرەکە هاتنە دەست و سەرلەبەیانی رۆژی ٢-١١-٢٠٠٤ لە شاری ئەمستەردام بە چەند گوللەیەک( ڤان خۆخ) یان لەسەر پاسکیلەکەی خۆی هەڵدایە خوارەوە و پاش ئەوەی بە چەقۆش لە چەندین لاوە لە مل و سنگیان دا نامەیەکیان هەر بە چەقۆ بەسەر سنگیدا داکوتی، لەم نامەیەدا وێرای(عەیان هیرسی) ، هەرەشەی کوشتنی سەرۆک و جێگری شارەوانی ئەمستەردامیش هاتووە. لە چەند برگەیەکی ئەو نامەیەدا کە بە زمانی هۆڵاندی نوسراوە*و پریەتی لە زاراوەی ئایینی ئەم چەند دێرە هاتووە:

نامەیەکی کراوە بۆ ئەیان هێرشی ئەلی

بەناوی خوای گەورەو میهرەبان،

رەحمەت و بەرەکەت بۆ ئەمیری موجاهیدینی کۆچ کردوو پیغەمبەری خودا موحەمەد( د.خ) و پیاو چاکان و ئەسحابەکان و موریدانی رێگای هەق تارۆژی قیامەت.

سڵاو و رەحمەت بۆ هەموو ئەوانەی دووای رێگەی راستی کەوتوون، ئەم نامە کراوەیە ئاراستەیە بۆ کافری توند رەو لە حزبی تاغوتی( VVD) حرسی عەلی، لەوەتای خۆت خستۆتە نێو گۆرەپانی سیاسی لە هۆڵاندا لە رێگای ووتار و لێدوانەکانتەوە تیرۆرو گاڵتە جاری بە ئیسلامت کردۆتە بەرنامە.

تۆ یەکەم کەس نیت و دووا کەسیش نابیت کە ئەم هێرشە خاچ پەرستانەیە دژی ئیسلام پیادە دەکەن.. ..

نامەکە بەردەوام دەبێت و نزیکەی چوار لاپەرەی فولسکاب دەگرێت و بە زمانی ئیسلامیەکی توند رەو رەخنە لە پارتەکەی عەیان دەگرێت و بە یەهودی ناوی دەبات و ئامانج لە دروست بوونی تەنها دژایەتی کردنی ئیسلامە، لە چەندین برگەی دیکەی نامەکەدا دێتە سەرباسی قیامەت و رۆژی حەشرو زیندووبونەوە . عەیان تاوانبار دەکات بەوەی کە بروای بە ئیسلام و خوداو ئافەریدە کردن نیە و ئامێرێکە بەدەستی خاچ پەرستەکانەوە دژی پیرۆزیەکانی ئیسلام.

کۆتایی نامە هەرەشە ئامێزەکەش ئەم چەند دێرەی خوارەوەیە:

خانم هێرشی ئەلی چاوەڕوانی مردن بکە ئەگەر لە سەر ئەو باوەڕەت بەردەوام بیت، مێشکی خۆت بەسەر شاخی چەسپاوی ئیسلامدا دەپژێنیت، تۆو هەموو هاو شێوەکانی تۆ لە هەر شوێنێک بن مەرگ دەتانگاتێ. هەروەک چۆن پێغەمبەری مەزن بە فرعەونی گوت
ئەی فرعەون من دەزانم کە تۆ دەدۆڕێیت، ئێمەش ئەم ووشانەتان بۆ دەنێرین بۆ ئەوەی لاتان ڕوون بێت:
من دەزانم کە ئەمەریکا دەدۆڕێت
من دەزانم کە ئەوروپا دەدۆڕێت
من دەزانم کە هۆڵاندا دەدۆڕێت
من دەزانم کە هێرشی ئەلی دەدۆڕێت
من دەزانم کە کافرە توندڕەوەکان دەدۆڕێن حسبنااللە و نعم الوکیل ...

پاش ئەوەی پۆلیسی هۆڵاندا نامە بەخوێن خوساوەکەی سەر سینەی( ڤان خۆخ) ی خوێندەوە قەبارەی ئەو هەڕەشەیەشی بۆ دەرکەوت کە لەسەر ژیانی عەیان حرسی عەلی هەیە بۆیە دەست بەجێ عەیان برایە شوێنێکی نادیار و ڕۆژی ٥-١١-٢٠٠٤ بە فڕۆکەیەکی سەربازی برایە دەرەوەی هۆڵاندا پاش ٧٥ ڕۆژ خۆشاردنەوە بە ئۆتۆمبێلی تایبەتی زرێ پۆشەوە هێنرایەوە بۆ پارلەمان و بە چەپڵە ڕێزانەوە پێشوازی لێ کرا.
عەیان حرسی بۆتە مایەی بێزارییەکی زۆری ئیسلامی سیاسی و تەنانەت زۆریش لە ئەندامانی ڕەوەندی ئیسلامی چونکە لەسەر زاری ئەم ( لە دین وەرگەڕاوە ) خەوشەکانی کۆمەڵگای ئیسلام و دواکەوتنی ڕەوەندەکەش باشتر دەکرێنە نمونە.
حرسی عەلی لە لێدوانەکانیدا هەمیشە جەخت لەسەر بەردەوامی خەباتی خۆی دەکات، بەڵێنیشی داوە سێ بەشی دیکە لە فلیمی ( مل کەچی ) بەرهەم بهێنێت، بانگەوازی ئازاد کردنی ئافرەت و تاکەکانی کۆمەڵگای ئیسلامی دەکات، ئەم بانگەوازانەش وای کردووە کە ئیتر پارلەمانتارێکی بەناوبانگ و سیاسەت مەدارێکی پلە یەکەمی لە هۆڵاندا لێ دەرچێت( لە ڕاپرسیەکی ڕۆژنامەی ( de Volkskrant ) ڕۆژی ٢٣-١٢-٢٠٠٤ بڵاوکرایەوە، حرسی عەلی لە نێو کەسایەتیەکانی هۆڵاندا پلەی یەکەمی ئەو ساڵەی بەدەست هێنالە کاتێکدا شازادەی کۆچ کردووی وڵات ( Prins Bernhard ) پلەی سێهەمی بەدەست هێنا). .

بەم جۆرە ئیسلامی سیاسی بۆتە هۆی ئەوەی کە کۆمەڵگای هۆڵاندی ڕەوەندی ئیسلامی بخاتە نێو قەفەزی تاوانەوەو تەواوی خەوش و کەم و کوڕیەکانی ئەم کۆمەڵگایەی بە ئەستۆدا بدات و پارتە سیاسیەکانیش ئەو هەڕەشانەی ئیسلامی سیاسی بکەنە باشترین کارت بۆ بەدەست هێنانی زۆرترین دەنگی سیاسی..

دەستگیر کردنی دەیان توندڕەوی ئیسلامی و ئاشکرا بوونی تۆڕە ئەوروپیەکانی ئەلقاعیدە لە هۆڵاندا بونەتە هۆی ئەوەی کە زۆرترین توێژەکانی کۆمەڵگای هۆڵاندا بەلای کەمەوە لەئەمڕۆدا ڕەوەندی ئیسلامی بە گەورەترین هەڕەشە بزانن نەک تەنها بۆ سەر ئاییندەی وڵات بەڵکو بۆ سەر ئاسایشی تاکە کەسی خۆشیان.

## بەشی پێنجەم:-

### سەرهەڵدانی ئیسلامی سیاسی لە هۆڵاندا:-

هەروەک سەرەتا لە مێژووی هۆڵاندا باسمان کرد ئەندونوسیا کە گەورەترین دەوڵەتی ئیسلامیە یەکێک بوو لە مۆنۆپۆلەکانی(موستەعمەرە) هۆڵاندا لەو کاتەوە ئیتر بەردەوام کارلێکی کۆمەڵایەتی و ئایینی و تەنانەت دەرونیش لە نێوان هەردوو لادا ڕووی داوە.
لەگەڵ گەیشتنی یەکەم موسڵمانی ئەندەنوسی بۆ هۆڵانداو پاشان لە کۆتایی شەستەکانی سەدەی ڕابووردوو کە شەپۆلی کرێکارە میوانەکان لە مەغریب و تورکیاوە بەرەو هۆڵاندا کەوتە ڕێ، ئیتر ئیسلام لەم وڵاتەدا بە خێرایی تەشەنەی سەندو بە پێ ی دەستوری هۆڵانداش سەبارەت بە ئازادی بیروباوەڕی سیاسی و ئازادی ڕێکخستن و ئۆرگانیزە کردنی مەڵبەندە ئایینیەکان و خواپەرستی، ئیتر موسڵمانەکانی هۆڵاندا کەوتنە دروست

کردنـی مزگـەوت و قوتابخانـەی ئیـسلامی و پاشـان هـەر لـەولاتـەکـانی خۆیانـەوەو بـە پـارەی خۆیـان و هـەر لـەگونـدەکـەی خۆشـیانەوە ئیمـام و خەتیبیان هێنایە ولات و دەستیان بە بانگەواز ( دعوە ) کرد.
بەم جۆرە دەکرێت قۆنانەغەکانی سەرهەڵدانی ئیسلام لە ئەوروپابەگشتی بکەین بە سێ بەشەوە:

## یەکەم/ قوناغی کۆچبەری ( ١٩٠٠- ١٩٧٢) :

ئەم قۆناغە لەگەڵ کۆچکردنی کۆچبەرە موسڵمانەکان دەست پێ دەکات لە سەدەی نۆزدەهەمەوە ، بـەتایبـەت کـۆچی لوبنانیـەکـان و جـەزاتریـەکـان بـۆ ولاتـانی خۆرئـاوا و پاشـان کـۆچی تورکـەکـان و مـەغریبیـەکـان بـۆ خۆرئـاوا بـەمـەستی کارپـەیدا کـردن و بنیـات نانـەوەی پـاش جـەنـگ، ئـەم قۆنـاغـە ناسراوە بەوەی کە هیچ جـۆرە پێکدادانێکی ئـەوتـۆی تیـادا سـەرهـەڵنـەداوە، لەم قۆناغـەدا موسڵمانەکـان تـەنهـا وەک میـوان لـەنێو ئـەو کۆمـەڵگایانـەدا رەفتاریان دەکرد و جگە لە دروست کردنی هەندێک مزگەوت و خەمخۆری بۆ وەرگرتنی مـافی نیشتەجـێ بـوون هـیچ داخوازیـەکـی ئـەوتۆیان تیـادا بـەدی نەدەکرا..

## دووەم/ سەرهەڵدانی نەوەی دووەمی موسڵمانان ( ١٩٧٣- ١٩٨٨ )

ئەم قۆناغە لە ساڵی ١٩٧٣ بـەدوواوە سـەری هـەڵدا ئـەو دەمـەی کـە زۆری حکومەتە ئـەوروپیـەکـان مـافی ( کۆکردنـەوەی خێزان ) یـان بـە کۆچبـەرانـی موسڵمان بەخشی بەم جۆرە بە پێ ی ئەم مافە ئەو کۆچبەرانە بۆیان هەبوو کە خێزانەکانیشیان بۆ لای خۆیان راکێشن ، ئـەمـەش بـووە هـۆی ئـەوەی کـە نـەوەی دووەم لـەنێو ئـەو موسڵمانانـەدا پـەیدا بـن، ئـەم نـەوەیـە ئیتـر لـە ئـەوروپا پـەروەردە بـووە و فـەرهـەنـگ و کـەلتـوری ئـەوانیـشی لـەگـەڵ خۆیـدا موتوربە کردووە، لێرەوە ئیتر رەوەندی ئیسلامی کەوتە کۆکردنەوەی ناومالّی خـۆی و چـەنـدین رێکخـراوی کۆمـەلایـەتـی و سیاسـی و ئـاینیی پێکهێنـاو لـە زۆربـەی ولاتـانی ئـەوروپاشدا کـەوتە داخوازی ئـەوەی کـە ئـاینـی ئیسلام وەک ئاینێکی فەرمی دەوڵەت لە چوارچێوەی یاسادا بە فەرمی بناسرێت..

## سێهەم/ قۆناغی روبەڕوبوونەوە(١٩٨٩- تا ئەمڕۆ )

لێرە بەدوواوە موسڵمان و کۆمەڵگا ئەوروپییەکان بەریەک دەکەون و توشی روبەڕوبوونەوە دەبنەوە گرنگترین روبەروبوونەوەش ئەو فەتوایە بوو کە خومەینی ساڵی ١٩٨٨ دژی سەلمان روشدی دەریکرد و لەبەر نوسینی کتێبێک خوێنی حەڵاڵ کرد، پاش ئەم روداوە کێشە سەرپۆشی ئیسلامی ( حیجاب ) گەورەترین روبەروبوونەوەی خستە نێوان هەردوولایەنەوە، ئەم کێشەیەش کاتێک رویدا کە بەڕێوەبەری یەکێک لە قوتابخانەکان لە ساڵی خوێندنی ١٩٨٩ دا لە فەرەنسا ماوەی نەدا دوو کچە خوێندکاری سەرپۆش لەسەر بە بیانوی ئەوەی کە ئەمە دژی یاساکانی دەولە بێنە نێو خوێندنگاکەیانەوە.. توند بونەوەی کێشەی فەلەستین و هێرش بۆ سەر عێراق ساڵی ١٩٩١ بوونە هۆی ئەوەی کە ململانێکانی نێوان ئەم دوو لایەنە توندتر بکرێنەوە، ساڵی ١٩٩٥ مترۆکانی پاریس لەلایەن کەسێکی بە رەگەز جەزائیری تەقێنرانەوەو پاشان چەندین روداوی دیکەی وەک هێرشەکانی سێپتەمبەری ئەمەریکا و مەدرید و لەندەن و هۆڵاندا رویاندا..

بەڵام بەر لەوەی ڕەوەندی ئیسلامی لە ئەوروپا بەرگی سیاسییانەی خۆی بپۆشێت، بەر لەوەی جلی موجاهیدەکانی ئەفغانستان و بورقای تاڵیبانی لەبەر کرێت، لە وڵاتەکانی خۆیاندا ئیسلامی سیاسی ( ڕابوونی ئیسلامی) وەک بزاڤێک نەک تەنها خۆی ناساندبوو بەڵکو چەند قۆناغێکیشی تێ پەڕاندبوو:-

- قۆناغی شەستەکان کە نەوە ( جیل ) ی یەکەمی لە نێو برایانی موسڵمان( اخوان ) بەرهەم هێنا

- نەوەی دووەم لە نێو منداڵانی نەوەی یەکەمەوە تێزەکانی تەکفیری بەرهەم هێنا هەتا ساڵانی نەوەتی خایاند.

- نەوەی سێ هەم نەوەی ڕێکخراوی ئەلقاعیدەیە، کە لەگەڵ گلۆبالیزەبووندا پەلی بەنێو دنیادا بڵاوکردەوە.

- نەوەی چوارەم نەوەی ئەمڕۆن کە لەشێوەی تاکە کەس و گروپی بچوکدا هەر ساتەی لە سوچێکی دنیاوە سەردەردێنن..

بەر لەوەی پێگەی ئیسلامی سیاسی لە ئەوروپا بە گشتی و هۆڵاندا بە تایبەتی دیاری بکەین پێویستە ئەوە بڵێین کە چەندین هۆی سەرەکی بوونە

هۆی پەیدابوون و پاشان گواستنەوەی ئیسلامی سیاسی بۆ ئەوروپا کە دیارە لێرەدا من هەوڵ دەدەم تەنها هۆکارە بابەتیەکان بخەمە ڕوو کە بۆ ئەم لێکۆڵینەوەیە پێویستن.

## ئەو دەمەی موسڵمان و ئیسلامیەکان بەرەو ئەوروپا هەڵهاتن!

کۆتایی جەنگی جیهانی دووەم کۆمەڵێک ڕژێمی نیشتیمانی و قەومی تەنانەت ناشێونالستی لە وڵاتانی ئیسلامی و عەرەبی بەهەرم هێنا، ئەو ڕژێمە تۆتالیتاری و داخراوانە کە زیاتر بڵقە سیاسی و کێشە ناوخۆییەکانی ئەو وڵاتانە بەرهەمی هێنابوون زۆربەی هەرە زۆریان عەلمانی بوون و لە پرۆژە ناشیونالستی و نیشتیمانیەکانی خۆیاندا بە تایبەت بەرامبەر بە ئیسرائیل شکستی گەورەیان نۆشی، وێرای ئەوەش هەر هەموویان بە پێ ی هاوکێشە هەرێمیەکان و هەڵکەوتەی جیوپۆلۆتیکیان بە سەر هەردوو بلۆکی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا دابەش ببون.

ئەو ڕژێمانە کە گەندەڵی سیاسی و ئابوری سیمای هەرە دیاریان بوو، هەژاری و دوواکەوتویی و برسێتی خەسڵەتیان بوو، زیندان و توندو تیژی و کوشتن و بڕین ڕەفتاریان بوو ... هتد لە کاتێکدا ئەوروپا هەنگاوی زۆر خێرای بەرەو سەقام گیری و خۆش گوزەرانی و دیموکراتیەت دەهاویشت، لە نێو ئەو دەوڵەتانەدا برسێتی و هەژاری و جەنگ و نەخوێندەواری بڵاو دەبووەوە... هەموو ئەو خاڵانە بوونە هۆی ئەوەی کە لە سەرەتای هەفتاکانەوە تا ناوەڕاستی نەوەتەکان کۆچ و هەڵهاتن بۆ ئەوروپا ئامانجی خوازراوی زۆرینەی مرۆڤەکانی ئەو دەوڵەتانە بێت تا لە هەندێک حاڵەتدا ڕێکخراوی نێو نەتەوەیی کۆچ و پەنابەری بە ( کۆچی گەلان ) ناوی بەرێت..

لە نێو پەنابەرانی دەوڵەتە ئیسلامی و عەرەبیەکان ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە سەرکردەو ئەندامانی گروپەکانی ئیسلامی سیاسی بەدی دەکران، ئەوانە کە هەر هەموویان لە وڵاتانی خۆیان قاڵبووی شەڕو زیندان و سیاسەت و توندو تیژی بوون.

دکتۆر ئەیمەن زەواهیری لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناوی ( سوارچاکانی ژێر ئاڵای پەیامبەر - فرسان تحت راية النبی) لەم بارەیەوە باس لەو شکستانە دەکات کە بەسەر بزوتنەوە ئیسلامیەکاندا هات، زەواهیری هەر لە میسرو جەزائیر و بۆسنەوە تا کشمیر و چیچان بە سەر دەکاتەوەو ئۆباڵی

فیاسکۆی(فشل) هەر هەموویان دەخاتە گەردنی ئەو ڕژێم و حکومەتە موسڵمانانەوە کە ماوەیان بەوە نەدا ئیسلامی سیاسی خۆی ڕێکبخات بۆیە ئەوان ناچار بوون هەڵبێن و ڕێبازێکی نوێ بگرنە بەر بۆ ڕێکخستنی خۆیان و ئومەتەکەیان ڕێبازێک کە لە زەبر و ئاگرو ئاسنی دوژمنی نزیک ( دەوڵەتەکانی خۆیان ) بیان پارێزێت ئەوەش بە هەڵهاتن بۆ نێو خاکی دوژمنی دوور( ئەوروپا و ئەمەریکا ) .

ئەیمەن زەواهیری کە خۆی سێ ساڵ لە نێو زیندانەکانی میسردا بوو بەرەو هۆڵاندا هەڵهات و هەر لەوێش بەناوێکی خوازراو ( مەحمود حەفناوی ) مافی پەنابەری وەرگرت و پاشان پاسپۆرتیشی پێدرا، زیاتر باس لە دەرسەکانی ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ڕژێمە ئیسلامیەکاندا دەکات و بەکار هێنانی ئەو هەموو تاقیکرنەوانە وەک دەرسێکی باش لە خەباتی نێو دڵی دوژمنی دووردا شی دەکاتەوە.

لە نێو دڵی دوژمنی دووردا بۆ خۆسازدان و زەبرلێدانی دوژمنی نزیک (پاش دوژمنی دوور ) شانەو گروپگەلێک پێویستن کە ئەم سیفەتانەیان هەبێت:

١- بڕوای پتەو بە دەست وەشاندنی کاریگەر لە دوژمنی دوور و نزیک.

٢- ئاستی خوێندنیان بەرز بێت (لە ئەوروپا یاخود لە ئەمەریکا خوێندنی زانکۆیان تەواو کردبێت.

٣- بڕوای تەواویان بە تیژی سەلەفیەکان هەبێت.

بەم جۆرە لەگەڵ نەوەی سێهەمی ئیسلامی سیاسی کە لە پێشەوە باسمان کردن ئیتر لە دووای هەڵوەشاندنەوەی بلۆکی ڕۆژهەلات و شکستی سۆڤیەت لە ئەفگانستان و سەرهەڵدانی زەمینەی دروست بوونی ڕێکخراوی ئەلقاعیدە، پەتای ئیسلامی سیاسی کەوتە ئەوروپاو فەرەنسا بەشی شێرو وڵاتانی دیکەی ئەوروپاش لەوانە هۆڵاندا بەشی خۆیان وەرگرت، بۆیە لامان سەیر نییە کە تەشەنەی مزگەوتەکانی ئیسلامی سیاسی و قوتابخانە ئیسلامیەکان و گروپەکانی ئیسلامی سیاسی هەر هەموی لەو قۆناغەدا سەرهەڵدەدەن...

پەیدابوون و گەشە سەندنی ئیسلامی سیاسی لە وڵاتە ئیسلامیەکاندا کاریگەری بەر چاوی هەبووە لە گواستنەوەی هەمان توندڕەوی و ئایدۆلۆژیا بۆ ئەوروپاو تاراوگە بە گشتی و پێشکەوتنی تەکنەلۆژیای زانیاری و پەیوەندیەکان و گواستنەوە ئەم کارەی ئاسانتر کردووە بە جۆرێک کە ئێستا لەگەڵ جیهانیزە بوونی ئابوری و سەرمایەو زانست و تەکنەلۆژیا ناکرێت باس لە جیهانیزە بوونی تیرۆر نەکرێت.

ساڵی ١٩٩٤ دەزگای هەواڵگری هۆڵاندا بۆ یەکەم جار باس لە پەیدابوونی ئیسلامی سیاسی لە هۆڵاندا دەکات، ئەم ڕاپۆرتە کە پاشان دێینە سەر تاوتوێ کردنی ئاماژە بەوە دەکات کە ئەندامانی چەندین تۆڕی نێو دەوڵەتی تیرۆریستان چالاکی خۆیان بە ڕێوە دەبەن، بەڵام بۆئەوەی شێوازی ڕوو بە ڕوو بونەوەی حکومەتی هۆڵانداو دەزگای هەواڵگری و زانیاری هۆڵاندا لەگەڵ ئیسلامی سیاسی باشتر بەرجەستە بکەین سەرەتا دێینە سەر باسکردنی کورتەیەکی ئەو دەزگایە:

## دەزگای زانیاری هۆڵاندا A.I.V.D

دەزگای زانیاری و ئاسایشی گشتی هۆڵاندا ( Algemene Inlichtingen en Veiligheids dienst ) کە بەشی خزمەت گوزاریە هەواڵگریەکانی وڵاتە هەتا ڕۆژی ٢ ی مەی ساڵی ٢٠٠٢ پێ ی دەوترا (BVD ) واتە ئاسایشی ناوخۆی وڵات، دەزگایەک بوو کە هەتا ئەو کاتەش بایەخێکی زۆری بە ناوخۆی هۆڵاندا دەدا، بەڵام ڕووداوەکانی ١١ی سێپتەمبەر نەک تەنها ناوی دەزگاکەی گۆڕی بەڵکو کاری کردە سەر سروشتی چالاکی و بایەخە هەواڵگریەکانیشی.
دەزگای زانیاری و ئاسایشی هۆڵاندا وەک سەرەتایەک ساڵی ١٩١٩ پاش جەنگی یەکەمی جیهانی بەناوی سەنتەری زانیاری ( CI ) دروست بوو. کۆمەڵێک گۆڕانکاری زۆری بەسەردا هاتووە کە گرنگترینیان لە جەنگی دووەمی جیهانیدا بوو کاتێک وەک پاراستن لە زەبری هتلەر و پاراستنی سەرچاوەکان و نهێنی پاراستنی، سەنتەرەکە بە تەواوی ئاگری تێ بەردراو سوتێنرا، بەڵام هەر زوو پاش ئەوەی کە حکومەتی هۆڵاندی و پادشاکەشی بەرەو بەریتانیا هەڵهاتن لەوێوە بۆ سەرکردایەتی کردنی بەرگری دژ بە نازیەکان دیسان دەزگاکە دروست کرایەوە.
هۆی سەرەکی لە دامەزراندنی ئەم دەزگایەش لە پاش جەنگی یەکەمی جیهانی ئەوە بوو کە هۆڵاندا دەرسی لە جەنگەکە وەرگرت، چونکە ئەو دەمە هۆڵاندا لەشەڕدا بێ لایەن بوو، بەڵام دەتوانین بڵێین کە ئەمە ڕێکەوت بوو (هۆڵاندا بەخت یاری بوو) چونکە لە جەنگی دووەمی جیهانیشدا هۆڵاندا هەوڵی دا بێ لایەن بێت بەڵام سەری نەگرت وەلێ جیاوازیەکە لێرەدا بۆ هۆڵاندا تەنها لە یەک شتدا بوو ئەویش ئەوە بوو لە جەنگی جیهانی

دووەمدا هۆڵاندا دەزگای زانیاری هەبوو، ئەم دەزگایەش وەڵامی پرسیارە قورسەکەی لابوو ( دوژمن بەتەمای چی یە ) بۆیە توانی خزمەتێکی گەورە پێشکەش بەوڵات بکات بەر لەوەی بەر شاڵاوی نازیەت بکەوێت.
ئەمڕۆ ئیتر ئەو دەزگایە لە لوتکەی پەرەسەندنی خۆی دایەو هاوتای هەموو دەزگاکانی دیکە بۆتە جێگای بایەخی حکومەتی هۆڵاندا، تاکە هۆی سەرەکیش بۆ ئەم بایەخە ئیسلامی سیاسیە.
ئەم دەزگایە نەک شوێن و باڵەخانەکانیشی ئاشکراو نە شاراوەن بەڵکو لەسەر تۆڕی ئەنتەرنێت ماڵپەڕی خۆی هەیەو دەتوانێت بە تەواوی لەو زانیاریانە بەهرەمەند بێت کە ئاشکرا کراون.
بنکەی سەرەکی ئەم دەزگایە دەکەوێتە شاری (Leidschendam) لە باڵەخانەیەکی گەورەی پان وپۆڕی نۆ نهۆمی پێک دێت.
ئارمی ئەم دەزگایە بریتیە لە سێ ماسی لەناو دەریایەکدا بە سەر و ژێر و ناو تۆڕێکدا دەپەڕنەوە. ژمارەی کارمەندانی ئەم دەزگایە هەزار کەسە و لە بڕیارێکی پارلەماندا مانگی ژانیوەری ٢٠٠٥ بڕیار درا ژمارەی کارمەندەکان بۆ ١٧٠٠ کەس زیاد بکرێن.
هۆڵاندا وێرای ئەوەی کە لە ڕووی ڕووبەرەوە دەوڵەتێکی بچوکە بەڵام لە ڕووی ئابوریەوە زۆر دەوڵەمەندەو لە ڕووی دبلۆماسیشەوە زۆر دەست ڕۆشتووە ئەمەش وای کردووە کە دەزگای زانیاریەکەی تەنها دەزگایەکی ناو خۆیی نەبێت، بەڵکو دەزگایەک بێت لە زۆر کونو قوژبنی دنیادا تەنانەت عیراق و کووردستانیش کاری خۆی بکات.
دەزگای زانیاری و ئاسایشی گشتی هۆڵاندا پێکهاتووە لە هەشت بەش کە ئەمانەن:

یەکەم/ بەشی ستراتیژی و کاروباری یاسایی.
دووەم/ بەشی زاتیەو پێرسۆنیل( فەرمانبەرەکان )
سێهەم/ بەشی چاودێری و دیموکراسی
چوارهەم/ بەشی ئاسایشی دەوڵەت.
پێنجەم/ پەشی پاراستنی ئاسایش.
شەشەم/ بەشی زانیاری دەرەوەی وڵات.
حەوتەم/ بەشی زانیاری کتوپڕ
هەشتەم/ بەشی تیرۆریستە ئیسلامیەکان

بەشی هەشتەم پاش زیاد بوون و جدیتر بوونی هەڕەشەی تیرۆریستی ئیسلامی و ڕاستەوخۆ پاش ڕووداوەکانی ١١ی سێپتەمبەر دامەزرا. ئامانج لە

دامەزراندنی ئەم بەشە چارەسەرو بەگژا چوونەوەی باندە ئیسلامیە توندڕەوەکان بوو کە ژمارەیان بە پێ ی زانیاریەکانی ئەم دەزگایە ١٥٠ کەس دەبێت.
دەزگای زانیاری و ئاسایشی گشتی هەتا کارەساتی سێپتەمبەر هەرگیز بە بێ ماوە پێدانی وەزارەتی( داوەری گشتی - Openbaar ministerie ) نەی دەتوانی تەلەفون و پەیوەندیەکانی کەسێک یان لایەنێک کۆنترۆڵ بکات یاخود کامێراو مایکرۆفۆنی نهێنی دابنێت، بەڵام پاش ئەو ڕووداوانە ئێستا دەستی ئەو دەزگایە ئاوەڵاتر بووە بۆ ئەو کارانە، ئەم دەزگایە هەرگیز ئەوە ناشارێتەوە کە جاسوسەکانی خۆی لە نێو مزگەوت وخوێندگاو ڕێکخراوەو تەواوی •شوێنە ئایینیەکاندا بڵاو کردۆتەوە و ڕاپۆرتی ساڵانەی خۆشی دەداتە میدیاو لایەنە پەیوەندارەکان.
دەزگای ناوبراو پەیوەندی توندو تۆڵی لەگەڵ زیاترلە ١٠٠دەزگای هەواڵگری دیکەی جیهانیدا هەیە، چوار دەزگای گەورەی جیهانیش لەوبارەوە لەڕیزی هەرە پێشەوەی ئەو دەزگایانەن کە کاری هاوبەش و ئامانجی هاوبەش پێکەوە گرێ دەدەن کە ئەوانیش بریتین لە دەزگاکانی CIA ، مۆساد، MI6 ، میتی تورکی.
وەک هەموو دەزگاکانی دیکەی جیهان ئەم دەزگایەش چەندین خزمەتی گەورەی پێشکەش بە وڵات کردووەو لەو بارەوە خاوەنی چەندین نەهامەتی و شکستیشە..
یەکێک لەو شانازیانەی ئەم دەزگایە بۆخۆی تۆمار کرد ئەوەبوو لە سەرەتای ساڵەکانی ١٩٧٠ بە هاوکاری دەزگای( CIA) ی ئەمەریکا بۆ بەرپەرچ دانەوەی چەپ و کۆمۆنیستەکان لەئۆپراسیۆنێکدا بە ناوی مەنگۆل توانیان زەبرێکی زۆر گەورە لە چەپ و کۆمونیستەکان بگەیەنن. حزبی شیوعی هۆڵەندی( C.P.N ) لەو ساڵانەدا سەرئێشەیەکی گەورەی بۆ حکومەت دروست کربوو، مانگرتنی کرێکاران کە لەلایەن ئەو حزبەوە سەرپەرشتی دەکراو هەر جارەی ٢٥ هەزار کرێکاری دەهێنایە سەرجادە هەڕەشەی جدی لە حکومەتی لیبراڵی هۆڵاندا دەکرد بۆیە بە سەر پەرشتی دەزگای زانیاری هۆڵاندا چەند ئەفسەرێکی دەزگاکە هەستان بە دروست کردنی حزبێکی دیکە بەناوی حزبی مارکسی _ لینینی هۆڵاندی(MLPN) و لە ئاکامدا توانیان حزبی شیوعی بە شێوەیەک لاواز بکەن کە هەرگیز نەتوانێت جارێکی دیکە سەریەشە توشی وڵات بکات..

بەڵام لە ڕووبەڕووبونەوەی ئیسلامی سیاسیدا تا ئێستا نەزانراوە ئەم دەزگایە چ جۆرە سەرکەوتنێکی بە دەست هێناوە، خۆ ئەگەر باس لە نوشوستی بکەین ئەوە بەڵگەی نوشوستی ئەم دەزگایە نەک تەنها لە ڕووبە ڕووبوونەوەی ئیسلامی سیاسیدا بەڵکو لە بوارەکانی دیکەشدا بە ئاشکرا دەبینرێت.

## چیرۆکی ئەو ئیسلامیەی کە خۆی خزاندبووە نێو دڵی دەزگاکەوە:-

ئەم چیرۆکە ڕۆژی ٣٠ سێپتەمبەری ٢٠٠٤ کۆتایی پێهات، ئەو دەمەی ئەفسەرێکی بە ڕەگەز مەغریبی تەمەن ٣٤ ساڵە لە لایەن هەمان هاوڕێکانی خۆی لە نێو دەزگای زانیاری و ئاسایشی گشتی هۆڵاندا باڵ بەست کراو خرایە زیندانی تەنهایی یەوە.
عوسمان بن ئا( Outman Ben A ) کە لە نێو دەزگاکەدا بە ناوی ( ABIBE ) ناسرابوو سەرەتا لە وەزارەتی داد کاری دەکرد، یەکێک بوو لەو بەرپرسانەی کە بڕیارەکانی وەرگرتنی پەنابەرانی تاوتوێ دەکرد، لەبەر لێهاتوویی خۆی هەر لەگەڵ دامەزراندنی بەشی ( تیرۆریستە ئیسلامیەکان) لە لایەن دەزگای ناوبراو هەڵبژێردرا بۆ ئەوەی چاودێری ئەو تەلەفونە تۆمار کراوانەو ئەو گفتوگۆیانە بکات کە لەڕێگای مایکرۆفۆن و سەرچاوە جیاوازەکانەوە دەست دەزگاکە کەوتوون. عوسمان بەهۆی شارەزابوونی لە زمانی مەغریبی و زاراوەکانیدا ئاگاداری تەواوی ئەو زانیاریانە بوو کە سەبارەت بە تۆڕی ئەلقاعدە و ئیسلامی سیاسی بۆ دەزگاکە دەهاتن، بەتایبەت سەبارەت بەو گروپەی کە پاشان بە( گروپی پایتەخت) ناویان دەرکرد.
ڕێکەوت زۆرجار بەو جۆرە نابێت کە مرۆڤ هیوای بۆ دەخوازێت،بەشی ئوپراسیۆنەکان لە هەمان دەزگا چەند ڕۆژێک بەر لە ئاشکرا بوونی چیرۆکەکەی عوسمان لە شاری( Uturcht ) دایان بەسەر لانەیەکی تیرۆریستاندا، لەو لانەیە دا کە ماڵی ئەندامێکی ( گروپی پایتەخت) بوو بە ناوی حەسەن ئۆ Hassan.O جگە لە نەخشەی هەردوو باڵوێز خانەی ئەمەریکاو بەریتانیا، نەخشەی پارلەمانی هۆڵانداو فڕۆکەخانە و چەندین زانیاری و دۆکومێنتی زۆر هەستیاری نێو دەزگاکە دۆزرایەوە، کە هەر زوو

دەرکەوت سەرچاوەی ئەم هەموو زانیاریانە کەسێکە لە نێو خودی دەزگاکە کار دەکات.
بەم جۆرە ئەوەی نهێنی بوو لە دەزگاکە زۆر دەمێک بوو بۆ تۆڕە ئیسلامیەکان ئاشکرا بوو.
چاودێرانی سیاسی پێیان وایە لە مەڕ ڕووبە ڕووبونەوەی ئیسلامی سیاسی و تۆڕەتیرۆیستیەکان چەندین گرفتی گەورە هەن بوونەتە هۆکاری ئەوەی کە پیلانی ڕووبەڕوو بونەوەی ئەو گروپانە تا ئێستا سەرکەوتنی تەواو بەخۆوە نەبینێت.

گرفتە تەکنیکیەکانی دەزگای زانیاری و ئاسایشی گشتی هۆڵاندا:
گەورەترین گرفت لە بەردەم ئەو ڕووبە ڕووبونەوەیەدا لە هەموو دەوڵەتە ئەوروپیەکان و ئەمەریکادا تاڕادەیەکی زۆر چونیەکە، بەڕێوەبەرایەتی ئەو دەزگایانە بەرامبەر دوژمنێک دەوەستن کە:-
١- زمان و کلتوری فەرهەنگی جیاوازە و هاوڵاتیانی خودی ئەو دەوڵەتە لێیان تێ ناگەن.
٢- ئەو دوژمنە قەبارە و شوێن و کاتی دیاری کراوی نیە.

ئەوەی ڕووبە ڕووی هۆڵاندا دەبێتەوە زیاتر گرفتی یەکەمە، چونکە بۆ چاودێری و بەربەستکردنی گروپەکانی ئیسلامی سیاسی و تیرۆریستەکان، نەک تەنها پێویستیان بە هاوکاری ئەوکەسانە هەیە کە هۆڵاندی نین (یاخود بە ڕەگەز هۆڵاندی نین) بەڵکو کەسانێک لەم کارەدا دەتوانن هاوکاری بکەن کە لەخودی ئەو ڕێکخراوانە بێت یاخود بەلای کەمەوە لێیانەوە نزیک بێت یان زمان و دیالیکتیکەکانیان باش تێ بگات. لێرەشدا گرفتێکی دیکە دێتە بەردەم ئەویش ئەوەیە کە دەیان جۆری نەتەوە بە سەدان دیالیکتیکەوە لە هۆڵاندا دەژین، کە زۆربەشیان لەو دەوڵەتانەوە هاتوون کە ئایین وکلتوری ئیسلامی تیایدا باڵادەستە.

بەم جۆرە لە پرۆسەی کارکردندا هەمیشە دەوڵەت پێویستی بە دوو تیم هەیە بۆ ئەوەی تیمێک لەوانە دەنگە تۆمارکراوەکان وەرگێڕێتە سەر زمانی هۆڵاندی و تیمێکی دیکەش لە دانانی پیلان و ستراتیژی ڕووبەڕوبونەوەدا ڕاوێژی پێویست بە دەزگاکە بدات.

ئەوەی تائێستا لە دەزگای ناوبراو دەردەکەوێت ئەوەیە کە بەهۆی کەمی وەرگێڕی باوەڕپێکراوەوە تەنها ⅘ی ئەو دەنگانەی کە لە سەرچاوە جیاوازەکانەوە دەستکەوتوون کاری لەسەر کراوە و هەمیشە سێ بەشەکەی دیکە فڕێ دراوە، خۆ ئەگەر کارمەندێکی بەشی چاودێری (گوێڕادێران) ماوەیەک بەهۆی نەخۆشیەوە نەچوبێت بۆ کار ئەوا کارەکەی لە لایەن هیچ کەسێکی دیکەوە جێ بە جێ نەکراوەو بە فیڕۆ چووە.
هەماهەنگی نێوان لایەنە پەیوەند دارەکان دیوێکی دیکەی خاڵە لاوازەکانی ئەم دەزگایەیە کە لە ساڵی ١٩٩١ وە بەردەوام ڕاپۆرت دەداتە حکومەت و لایەنە بەرپرسەکان بەڵام لە ڕاستیدا کاری زۆر پێ ناکرێت و بە هەند وەرناگیرێت.
بیروکراسیەت و دوو دڵی لە ئەنجام دانی کارو ترس لە لێپرسینەوەو یاساش، زۆر بە خراپی بونەتە هۆی ئەوەی کە ئەو دەزگایە بەر لە ئەنجامدانی کارێک دەیان جار بیرکاتەوە بەم جۆرە لە ئاکامدا چالاکیەکانی سست بکات، کوژرانی ڤان خۆخ باشترین نمونەیە چونکە بکوژەکەی (موحەمەد. ب) زۆر بە باشی ناسرابوو بۆ دەزگاکە بەڵام لە بەر ئەوەی نەدەتوانرا ڕۆژانە چاودێری بکرێت و بەڵگەی تەواوی لەسەر نەبوو هەتا کارەکەی ئەنجام نەدا دەستگیر نەکرا.
پێ دەچێت کە باندە تیرۆریستیەکانیش باش لەم کەم و کوڕیانە تێگەشتبن بۆیە زۆر سەرکەوتووانە بە دیموکراسیەت شەڕی دیموکراسیەت دەکەن.
هەر لەمەڕ کێشە بیروکراسیەکانەوە، کورتەیەکی ئەو ئاگاداریانە دەخەینە ڕوو کە ئەم دەزگایە ئامارەی پێداون بەڵام زۆر جار دەوڵەت بۆ ڕووبەڕووبونەوەی ئەو هەڕەشانە بەپێ ی پێویست کاری نەکردووەو ستراتیژێکی ئەوتۆی بۆ بەرپەرچ دانەوە نەگرتۆتە بەر.
- ساڵی ١٩٩١ : زۆربوونی ژمارەی ئەوپەنابەرانەی کە لە و وڵاتانەوە دێن، ئاژاوەو شەڕی ناوخۆی تیایەو باری سیاسیان چەسپاو نیە، ئەمەش کاری خراپ دەکاتە سەر ئاسایشی هۆڵاندا.
- ساڵی ١٩٩٢ : پارتی کرێکارانی کوردستان **PKK** سەرانە لە کوردەکانی تورکیا دەسەنێت.
- ساڵی ١٩٩٣ : هۆڵاندیەکان تابێت زیاتر ڕکابەرایەتی بێگانەکان دەکەن، ئەمەش بۆ ئاییندەی ئاوێتە بوون لە نێو کۆمەڵگادا مەترسی هەیە.

- ساڵی ١٩٩٤ : لەژێر فشاری فەرەنساو ئەڵمانیادا، چەندین کەس لە ئەندامانی گروپە ئیسلامیە توندڕەوەکان، پاش گۆڕینی ناو و ڕۆژی لە دایک بونیان ڕوو لە هۆڵاندا دەکەن.
- ساڵی ١٩٩٥ : گروپی ئیسلامی توند ڕەو لە نێوخۆی هۆڵاندادا خۆیان ڕێکخراو دەکەن.
- ساڵی ١٩٩٦ : ئیسلامیەکان بە توندی ئایدۆلۆژیای دژ بە بەهاکانی خۆرئاوا برەو پێ دەدەن.
- ساڵی ١٩٩٧ : گروپە ئیسلامیە توند ڕەوەکان چەندین ڕێکخراوی سیاسیان دامەزراندووەو چالاکی خۆیان ئەنجام دەدەن.
- ساڵی ١٩٩٨ : کۆمەڵەی ئیسلامی جەزائیرو پارتی کرێکارانی کووردستان کێشە بۆ دەوڵەت دروست دەکەن.
- ساڵی ١٩٩٩ : دەزگای هەواڵگری عێراق ، ئێران و لیبیا چاودێری هاوڵاتیە بەرهەڵستکارەکانی خۆیان دەکەن و لە هەوڵی زەفەر پێ بردنیانن.
- ساڵی ٢٠٠٠ : بە هاوکاری چەند دەوڵەتێکی ئیسلامی مزگەوت و قوتابخانە ئیسلامیەکان کراونەتە حەشارگەی ئیسلامی توند ڕەو، ئایدۆلۆژیای دژ بە خۆرئاوا بڵاو دەکەنەوە.
- ساڵی ٢٠٠١ : چەندین تۆڕی ئیسلامی توند ڕەو دەست بەکارن بۆ زەبر وەشاندن لە نێو خۆی هۆڵاندا.
- ساڵی ٢٠٠٢ : تیرۆیستە ئیسلامیەکان ئێستا هەڕەشەی جدین بۆ سەر وڵات.
- ساڵی ٢٠٠٣ : تیرۆریستە ئیسلامیەکان زۆرتر لە جاران ئامادەو سازن بۆ دەست وەشاندن و پارەو پولێکی باشیان لە دەستدایەوە مزگەوتەکانیان کردۆتە مەڵبەندی خۆساز دان و جیهاد کردن.

ئەوانە تەنها هێڵە سەرەکیەکان بوون کە دەزگای هەواڵگری هۆڵاندا دیاری کردوون، دەنا لە نێو ڕاپۆرتی هەموو ئەو ساڵانەدا دەیان و سەدان ئامارەی ڕاست و درووستی تیادایە کە پاشان زۆربەیان ڕوویانداوە یاخود هاتونەتە دی، ژمارەو دۆکۆمێنتی زۆر ووردو بەڵگەی تەواو سەبارەت بەو دەرئەنجامانە دەخاتە ڕوو.. بۆ نمونە سەبارەت بە ئیسلامی سیاسی بۆ یەکەم جار کە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئامارەی پێکرابێت ساڵی ١٩٩١ بوو، لە ڕاپۆرتی ئەوساڵەدا دەزگای ناوبراو هەستی بە پەیدابوونی ئەوگروپانە کردووە و سەرنجی داون و حکومەتی لێ ئاگادار کردوونەتەوە،

بەڵام بەهەند وەرنەگرتنی ئەو جۆرە ڕاپۆرتانە تەنها دیاردەیەک نەبووە لە هۆڵاندا بەڵکو لە زۆربەی وڵاتانی خۆرئاوادا ئەگەر ڕووداوی ١١ ی سێپتەمبەر نەبوایە ئەوا هەرگیز لە خەوی قوڵیان بەرامبەر بە مەترسیەکانی ئیسلامی سیاسی و تیرۆریزم بە ئاگانەدەهاتن.

تەنها بەهەند وەرنەگرتنی ئەو ڕاپۆرتانە کێشە نەبوون بۆ دەزگای ناوبراو بەڵکو زۆر جار کار گەشتۆتە تانە و تەشەر لێدان و بانگەوازی داخستنی ئەو دەزگایەش لە لایەن چەندین پارت و گروپی هۆڵانداوە زۆر جار کراوەتە داخوازی لە پارلەمانی وڵاتدا.

## هۆڵاندا هاوپەیمانی شەڕی دژ بە تیرۆر

فرانک ڕامار سەرۆکی کۆمەڵەی مافی مرۆڤی کووردستان، هۆڵاندیەکی چالاک لە بوارەی مافەکانی مرۆڤ و دۆست و پێشمەرگەی دێرینی کووردستان، لە یەکێک لە گفت و گۆکانیدا کە بۆ ڕۆژنامەی هاوڵاتی کە لەگەڵیدا ئەنجامم دەدا، پەیوەندی هۆڵاندا و ئەمەریکای وەک سەگ و خاوەن سەگ پێناس دەکرد و دەیگوت (هۆڵاندا هەمیشە وەک سەگێکی بچکۆلە بە شوێن ئەمەریکادا ڕادەکات)..

من نامەوێت خوێنەر وەڕسکەم و سەبارەت بە پەیوەندیەکانی ئەمەریکاو هۆڵانداش چەردەیەک بدوێم، تەنها ئامارە بەوە دەدەم کە لە جەنگی جیهانی دووهەمدا هێزەکانی ئەمەریکا وێرای ئەوەی کە لە ئاسمانەوە خواردنیان بەردەدایەوە بۆ هۆڵەندیەکان، دلێرانەو جوامێرانە هۆڵاندایان لە ژێر چەپۆکی نازیەکان دەرهێناو هەتا ئەمڕۆش گۆڕستانێکی زۆری سەربازە کوژراوەکانی ئەمەریکا لە هۆڵاندا هەنە( لە وانەش ئەو گۆڕستانەی کە ٨٠٠٠ سەربازی ئەمەریکی تیادا نێژراوەو سەرۆکی ئەمەریکا ڕۆژی ٨-٥-٢٠٠٥ لە باشوری هۆڵاندا بەسەری کردەوە).

ڕەنگە هەر سیفەتی بەوەفایی سەگ بێت وابکات هەتا ئەمڕۆ هۆڵاندا بە شوێن ئەمەریکاوە بێت، کاتی دروست بوونی پەیمانی ناتۆ ساڵی ١٩٤٩ هاوپەیمانیەتی ئەم دوو وڵاتە قۆناغێکی تازەی بەخۆوە بینی، هۆڵاندا لە پێشەنگی ئەو وڵاتانە بوو کە بووە هاوپەیمانێکی سەربازی هەمیشەیی ئەمەریکا، هەتا ئەمڕۆش لە زۆربەی ناوچە ئاڵۆز و دژوارەکانی دنیادا لە هەر شوێنێک هێزەکانی ئەمەریکا پێویستیان بە هاوکاری سەربازی بوبێت

هۆڵەندا لەوێ ئامادە بووە، عێراق و ئەفگانستان و جەنگی کەنداو باشترین نمونەن.

ئەگەر لە شەڕی ساردی نێوان هەردوو بلۆکی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا هۆڵانداو ئەمەریکا هاوپەیمانێکی هەتا سەربووبێتن، ئەوا بێگومان لە شەڕی ساردو شەڕی گەرمیشدا دژ بە ئیسلامی سیاسی ئەو هاوپەیمانیە بەردەوام دەبێت بۆیە ڕاستەوخۆ پاش ڕووداوی ١١ی سێپتەمبەر حکومەتی هۆڵاندا پیلانێکی بۆ کارکردن دژ بە تیرۆریستان لە ٤٦ برگەدا ڕاگەیاند..

مینای ڕۆتەردام کە بە یەکێک لە بەندەرە جیهانیەکانی بازرگانی دەژمێردرێت ئێستا شان بە شانی پۆلیس و ئەفسەری هۆڵاندی ئەمەریکایەکانیش کۆنترۆڵی تەواوی هاتن و ڕۆشتنەکان دەکەن هەروەها بڕی بازرگانی ( هەناردن و هاووردن) یش چاودێری دەکەن ئەم هەنگاوەش تەنها لە بەر خاتری ئەوەیە نەوەکا تۆڕەتیرۆریستەکان یەکێک لە بۆشاییەکانی هاتوچۆ بۆ بەرژەوەندی خۆیان بقۆزنەوە، لەهەمان چوارچێوەشدا فڕۆکەخانەی ( سخیپهۆل - Schephol ) لە ئەمستەردام بە هەمان شێوە لە لایەن هێزەچاودێرەکانی ئەمەریکاوە کۆنترۆڵ دەکرێت.

ئەم بواری هاوکاریە زیاتر بە ناو ووردەکاریەکاندا شۆڕدەبێتەوە، لە نێوخۆی وڵاتیشدا بڕی هات و چۆی سەرمایەو پارەو پولیش بە ووردی دەخرێتە ژێر سەرنجی تیمە پسپۆڕەکانی ئەمەریکاوە، تیمێکی پسپۆڕ لە هەردوولا ئێستا سەرگەرمی ئەوەن تەکنەلۆژیای بایەلۆژی بەکار بهێنن بۆ ناسینی شوناس و کەسایەتی ئەوانەی کە سەفەردەکەن، تیمێکی دیکەی پسپۆڕان سەرگەرمی ئەوەن تواناکانی هۆڵانداو دەزگا هەواڵگریەکەی بەرزتر بکەنەوەو لەمەڕ ڕووبەڕووبونەوەی هێرشە تیرۆریستیەکان بە چەکی کیمیاوی یاخود بایەلۆژی ئامادەتربن.

جێگای سەرسوڕمان نی یە کە هۆڵاندا بە پێچەوانەی ئەڵمانیاو فەرەنساوە یەکێک بوو لە لایەنگرەکانی ئەمەریکا لە پرۆسەی ئازادکردنی عێراق و پاش پرۆسەکەش ١٤٠٠ سەربازی هۆڵاندی لە باشوری عێراق لە خزمەت هێزەکانی ئەمەریکادا بوون ، هەتا بەرواری ١٦-٢-٢٠٠٥ ژمارەی سەربازانی هۆڵاندا لە دەرەوەی وڵات ٢٤٧٤ سەربازبوون کە زۆربەی هەرەزۆریان لە عێراق بوون و لە مانگی ئازاردا کشانەوە، هەروەها لە کۆتایی مانگی فێبرواری هەمان ساڵدا بڕیاردرا ١٦٥ کۆماندۆزی تایبەت بە (کوشتاری تیرۆریستان) لە ئەفگانستان بخرێتە ژێر دەستی ئەمەریکاو

بەمەش ژمارەی گشتی هێزەکانی هۆڵاندا کە لەژێر فەرماندەی هێزە ئەمەریکایەکاندا لە ئەفگانستان کاردەکەن گەیشتە ٤٣٧ سەرباز.

### سەرەتاکانی ئیسلامی سیاسی:

هەروەک ئاشکرایە هۆڵاندا وڵاتێکی ئایین مەسیحیە بەڵام ساڵەکانی شەست ( هەروەک لە سەرەتادا باسمان کرد ) ژمارەیەکی زۆر کارگەری میوان و پەنابەرو خەڵکی مۆترۆپۆلەکانی خۆی ڕوویان لەم وڵاتە کرد، ئیتر لە نێو خودی هۆڵاندا ئایینێکی دیکە پەیدابوو، ئایینی قژ ڕەشەکان، ناموٚ بە کۆمەڵگای قژ زەردەکان، هۆڵاندیەکان لەم بارەوە دەڵێن ( ئەو ساتە هەڵە بووین کە بە دەستی خۆمان دوژمنێکی ناوخۆمان بۆ خۆمان دروست کرد ).
ئەم( دوژمنە ) و پەرەسەندنی و نەشوونماکردنی بابەتی ئەم بڕگەیەی ئێمەن، بزانین پاش سەرهەڵدانی ڕەوەندی ئیسلامی و بڵاو بوونەوەی، لە کەیەوە پرۆسەی بە سیاسی کردنی ئەو ڕەوەندەو ئایینەکەی دەستی پێ کرد و حکومەت و لایەنە بەرپرسەکان کێنگێ بە ئاگا هاتن.
نەک تەنها سەنتەرەکانی لێکۆڵینەوەی هۆڵاندا بەڵکو سەنتەرەکانی لێکۆڵینەوەی ستراتیژی لە زۆربەی وڵاتانی ئەوروپادا لە چەندین ئامازەی ترسناکی وەک پەیدابوونی ئەو ڕژێمانەی پشتیوانیان لە ئیسلامی سیاسی دەکرد لەوانە سودان و ئێران و عێراق و ئەفگانستان و تەنانەت لیبیاش نیگەران بوون. تەقاندنەوەی فرۆکەی پان ئامریکان ساڵی ١٩٨٨ لە ئاسمانی لۆکەربی ، جەنگی کەنداوی دووەم، هێرشی تیرۆریستە ئیسلامیەکان بۆ سەر بنکەی بازرگانی جیهانی ساڵی ١٩٩٥ ، هێرش بۆسەر میترۆکانی پاریس... هتد هەموو ئەمانە شایەنی ئەوە بوون کە تەواوی لایەنە بەرپرس و چاودێرەکان هەڵوێستەیەک بکەن.
ساڵی ١٩٩٢ وەزیری ناوخۆی هۆڵاندا **Len Dales** ئامازەی بۆ زیاد بوونی کۆچ بەرانی بێگانە کرد، ئەم وەزیرە ڕایگەیاند کە کۆچ بەرانی باکوری ئەفەریقا بە تایبەت مەغریبی و جەزائیری و کۆچ بەرانی باشوری ئەوروپا لە ئاییندەیەکی نزیکدا دەبنە گرفتی گەورە بۆ هۆڵاندا.
ساڵی ١٩٩١ بۆ یەکەم جار دەزگای زانیاری و ئاسایشی گشتی هۆڵاندا، لە ڕاپۆرتی خۆیدا ئامازە بە پەیدابوونی ئیسلامی سیاسی دەکات لە هۆڵاندا، ڕاپۆرتەکە سەرهەڵدانی چەندین گروپی بچوکی ئیسلامی چەکدار لێک

دەداتەوەو پێ ی وایە هەندێک لەو گروپانە بەکرێگیراوی دەوڵەتە ئیسلامی و عەرەبیە دکتاتۆرەکانن و ڕەنگە هەندێک کاری جاسوسی ئەنجام بدەن بەڵام هیچ زانیاریەکی دیارو ئاشکرا سەبارەت بە قەبارەو و تواناو ئاستی چالاکی ئەو گروپانە ناخاتە ڕوو.

ساڵی ١٩٩٤ دەزگای ناوبراو بە هاوکاری زانکۆی ( Erasmus ) لە ڕۆتەردام لێکۆڵینەوەیەکی چڕو پڕی ئەنجام داو لە ئاکامدا زۆر بە ووردی ئەو ڕێکخراوانە دیاری دەکات کە ڕاستە و خۆ یان ناڕاستەوخۆ پەیوەندیان بە ئیسلامی سیاسی و توندڕەوەوە هەیە.

لەو ڕاپۆرتەدا بە ووردی باسی چەندین تۆڕی تیرۆیستی نێو دەوڵەتی دەکرێت کە ئەندامەکانیان چالاکی خۆیان لە هۆڵاندا بەڕێوە دەبەن و لەبەر دەرگای مزگەوتەکانی خۆیانەوە کۆتایی بە بانگەشەی جیهاد و ئیسلام گەرایی ناهێنن بەڵکو پێیان وایە تەواوی دنیا دەبێت ئیسلامیزە بکرێت، بە ئەرکی سەرشانی خۆیانی دەزانن کار بۆ ئەوە بکەن ئیسلام بکەنە دەستور و یاسا لە تەواوی دنیادا..

ڕاپۆرتەکە پێ ی وایە ئەو ئیسلامیە توند ڕەوانە بە پلەی یەکەم (میسر)ین و پاشان جەزائیری و تونسی و مەغریبی و تورک دێن. هەروەک لە ڕاپۆرتەکەدا دەردەکەوێت، زۆربەی زۆری ئەو توند ڕەوانە وەک پەنابەر هاتونەتە ئەم وڵاتە، غەمی هەرە سەرەکیشیان ئەوە بووە کە لە هۆڵاندا مافی نیشتەجێ بوون وەرگرن بۆ ئەوەی هاموشۆکردنیان بە تەواوی دنیادا ئاسان بێت بە تایبەت کە دەیانزانی هۆڵاندا پاش سێ ساڵ یەکسەر ڕەگەزنامەی هۆڵاندی دەبەخشێت و ئەمەش وادەکات کە برگەکانی یاسا وەک هاولاتی هۆڵاندی مافەکانیان بپارێزێت.

ڕاپۆرتەکەی دەزگای هەواڵگری هۆڵاندا ناوی ١٣ گروپی تیرۆریست و توند ڕەوی هێناوە کە ئەمانەی خوارەوەن.

## ڕێکخراوی میللی گوروش Milli Görüş

ئەم گروپە فدراسیۆنێکی ئیسلامی هۆڵاندی پێک هێناوە، لە پەنا ناشیۆنالیزمی تورکەوە، پرۆگرامی فاشستی خۆی تێکەڵ بە ئیسلام دەکات، ئەم ڕێکخراوە کە تا ئەمڕۆ نەک هەر تەنها لە هۆڵاندا بەڵکو لە ئەڵمانیاش

زۆر چالاکە ئیسلامی بە تەواوەتی بە تورک کردووە (تورکاندووە) . کار بۆ ئەوە دەکات دەوڵەتی تورکیا بکاتە دەوڵەتێکی ئیسلامی و لە پێناو ئەمەشدا زۆر بە باشی بنەما دیموکراتیکەکان بۆ خۆی بەکار دێنێت. بە پێ ی زانیاریەکانی دەزگای هەواڵگری هۆڵاندا ئەم گروپە ساڵی ١٩٩٨ نزیکەی ٤٠ هەزار ئەندامی هەبووە، لەوانە پتر لە ٨ هەزاریان توند ڕەون و مەترسیان بۆ سەر کۆمەڵگای هۆڵاندا هەیە، لە مانگی شەشەمی هەمان ساڵدا ئەم گروپە لە شاری ئەمستەردام کۆبونەوەی خۆی گرێ دا و نەجمەدین ئەربەکانی کردبووە ووتە بێژی کۆنفرانسەکە.

### بزوتنەوەی تەبلیغ:

ئەم بزوتنەوەیە باڵێکی توند ڕەوو چەکداری گروپی یەکەمە، بڕوای بەوە هەیە بەزۆر بێت یان بە خۆشی تورکیا بکاتە وڵاتێکی ئیسلامی، ئەم بزوتنەوەیە کە بە بزوتنەوەی قاپلانیش ناو دەبرێت ساڵانە چەندین خۆپشاندان دژی ئیسرائیل و ئەمەریکا ساز دەکات ، ژمارەی ئەندامەکانیان لە هۆڵاندا پتر لە ٢٠٠ کەس دەبێت.

### پارتی خودای تورکی ( حزب الله) :

ئەم ڕێکخراوە کە تایبەتە بە موسڵمانە شیعەکانی تورکیا و لەسەر هەمان ڕێبازی ئێرانی دروست بووە، پەیوەندیان لەگەڵ ئێراندا هەیەو لە بانگەوازو ڕەفتارەکانیدا توند ڕەون و هەموو بانگەوازێکی دژ بە خۆرئاواو ئەمەریکاو ئیسرائیل ساز دەکەن. ژمارەیان نزیکەی سەد کەسی چالاک دەبن.

### بەرەی مەزنی ئیسلامی Islami Buyuk Akincilar- Cephesi

ئەم گروپە ساڵی ١٩٨٥ لە تورکیا دروست بووە، ئامانجی پێکهێنانی حکومەتێکی ئیسلامیە لە وڵاتدا لە نێو خۆی تورکیادا چەندین هێرشی

تیرۆریستی لە ژێر ناوی ئەم گروپەدا ئەنجام دراوە، بەڵام لە نێو هۆڵاندا پێ ناچێت ئەم گروپە زۆر چالاک بێت.

## پارتی بانگەوازی ئیسلامی ( الدعوة )

ئەم گروپە لە هەفتاکاندا لەلایەن حکومەتی لیبیاوە دروست کراوە، ئەرکی سەرەکی ئەم گروپە بریتیە لە بڵاو کردنەوەی ئایینی ئیسلام لە دەرەوەی وڵات، بەڵام چالاکیەکانیان ڕوخساری سیاسی هەیە، ڕەنگە ئەو مەلایەی کە لەشاری ئوترێخت بە تاوانی جاسوسی دەرکرایەوە بۆ لیبیا ساڵی ٢٠٠١ ئەندامی ئەم پارتە بووبێت.

## HUT حزبی تەحریر

ئەم ڕێکخراوە ئیسلامیە سونییە، لە بنەڕەتدا ساڵی ١٩٥٢ لە لایەن شێخ تەقیّ دین نەبهانی - یەوە لە ئووردون دروست بووە، بەڵام پاش ئەوەی لە سەرەتای شەستەکاندا نوسینگەکانی داخران بنکەو بارەگای خۆی بۆ پاکستان گواستەوە و پاشان لە ناوەندی ئاسیاش زۆر باش گەشەی سەند، ئێستا ئەم پارتە لە ٤٠ وڵاتی جیهاندا چالاکی هەیە ئەندامەکانیشی هەمەڕەنگن لەوانە ئاسیاوی و عەرەبی ، لە زۆربەی دەوڵەتە ئەوروپیەکان بنکەو ڕێکخراویان هەیە، بەڵام زۆرترین ئەندامانیان لە بەریتانیا دەژین چونکە بەریتانیا زۆرترین ژمارەی ڕەوەندی پاکستانی تیادا دەژی، ئەم حزبە کە لەسەر تۆڕی ئەنتەرنێت ماڵپەڕی خۆی هەیە و بە چەندین زمانی دنیا پڕوپاگەندەی ئیسلامی دەکات، ڕۆژی ٢٤-١٢-٢٠٠٤ لە ڕاپۆرتی تازەی دەزگای هەواڵگری هۆڵاندا باسی گەشە سەندن و هەڕەشەی جدی ئەم حزبە دەکات، بۆیە حزبی ناوبراویش ڕاشکاوانە لە نامەیەکی ئاشکرای خۆیدا سێ ڕۆژ پاش ئەوە وەڵام دەداتەوەو بەرگری لە ڕەوابوونی خۆی دەکات، لەو نامەیەدا دەڵێت ( ئێمە بۆ دوژمنایەتی هۆڵاندا دروست نەبووین و نامانەوێت هۆڵاندا بخەینە ژێر هەڕەشەوە خۆ ئەگەر ئەو نیازەمان هەبێت بە ئاشکرا دەیکەین و دەیڵێین).

### پارتی خودای لوبنانی ( حزب الله ):

ئەمە حزبێکی لوبنانیە دژ بە ئیسرائیل کار دەکات، بەڵام دەیەها ئەندام و سەدەها لایەنگریان لە هۆلاندا هەیە، جۆری کارو چالاکیەکانیان زۆر ڕوون نیە، بەڵام بە هۆی پەیوەندی قووڵیان لەگەڵ سوریاو ئێراندا گومانی جاسوسیشیان لەسەرە.

### بزوتنەوەی حەماس

لە بنەڕەتدا ڕێکخراوێکی فەلەستینیە کار بۆ لەناوبردنی ئیسرائیل و دەوڵەتی ئیسلامی فەلەستینی دەکات. دەیەها فەلەستینی لە هۆلاندا کار بۆ ئەم ڕێکخراوە دەکەن، ژمارەی ئەندامانی دیار نیەو هەوادارانیشی زۆرە، ئەم ڕێکخراوە زیاتر لە فەلەستین کاری خۆی دەکات بەڵام گومانی پەیوەندیشی لەگەڵ ڕێکخراوە تیرۆیستەکانی دیکە زۆرە.

### جیهادی فەلەستینی

بەهەمان شێوەی حەماس، خۆی فەلەستینییە و کار بۆ لەناوبردنی ئیسرائیل دەکات، لە نێو هۆلاندا هەوادارانی هەیە، گومانی پەیوەندی تیرۆریستی زۆرە، ئەندامانی هەیە ، بەڵام ژمارەیان ئاشکرا نین.

### کۆمەڵەی ئیسلامی ( الجماعه الاسلامية):

گروپێکی تیرۆریستی ئیسلامی میسرین، لە نێو خودی میسردا دژی حکومەتی میسری کار دەکەن و بۆ پێک هێنانی دەوڵەتێکی ئیسلامی تێدەکۆشن ، لە هۆلاندا چەندین ئەندامیان هەیە بەڵام بەهۆی هەڵهاتن

ودەستگیر کرانی زۆربەی ئەندامانیان لە میسر ئێستا چالاک نین و زیاتر هەواداری ڕێکخراوی تیرۆریستی ئەلقاعدەن.

### بەرەی ئیسلامی تونس

ئەم ڕێکخراوە باڵێکی جیابۆوەیە لە ڕێکخراوێکی دیکەی تونسی بەناوی بزوتنەوەی ڕابوونی ئیسلامی تونسی( حرکة النهضة )، ئەم ڕێکخراوە کار بۆ دامەزراندی دەوڵەتێکی ئیسلامی لە تونسدا دەکات ، زۆربەی سەرکردەکانیان لە هۆڵاندا دەژین و بەردەوامن لە پەیوەندی کردن بە ڕێکخراوەکانی دیکەوە.

### سوپای ئیسلامی جەزائیری

ئەم گروپە باڵێکی جیابۆوەیە لە بەرەی ئیسلامی فریاکەوتن( الانقاذ ) ئەندامەکانیان کەمن و ژمارەیەکیان پەنابەرن لە هۆڵاندا، چالاکیان ڕوون نیە.

### بزوتنەوەی ئیسلامی مەغربی

بە هەمان شێوە کۆمەڵێکی توند ڕەوی کۆنە پارێزن، لە نێو مەغریبیەکاندا کار دەکەن و بڕوایان بە بنەمای سەلەفی ئیسلامی هەیە.

هەرچەندە لە نێوان ئێستاو ساڵی ١٩٩٤ جیاوازیەکی زۆر هەیە، هەروەک چۆن گۆڕانکاریەکانیش زۆرن، بەڵام لە دوو توێ ی ئەو ڕاپۆرتەدا چەندین ڕاستی دەتوانین بەر جەستە بکەین.
یەکەم / سەرباری ئەوەی ئیسلامی سیاسی بەو شێوەیەی ئێستای لە ساڵی ١٩٩٤ دا خۆی لە ئەوروپادا ڕێک نەخستبوو بەڵام قەبارەی ڕێکخراوەکان و ژمارەیان لە وڵاتێکی دیموکراتی وەک هۆڵاندا مایەی سەر سوڕمانە.

دووەم/ پێشکەوتنی تەکنەلۆژیای پەیوەندی و گواستنەوە لەو ساڵەدا لە چاو ئێستا هێندە پێشکەوتوو نەبوو کەچی ژمارەی ڕێکخراوەکان لە چاوخۆیاندا زۆرن.
سێهەم/ تیرۆریزم بەو جۆرەی ئەمڕۆ گلۆباڵیزە نەببوو، بۆیە قەبارەی هەڕەشەکانیان تا ئەو دەمە هێندە جدی نەبووە.
چوارهەم/ زۆربەی ئەندامانی ئەو گروپانە لە پەنابەرەکان پێکهاتوون کە لەوڵاتی خۆیان هەڵهاتوون و لە هۆڵاندا داوای مافی پەنابەریان کردووە، بەڵام ئێستا زۆربەیان یان ڕەگەزنامەی هۆڵاندیان هەیە یاخود هەر لە هۆڵاندا لە دایک بوون، ئەمەش وادەکات پانتایی چالاکی و یاری کردنیان فراوانتر بێت.
پێنجەم/ هەندێک لەو ڕێکخراوانەی کە لە ڕاپۆرتەکەدا ناویان هاتووە بە پێ ی گۆڕانی بارودۆخی وڵاتەکەی خۆیان ڕەنگە چی دی چالاک نەبن بەڵام ئەندامەکانیان ڕەنگە لە نێو گروپە تازەکانی توند ڕەوی ئیسلامیدا خۆیان دیبێتەوە.
ئەگەر بەووردی سەرنجی ئامانج و جۆری چالاکی و چەندایەتی ئەندامەکانی ئەو ڕێکخراوانە بدەین، دەتوانین بەم سێ جۆرەی خوارەوە پۆلێنیان بکەین:
١- ئەو کەس و ئەندام و ڕێکخراوانەی کاری جاسوسی بۆ وڵاتانی دیکە دەکەن و لەلایەن ئەو وڵاتانەوە بۆ هەندێک کاری تایبەت ڕاسپێردراون و لە ڕێگای ئەو ڕێکخراوانەوە کاری خۆیان پەردەپۆش دەکەن.
٢- ئەو ئەندام و ڕێکخراوانەی بانگەوازی ئایینی و پروپاگەندەی ئیسلامی دەکەن و دژی دەوڵەتەکانی خۆیان چالاکن و کاریان بەسەر هۆڵانداوە نی یە.
٣- ئەو ئەندام و ڕێکخراوانەی کاری پروپاگەندەی ئیسلامی و توندڕەوی و جیهادی بڵاو دەکەنەوە و لە ڕێگای ئەنجام دانی کردەوە تیرۆریستیەکانەوە دەبنە هەڕەشە بۆ سەر ئاسایشی هۆڵانداو ئامانجیان ئەوەیە بەهاو یاسا ئیسلامیەکانی خۆیان بەسەر کۆمەڵگای هۆڵاندیدا بسەپێنن.
ئەو پۆلێن کردنەی سەرەوە بۆ تێگەشتن لە نیازەکانی ئەو گروپانەو چۆنیەتی ڕووبە ڕووبونەوەیان بە سوودە بەڵام لە هەمان کاتدا خوێنەر بە قەبارەی ( جۆری سێ هەم ) کە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە ئاسایشی هۆڵانداوە هەیە ئاشنادەکات. پاش سەرنج دانی ڕاپۆرتەکانی دیکەی دەزگای

هەواڵگری هۆڵاندا بۆمان دەردەکەوێت کە هەمیشە جۆری سێهەم لە پۆلێن کردنەکەدا ڕوو لە زیاد بوون بووە.
ڕاپۆرتەکانی دیکەی دەزگای ناوبراو، بە ڕادەیەکی زۆر تا ڕووداوەکانی ١١ ی سێپتەمبەر چونیەکە، بەهەمان شێوە ئامارژە بە ڕێکخراوە توندڕەوەکانی بزوتنەوەی ئیسلامی سیاسی دەدەن.
ڕاپۆرتی ساڵی ١٩٩٥ بۆ یەکەم جار ئامارژەی ترسناک بە زیاد بوونی دژایەتی و ڕقەبەرایەتی کردنی بەها ڕۆژئاواییەکان دەدات، ئەو ڕاپۆرتە لە دەرئەنجامدا دەڵێت : زیاد بوونی شەپۆلی دژایەتی کردنی فەرهەنگ و بەها بەنرخەکانی کۆمەڵگای خۆرئاوا زیان بە ئاوێتە بوون دەگەیەنێت.
بەهەمان شێوە بابەتی سەرەکی لە دەرئەنجامەکانی ڕاپۆرتی ساڵی ١٩٩٦ و١٩٩٧ ئامارژە بە زیاد بوونی خێرای ڕادیکاڵە ئیسلامیەکان دەدات، ئەم ڕاپۆرتە تیشک دەخاتە سەر هەوڵی بێ ووچانی ڕێکخراوە ئیسلامیەکان بۆ دژایەتی کردنی فەرهەنگی خۆرئاوا، ڕاپۆرتەکە ڕۆڵی نەگەتیفی ڕێکخراوەکان دەخاتە بەر چاو کە چۆن ڕەوەندی ئیسلامی دژی ئاوێتە بوون هان دەدەن و داوایان لێ دەکەن زیاتر بەها پیرۆزەکانی ئیسلام بایەخ پێ بدەن لە جیاتی ئەوەی بەشداری چالاکانە لە کۆمەڵگای هۆڵاندیدا بکەن.
ساڵی ١٩٩٨ ڕاپۆرتی هەواڵگری هەنگاوێکی تازەی لە هەڵسەنگاندنی ڕێکخراوە ئیسلامیەکان و ڕەوەندەکەیان هەڵهێنا، لەم ڕاپۆرتەدا چەند خاڵێکی تازەو گرنگ ووروژاون، باس لەوە دەکەن کە ڕەوەندی ئیسلامی زیاتر بەرەو سیاسی بوون و ڕادیکالی بوون بڕوات:-
١- ڕاپۆرتە کە دڵنیایە لە پەیدابوونی ڕێکخراوی توند ڕەوو ڕادیکالی ئیسلامی ، بەڵام قەبارەیان بە ( زۆر بچوک ) ناو دەبات.
٢- ڕۆڵی ئاشکرای مزگەوت و قوتابخانە ئیسلامیەکان بە خراپ ناودەبات.

سەبارەت بە خاڵی یەکەم ڕاپۆرتەکە دیسانەوە دەڵێت کە زۆربەی چالاکی ئەو گروپانە لە نێو خودی گروپە بچوکەکانی خۆیاندایەوە زیاتر ئاراستەشیان بەرەو وڵاتی خۆیانە.
سەبارەت بە خاڵی دووەمیش ڕاپۆرتەکە جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە مزگەوتەکان بە شێوەیەکی زۆر خراپ بەڕێوە دەبرێن، ئەو ئیمامانەی تیایدا ووتار بێژن توند ڕەون و هەندێکیان نەک بێ لایەن نین بەڵکو سەربە گروپی ئیسلامی سیاسی توندڕەویشن.

لە شیکردنەوەی خۆیدا ڕاپۆرتەکە دیسانەوە خەمی ئاوێتە بوون دەخوات و دەڵێت ( ئەوەی دەبێتە مایەی هەڕەشەیەکی جدی بۆ ئاییندەی وڵات بریتیە لە هەوڵەکانی ئیسلامی ڕادیکاڵ و سیاسی لە مەڕ دوور خستنەوەی ڕەوەندی ئیسلامی لە ئاوێتە بوون، ئەوانە پێیان وایە ئاوێتە بوون لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی توانەوەی تەواوی موسڵمانان لە نێو فەرهەنگی ڕۆژئاوادا، بۆیە ئەوانە ئەم کارە نەک حەرام دەکەن بەڵکو داواش لە ڕەوەندی خۆیان دەکەن کە شوناسی ئیسلام بکەنە شێوازێک بۆ بەرەنگاری کردنی ئاوێتە بوون، ئەمەش وادەکات هەرچی زیاترە ڕەوەندی ناوبراو لە کۆمەڵگای هۆڵاندی دابڕێت).
مەترسیەکی دیکەی واقعی کە ڕاپۆرتەکە دیسان ئاماژەی پێدەدات بریتیە لە پەرچەکرداری هۆڵاندیە ڕەسەنەکان و پێ ی وایە لە بارودۆخێکی ئاوها بە گوماندا هۆڵاندیەکانیش ئامادە نابن کە ئاوێتە بوونی ڕەوەندی ئیسلامی قبوڵ بکەن بەڵکو ئەوانیش زیاتر دەکەونە بەرامبەر و ئاکامەکەشی لە دەستدانی ئەو ( بەخشندەیی ) یە کە چەندین ساڵە هۆڵاندای پێ ناسراوە.

## تابوری پێنجەم:

بەر لە خوێندنەوەی ئەو هەموو ڕاپۆرتانەی دەزگای هەواڵگری هۆڵاندا، پێم وابوو ووشەی تابوری پێنجەم تەنها پاشخانێکی ڕۆژهەڵاتی هەیە، چونکە لە کۆمەڵگا ڕۆژهەڵاتیەکاندا زۆر جار بە بێ بوونی بەڵگەش نازناوی تابوری پێنجەم بە چەپ و ڕاستدا بەسەر ئەم و ئەودا دەسەپێنرا، بەڵام پاش هێرشەکانی سێپتەمبەری ئەمەریکا دەزگای ناوبراو ترسێکی تازەی لێ پەیدابوو:
( چەند ڕۆژێک پاش هێرشەکەی مانهاتن لە ١١ی سێپتەمبەری ٢٠٠١، پۆلیسی هۆڵاندابەسەرپەرپەرشتی ئەو دەزگایە چوار گومان لێکراوی دەستگیر کرد، هۆی دەستگیر کردنی ئەو چوار کەسە ئەوەبوو کە ڕەنگە ئەوانە هێرشی تیرۆیستی ئەنجام بدەن و دەستێک بووەشێنن)
ڕاپۆرتەکە زیاتر دەڵێت( لەمەڕ کاریگەری ئەو هێرشانەوە بۆسەر پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانی نێوخۆی کۆمەڵگا ئاماژەی خراپ هەنە، جیاکردنەوەی موسڵمان لە ناموسڵمان، جیاکردنەوەی موسڵمانی ئاسایی لە توند ڕەوەکان کارێکی ئەستەمە، دوژمنایەتی کردنی ئیسلام وسەپاندنی

وێنـەیـەکـی دوژمنانـە بـەسـەریدا لـە ئانیـدەدا بـرەو دەسـێنێ، بـە ڕاسـتی هەڕەشەیەکی زۆر مەترسی دارە کاتێک هەموو موسڵمانە هۆڵاندیـەکان وەک تابوری پێنجەم سەیر بکرێن).

هێرشەکانی سێپتەمبەر نەک تەنها ئەمەریکای ناچار کرد جەنگی دژ بـە تیرۆر ڕاگەیەنێت و نیشانەی پرسیار بخاتە سەر هەرشتێک کە لـە دوور یان نزیک پەیوەندی بە ئیسلامەوە هەبێت، بەڵکو دەوڵـەتـانی دیکـەی دنیاشی ناچارکرد بکەونە خۆ بۆ ئەوەی هاوشێوەی ئەو هێرشانە لە وڵاتی ئەوانیشدا ڕوو نەداتەوە.. ئیتر هۆڵانداش کەوتە خۆی هەروەک لە پێشەوە باسمان کرد، بەشی هەواڵگری خۆی گورج کردەوە چاوێکی بۆ ئیسلامی سیاسی کردە ١٠ چاو ئیتر لێرە بەدواوە هەروەک ڕاپۆرتەکە گوتی ( هەموومان ، هەمووتان ، هەموویان ) تابوری پێنجەمن و گومانی ئەوە هەیە لـە سوچێکەوە پیلانی دارێژراو هەبێت دژ بە وڵات...

لەمەودوا ئیتر پێویست بەوە نەما دەزگای هەواڵگری هەمیشە بـە دەیان بەڵگەوە بێ ئاکامانە وڵات و پارلەمان و پارتەکان لە هەڕەشەکان ئاگادار کاتەوە چونکە ئیتر وڵات خۆڕسکانە بەرەیەکی لە نێوان ئەو دوو بەرەیەدا هەڵبژارد کە سەرۆک بۆش دیاری کردبوو ( لـەگـەڵمابـە یان دژم بـە )، ئیتر هۆڵاندا ڕاشکاوانە کەوتەبەرەی یەکەم و بەرامبەر بە تیرۆریستی جیهانی لەگەڵ ئەمەریکادا هاوسەنگەر بوو...

هێرشەکانی سێپتەمبەر سنورێک لـە سنورە هەرە دیارەکانی شکاند کـە ئەویش بریتی بوولە شوناسی مرۆڤی تیرۆریست و تیۆری تابوری پێنجەمی باشتر چەسپاندو بەڵگەیەکی باشتری دا بەدەست هەموو ئەوانەی بـە گومانەوە سەیری مرۆڤی بێگانە دەکەن ( با سیخ بێت و موسڵمانیش نەبێت[٢٩] ) ئەو ئیسلامیە توند ڕەوانەی سەر بە ڕێکخراوی تیرۆریستی ئەلقاعدەن، بۆ بەهەڵەدا بردنی دوژمنەکانیان بـە پێچەوانەی برا موسڵمانەکانی دیکەیان کۆمەڵێک ڕەوشی نا ئیسلامیان پەیڕەو دەکرد لەوانە کەسیان ڕیشیان نەدەهێشتەوەو تەنانەت سمێڵیشیان دەتاشی و کحولیان دەخواردەوە، تەمەنێکی درێژی ژیانیان لـە چەندین وڵاتی دنیادا بەسەر بردووە، شێوازی کاریشیان بە شێوەی کۆمەڵی بچوک و بڵاوبونەوەشیان لە شێوەی ( شانەی سڕ یاخود نوستوو ) بووە، بە پێچەوانەی ڕاپۆرتی سەرەتای نەوەتەکان، کە زۆربەی ئەندامانی گروپە سیاسیە ئیسلامیەکان پەنابەرو هەڵهاتوو بوون لـە وڵاتانی خۆیانەوە، لەمەودووا تۆڕەکانی ئیسلامی سیاسی پێک دێن لەو ئەندامانەی کە چەندین ساڵە لـە

ئەوروپا یاخود ئەمەریکا ژیاون و پلەی خوێندنی باڵایان هەیە، هۆڵاندیش بە هەمان شێوە ڕووبەڕووی ئەو ئەندامانە دەبێتەوە لە گروپی ئیسلامی سیاسی کە زۆربەیان لە هۆڵاندالە دایک بوون یاخود ڕەگەزنامەی هۆڵاندیان هەیە ، سەرەتاکانی ئەم ڕاستییەش ئەو کاتە دەرکەوت کە دوو هاوڵاتی هۆڵاندی بە ڕەچەڵەک مەغریبی پاش ئەوەی لە هۆڵانداوە مێشکیان داشۆرابوو، کرابوونە ئەندامی ئەلقاعیدەو بەمەبەستی بەشداری کردن لە جیهاد دژی دوژمنانی ئیسلام لە لایەن سەربازە هندیەکانەوە لە ناوچەی کشمیر مانگی ژانیوەی ساڵی ۲۰۰۱ کوژران. (خالد الحسناوی و احمد باکاولی ) کە لە نەوەی دووەمی مەغریبیەکانی هۆڵاندان، پلەی خوێندنی بەرزیان هەبوو، وێرای ئەوەش لە نێو گروپێکی دیکەی هاوەڵەکانی خۆیاندا دەستنیشان کرابوون کە هەمان سیفاتیان هەبوو.

سنوری گومانەکان و چوارچێوەی تابوری پێنجەم بۆ پانتایی جوگرافیایەکی فراوانتر درێژ دەکرێتەوە، بۆیە لامان سەیر نی یە کە ڕاستەو خۆ پاش ڕووداوەکانی سێپتەمبەر بە چەند ڕۆژێک لە هۆڵاندا چوار گومان لێکراو دەستگیر بکرێن و پاشان لەبەر نەبوونی بەڵگەی تەواو ئازاد بکرێن، لامان سەیر نی یە لە فەرەنسا لەچکی کچانی موسڵمان ( حجاب) بکرێتە هەڕەشە بۆ سەر شارستانیەتی ڕۆژئاوا.

درێژ بونەوەی سنوری گومان و تابورەکانی پێنجەم ڕاستەوخۆ لە لایەن حکومەتە ئەوروپیەکانەوە بە تەنها و لە خۆڕا ئەنجام نادرێن بەڵکو هەمیشە هاندەرێک وادەکات کە ئەوانە دەست پێشخەر بن نەوەک ۱۱ی سێپتەمبەرێکی دیکە یاخود ۱۱ی ئازارێکی دیکە دووپات بنەوە، لێکوڵینەوەکانی پۆلیسی هۆڵاندا لەم بوارەدا ئەوڕاستیەی خستەڕوو کە ئیسلامی سیاسی بۆ جێ بە جێ کردنی پیلانەکانی خۆی زۆری لا ئاسایی یە سنورە ڕەهاکانی ئایینی ئیسلامیش ببەزێنێت وجەنگی دەرونی و دیماگۆگیەت و پڕۆپاگەندەی سیاسیش بکاتە شێوازی خۆی ، گروپی ( شانەی پایتەخت ) کە چەندین جاری دیکەش ناومان بردوون توانیبویان سێ ئافرەتی موسڵمان ( فاتیمە ، نەعیمە، خەدیجە ) دەماغ شۆر بکەن و لە ئاییندەیەکی نزیکدا لە کردەوە تیرۆریستیەکانی خۆیاندا بەکاریان بێنن.

موحەمەد. ب سەرۆکی گروپەکە و بکوژی ڤان خۆخ کە ناوی خوازراوی (ئەبو زوبێر ) ی بەکار دەهێنا، بە دەستی نەعیمەدا کتێبێکی بە ناوی (بانگەوازی جیهاد ) گەیاندە دەست عەیان حرسی عەلی ، پیلانەکەشی هەر ئەوە بوو کە بەدەستی یەکێک لەم سێ ئافرەتە ئەم لە دین وەرگەڕاوە تیرۆر بکات.

ڕەوشی عێراقیش باشترین هەل بوو بۆ ئەم گروپانە کە هەستی ناسکی ئایینی لاوەکان با بە درۆش بێت بجولێنن، ئەمانە هەستان بە نوسینی نامەیەک گوایا لە زیندانی ئەبو غریبەوە ڕەوانە کراوە، ئەم نامەیە کە هیچ کەناڵێکی دیکە پشتڕاستی نەکردۆتەوە و ناوەڕۆک و شێوازی نوسینیشی لە دەستکرد دەچێت لە نێو ژوورو ماڵپەڕەکانی گفت و گۆی ئەم گروپەوە بڵاو کراوەتەوە، ئەم نامەیە کە زۆر ئاشکرا شێوازی نوسینی مەغریبی پێوە دیارە ئەگەر لە ڕاستیەوە نزیک بوایە بەر لەوەی بکەوێتە دەستی ئەم گروپە دەکەوتە دەستی دەیان گروپی هاوشێوە لە عێراق و ئەوان نان و پیازیان پێوە دەخوارد باس لەوە دەکات کە خوشکێکی موسڵمان بە ناوی فاتیمە هاواری بۆ ئەمان هێناوە و داوای یارمەتی دەکات. ئەم نامەیە کە پێ دەچێت لە کۆتایەکانی ساڵی ٢٠٠٤ دا نوسرابێت لە ژێر ناوی فاتیمەدا دەڵێت ( جگە لە خۆم ١٣ ئافرەتی دیکە کە هەر هەمومان کچ بووین لە لایەن سەربازەکانی ئەمریکا، نەوەکانی بەرازو مەیمونەوە ڕەیپ کراوین) هەروەها لە کۆتایی نامەکەدا فاتیمە داوا لەبراکانی دەکات کە بچن بۆ عێراق و بەشداری لە جیهاددا بکەن.

بەم جۆرە لەمەو دووا ئیتر تیۆری تابوری پێنجەم تەنها لە ڕوخسارو دەموچاوە پرپرسیارو گومانەکانی هۆڵاندیەکاندا بەدی ناکرێن، لە مەودووا ئەم تیۆرە پەل دەکوتێتە ناو یاساو دەکرێتە برگە، هاوشێوەی ئەمەریکا هۆڵانداش بەبێ بوونی بەڵگەی تەواو و تەنها بە بوونی گومان هەر کەسێکی توند ڕەو یاخود گومان لێکراو دەتوانێت پەلکێشی دادگا بکات.. لەم چوارچێوەیەدا هەنگاوەکانی دەرکردنی ئیمامی مزگەوتەکان و لێ سەندنەوەی ڕەگەزنامەی هۆڵاندی دەستی پێکردو لە کۆتایی مانگی فێبەروەری ساڵی ٢٠٠٥ دا سێ ئیمامی مزگەوتی فورقان لە شاری ئاییندهۆفن لە هۆڵاندا وەدەرنران و دەزگای هەواڵگریش بەبێ مۆڵەت نامەی وەزارەتی داوەری گشتی دەتوانێت لەمەولا مکرۆفۆن و کامێرا نهێنیەکانی خۆی لە هەرسوچێکدا لە ماڵان و لە مزگەوتەکاندا کە ئەندامانی تابوری پێنجەمی تیادا دەژین هەڵواسێت...

## گەڕان بەدووی نهێنیەکاندا لە نێو تەنەکەی خۆڵدا:

ئەوەی لە حکومەتی هۆڵاندا شاراوە بوو، یاخود ئەوەی دەزگای هەواڵگری هۆڵاندا بە دوویدا دەگەڕا لە نێو تەنەکە خۆڵەکانی ئەمەریکاو کۆنە کۆمپیوتەرەکانی قەندەهار دۆزرانەوە، چیرۆکی کچەجولەکەی هەڵهاتوو لەدەست موسڵمانە عێراقیەکانی شاری بەسرە لە ساڵی ١٩٦٨ و پەنا بردنی بۆ کووردستان و پاشان بۆ ئیسرائیل و ئەوجا بۆ ئەمەریکا، چیرۆکێکی سادەو داڕێژراو نیە بەڵکو چیرۆکێکە بڕیاری تۆڵە سەندنەوە سەرەتاکانی داڕشتووە، تۆڵەسەندنەوەی کچە جولەکەیەک لەو موسڵمانانەی کە پاش پێست گورینی باوکی و دەست بەسەرداگرتنی ماڵ و موڵکی لە لایەن ئەو عەرەبە قەومیانەی لە گەڵ بەعسیەکاندا دەست بەکار بوون، ڕقێکی ئەستوری دژ بە موسڵمانان بڕیاری تۆڵەی پێ دەدات.

سەرەتا کچە جولەکەی هەڵهاتوو لە کووردستان دەحەوێتەوە پاشان هەر لەوێوە ئاودیوی سنور دەبێت و خۆی دەگەیەنێتە ئیسرائیل، بۆ خوێندن ڕوو لەئەمەریکا دەکات و پلەی خوێندنی باڵا وەردەگرێت و لە یەکێک لە سەنتەرەکانی لێکۆڵینەوە دەست بە توێژینەوەی خۆی لەسەر ئیسلامی سیاسی دەکات، لەبەر ئەوەی زمانەکانی عەرەبی و ئینگلیزی و عبری وەک یەک دەزانی کارەکەی زۆر بەرەو پێشەوە دەچوو، ئەم جارەیان بە پێچەوانەی بەدبەختیەکانی جارانی، بەخت یاری دەبێت و ڕووداوەکانی ١١ ی سێپتەمبەر کارەکەی پڕ بایەختر دەکات، ئەو توێژینەوەکەی خۆی دەست پێکردبوو کاتێک ڕۆژانە تیرۆریستەکانی حەماس و جیهاد لە نێو سوپەر مارکێت و ریستوڕانت و شەقامەکانی ئیسرائیلدا کاری خود کوژیان ئەنجام دەدا، پاش ئەوەی ئیسرائیل خانووەکەیانی دەڕووخاند دەستبەجێ تازەترین خانوویان وەردەگرتەوە و چەندین هەزار دۆلاریش بە دیاری بە خێزان و منداڵیان دەدرا.

کچە جولەکەی ڕق ئەستور بڕیاری دا سەرچاوەی ئەو پارانە بدۆزێتەوە، پێشتر چەندین جار ڕاوێژی دابووە لایەنە بەرپرسەکان بۆ چاودێری کردنی ڕێکخراوە خێر خوازەکانی سعودیە بەڵام لەبەر نەبوونی بەڵگە هەمیشە ئەم راوێژانە پشت گوێ دەخران ، بۆیە ئەم جارەیان بڕیاری دا خۆی کارەکە بکات، بۆیە بەناوی کچە موسڵمانێکی خێرۆمەند کە نیازی وایە بڕێک پارە

بکات بە خێر، لەگەڵ ڕێکخراوێکی ئیسلامیدا پەیوەندی گرت و داوای زانیاری لێکردن.
کچە جولەکە خۆی هەندێک زانیاری هەبوو ، بەڵام لەبەر ئەوەی بە زمانی عەرەبی داوای زانیاری کربوو کۆمەڵێک زانیاری زۆری بە عەرەبی وەرگرت وبە بەراوورد کردنی ئەو زانیاریانە بە بڵاوکراوە ئینگلیزیەکان بۆی دەرکەوت جیاوازیەکی زۆر هەیە و بڵاو کراوە ئینگلیزیەکان زۆر بە لاوەکی باسی کارە خێرخوازەکانی ئەو ڕێکخراوانە دەکەن، بەڵام هەرچی بڵاوکراوە عەرەبیەکانە زانیاری زۆرووردتر پێشکەش دەکات بۆیە بڕیاری دا سەردانی ئەو ڕێکخراوانە بکات و لە نزیکەوە ئاگاداری کارەکانیان بێت.
کچە جولەکە عاباو پەچەی لەسەر کرد و خۆی کردە موسڵمانێکی تەواو سەردانی ڕێکخراوەکانی کردو خۆی کردە دۆست و هاوەڵیان، زۆربەیانی ناسی و ماڵیان شارەزا بوو، کارەکانیانی بۆ دەرکەوت و لە پاشاندا لەبەر (دڵسۆزی و لێهاتوویی ئەم خوشکە موسڵمانە) چەندین جار کرا بە نوێنەری ڕێکخراوەکانیان و تەنانەت بڕیار دەریش...
ئێستا ئیتر کچە جولەکە زۆر ڕاستی بۆ ڕوون بۆوە، بەڵام پێویستی بە بەڵگە بوو، بۆ ئەم کارەش دەمێک بوو خۆی ساز دابوو، کۆماپانیایەکی خۆڵڕشتنی دامەزراند و چەند کرێکارێکی بە کرێ گرت بەبێ ئەوەی کرێکارەکانیش بزانن کە ئەم کۆمپانیایە فڕی بەسەر خۆڵ ڕشتنەوە نی یە، کۆمپانیای کچە جولەکە تەنها تەنەکە خۆڵی ئەو ماڵ و شوێنانەی کۆ دەکردەوە کە خۆی مەبەستی بوو، خۆڵەکانیشی دەهێنایە نێو شوێنێکی تایبەت و تەنها خۆی دەکەوتە کردنەوەی یەکە یەکە کیسە خۆڵەکان و هەرچی نامەی نوسراوی نهێنی و بڕی پارەی ئاراستە کراوی نهێنی و ژمارەی بانکی و تەنانەت ئەو کەسانەی کە هاتو چۆ دەکەن و چەندین نهێنی دیکەش هەمووی لە نێو تەنەکە خۆڵدا دەرهێنایەوەو پشتی ڕێکخراوەکانی (الحرمین و الاقصی و الوقف ) و چەندین کەسایەتی دیکەی پێ شکاند، بەجۆرێک کە تەنها لە سعودیە ٤٠٠ ڕێکخراوی لەو جۆرە داخران...
هاوکات لەگەڵ پشکنینەکانی ئەم کچەدا پارێزەری بەناوبانگی ئەمەریکی( Ronald Motley ) بە ناوی ٣.٩٦٥ کەس لە قوربانیەکانی سێپتەمبەر تیمێکی پسپۆڕی لە ٥٠ توێژەرەوەو پشکنەر پێک هێنا، ئەم پارێزەرە کە پاشان سکاڵای لە دژی ٢١٣ کەسایەتی و ڕێکخراو لە دادگای ئەمەریکا تۆمار کردو مانگانە بڕی ٤٠٠ هەزار دۆلاری بۆ کارەکانی تەرخان کرد..

کارەکانی ئەم پارێزەرە تا دەهات و ووردترو ئاڵوز تر دەبوون، بە ۸۰ هەزار دۆلار کۆمپیوتەرەکەی (موحەمد عەتا) ی سەرۆکی ئەنجام دەرانی کارە خۆکوژیەکەی ئەمەریکای لە قەندەهار دۆزیەوە، ژمارەی نهێنی بانکی ( ئوسامە بن لادن ) ی لە بانکی سویسرا پەیداکرد، پاشان لە بۆسنەی هەرزۆگۆڤین تیمە پسپۆڕەکانی بواری کۆمپیوتەری ناردو گرێ ی تەواوی کۆمپیوتەرەکانی ۲۵ ڕێکخراوی خێر خوازی ئیسلامی کردەوە هەرچی زانیاری فرە دراوی ناو کۆمپیوتەرەکانیش بوو دەری هێنانەوە، ئەم پارێزەرە تەنانەت ئەوەشی ئاشکرا کرد کە شازادە ( تورکی الفیصل) ساڵی ۱۹۹۸ هەستاوە بە سەردانی ڕێکخراوی ئەلقاعدەو بەرامبەر بە ٤۰۰ ئوتۆمبێلی جۆری لاندکرۆزی تازە، بەڵێنی لە ڕێکخراوەکە وەرگرتبوو کە دەست بۆ بەرژەوەندیەکانی سعودیە نەبەن..
ئەوەی لەم دوو توێژینەوەیەدا ئاشکرا بوو ئەوە بوو کە ڕێکخراوی ئەلقاعدە لە ئەوروپا باندی زۆر گەورەی هەیەو ڕووداوی ۱۱ ی سێپتەمبەر تەنها دەستپێکەو زۆری دیکەش بە ڕێوەیە.

### هۆڵاندا.. باخچەی پشتەوەی ئیسلامیەکان:-

ڕێکخراوی ئەلقاعدە هەتا ئەو دەمە لە ۳۵ وڵاتی ئەوروپی ( ڕۆژئاوایی و ڕۆژهەڵاتی ) باندی گەورەی پێک هێنابوو ، پارەوپولێکی یەکجار زۆریشی بەدەست هێنابوو، ئەوەی لە توێژینەوەکاندا ئاشکرا بوو ئەوە بوو کە ئیسلامی سیاسی لە هۆڵاندا بەو پەڕی ئاسودەیی و بە خواستی خۆی کارەکانی ئەنجام داون.
بەڵام پرسیار لێرەدا ئەوەیە کە ڕێکخراوێکی وەک ئەلقاعیدە چۆن توانیویەتی ئەو هەموو کارە ئەنجام بدات، سەرچاوە بنەڕەتەکانی ئەو هەموو پارەو پولە کوێیە و کێ یە؟ پاشان بۆچی و چۆنی توانیان لە چەندین وڵاتی وەک هۆڵاندا دابمەزرێن.. ئەمانەو چەندین پرسیاری دیکە هەمیشە مافی خوێنەرە کە ڕاستەوخۆ هەوڵ بدات لەم لێکۆڵینەوەیەدا بەدەستی بهێنێت..
دوو هۆی گرنگ وای کردووە هەمیشە سعودیە نەک تەنها بنکەیەکی پیرۆزی موسڵمانان بێت بەڵکو خێزانی دەسەڵاتداریش کە خۆیان بە جێنشینی پێغەمبەری موسڵمانان دەزانن هەر بەو هۆیەوە هەمیشە خۆیان بە پێشەنگ

و میرات گری تەواوی موسڵمانانی دنیا بزانن، ئەو دوو هۆیەش بریتین لە بوونی مەکە و مەدینەی پیرۆز و بوونی نزرگەی موحەمەدی پێغەمبەر لەو وڵاتە.
سعودیە لەبەر بوونی دەرامەتێکی نەوتی زۆرو داهاتێکی بێ شوماری حاجیان کە ساڵانە ڕوو لە حەج دەکەن بە وڵاتێکی دەوڵەت مەندی ئیسلامی دەژمێردرێت، بۆیە لامان سەیر نیە کە ئەو دەوڵەتە و خێزانی فەرمان ڕەوا پارەو پولێکی زۆر بخەنە گەڕ بۆئەوەی هەمیشە ڕۆڵی ئیسلامیی خۆیان وەک تاکە ڕێبازی ئیسلامی ڕاست و دروست بخەنە بەردەم دنیای ئیسلامی لە تەواوی دنیادا و هەر لەم ڕێگایەشەوە جڵەوی ئیسلام گەرایی چ بەرامبەر باڵی شیعە یان باڵە سونیەکانی دیکە لە تەواوی دنیادا لەدەست خۆیان بهێڵنەوە . بۆیە هەر وەک ئاشکرایە دەرئەنجامی ئەم سیاسەتە ئەوە بوو کە سعودیە لە ناوخۆی خۆیدا بکرێتە مزگەوتێکی گەورەو کۆمەڵگاکەشی بە داخراوترین کۆمەڵگای کۆنە پارێز و خۆپارێزی جیهانی تاڕادەی ئەوەی لە کۆی ١٩ کەس لە ئەنجام دەرانی هێرشەکانی سێپتەمبەر ١٥ کەسیان سعودی بێت و هەر وەک ئەوەی سحرەکە لە سحربازەکە هەڵگەڕێتەوە تیرۆریزمیش ئەوها گەڕایەوە بۆ هەوارگەی ئەسڵی خۆی، ئەوددمە دەسەڵات دارانی سعودیە زانیان کە چ قورێکی خەستیان بۆ خۆشیان گرتۆتەوە.
ئەم ئامانجەی سعودیە وای کردبوو کە هەر لە ساڵی شەستەکانەوە چەندین ڕێکخراوی خێر خواز دامەزرێنێت و بە مەبەستی پروپاگەندەی سەلەفی وەگەڕیان خات. وێرای ئەوەش دامودەزگای سیاسی و.دەوڵەتی سعودیە بۆ هەمان کار لە خزمەتدا دانرابوون، ووردە ووردە لەگەڵ پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاو بچوک بونەوەی دنیادا ئەم ڕێکخراوانە بە دنیادا بڵاو بوونەوە، لەو شوێنانەی دنیای ئیسلامدا کە شەڕو ئاژاوەو ناخۆشی هەبوون ڕێکخراوەکانی وەک ( ئیغاسە و حەرەمەین و وەقف و کۆمەڵەی لاوانی ئیسلامی، هتد ) لەوێدا ئامادە دەبوون.
کۆتایی هاتنی شەڕی سارد و توندتر بوونەوەی کێشەی عەرەب و ئیسرائیل دوژمنایەتی ئیسلامی سیاسی بۆ ئەمەریکا زیاتر کرد، ئیتر تێکەڵاو بوونی سیاسەت و ئایین و سیاسەت و کاری خێرخوازی هێندە ئاڵوز بوو کە جیاکردنەوەیان ئاسان نەبێت.. ئیسلامی سیاسی ئەم هەلەشی لەدەست نەداو کەوتە قۆستنەوەی ئەو ڕێکخراوانەو بەکارهێنانیان بۆ کاری سیاسی، تەنانەت کاری چەکداری و توندوتیژیش..

دەوڵەتمەندی ئەو ڕێکخراوانە وای کرد کە ئەوروپاش بکرێتە مەڵبەندێکی چالاکیەکانی بەتایبەت هەر وەک لە پێشەوە باسمان کرد لە سەرەتای نەوەتەکانی سەدەی پێشوو چەندین شارەزاو قاڵەوەبووی سیاسەت و هونەری جەنگی لە ئەندامانی ئیسلامی سیاسی ڕوویان لە ئەوروپا کردبوو.

بەم جۆرە لە زۆربەی دەوڵەتە ئەوروپیەکانیش لەوانە هۆڵاندا لقیان کردەوەو دەستیان بەکاری (خێرخوازی!) خۆیان کرد و ئیتر سەلەفیەت ڕووی لە هۆڵانداش کرد.

دامەزراوەی( الحرمین) لە ساڵی ١٩٩٥ لە لایەن عقیل عبدوالعزیز العقیل دامەزراوە، ئامانجی سەرەکی خۆی لە نێو نامە فەرمیەکاندا وەک کاری (خێرخوازانە) تۆمار کردووە، بەڵام هەمیشە لە تەواوی دنیای ئیسلامیدا پارەی کۆکردۆتەوەو بۆ چەندین ڕێکخراوی تیرۆریستی وەک(حماس و جیهاد و کۆمەڵەی ئیسلامی ئەندونوسیاو جیهادی ئیسلامی میسرو لەشکری تیبە لە کشمیر) ناردووە، ئەم ڕێکخراوە کە پێدەچێت ئەلقاعدە ناڕاستەوخۆ سەرپەرشتی کردبێت مزگەوتی(التوحید) ی لە ئەمستەردام کردبوە بنکەی سەرەکی بۆ بەڕێوە بردنی چالاکیەکانی خۆی.

العقیل کە خۆی زۆربەی جار بەڕێوەبەری گشتی مزگەوتەکە بووە هەر خۆشی هەمیشە لە پارەی ڕێکخراوی ئەلحەرەمەین مانگانەی تەواوی تێچونەکانی مزگەوتەکەو باڵەخانەکانیشی داوە.

دامەزراوەی ئەلحەرەمەین کە پاشان لە لایەن ئەمەریکاوە تەواوی سەرمایە بزۆک و نەبزۆکەکانی دەستی بەسەرداگیرا وەک سەرچاوەیەکی سەرەکی دابین کردنی سەرمایەو پارەو پول بۆ ڕێکخراوە تیرۆریستەکان ناوزەد کرا.

مزگەوتی التوحید هەتا ئەمڕۆ بە توندی کەوتۆتە ژێر چاودێری دەسەڵات دارانی هۆڵانداوە یەکێکە لەو مزگەوتانەی کە زۆرترین گفتوگۆو گومانی لەسەر پەیدا بووە، ڕۆژنامە نوسێکی ڕۆژنامەی تراو( Trouw ) ی هۆڵاندی لە یەکێک لەسەردانەکانیدا بۆ ئەو مزگەوتە، چەندین سەرچاوەی کتێبی بە زمانی هۆڵاندی بەر چاو کەوتبوو، یەکێک لەو سەرچاوانە بە ناوی ( ڕێبازی موسڵمانەکان - De weg van de moslims ) باسی ئەوە دەکات کە چۆن پێویستە کەسانی هۆمۆ ( نێرباز ) لە باڵەخانە بەرزەکانەوە سەرەوخواربکرێنەوەو پاشان هەڵدرێنە خوارەوە. هەروەها کتێبێکی دیکەی چاولێکردبوو بەناوی ( فەتوا بۆ موسڵمانان - Fatwas for Muslim's ) کە تیایدا خەتەنەکردنی ئافرەت و لێدانیان بە شەرع و ڕەوا لە قەڵەم دەدات.

کتێب گەلێکی ئەوها کە ڕاستەو خۆ دژ بە کلتورو بەهاکانی ڕۆژئاوایە بە پێ ی لێکدانەوەی لایەنە بەرپرسەکانی وڵات نەک تەنها موسڵمانان فێری توندو تیژی دەکات بەڵکو هانیان دەدات دژایەتی کلتورو نەریتی کەسانی دیکە بکەن، ئەوها هەڵویستێک دەبێتە هۆی ئەوەی کە هەمیشە بە گومانەوە سەیری مزگەوت و ڕۆڵی مزگەوت لە نێو ڕەوەندی ئیسلامیدا بکرێت.

مەڵبەندی ئیسلامی فورقان لە شاری ئایندهۆڤن کە مزگەوتێکیشی بەهەمان ناو لەگەڵدایە مەڵبەندێکی دیکەی ئیسلامی سیاسی ( سەلەفی ) یە کە بەردەوام بۆتە مایەی گفتوگۆو چەندین جاریش لە لایەن ڕاست ڕەوە هۆڵاندیەکانەوە هێرشی کراوەتە سەر.

ئەم مزگەوتە کە لەلایەن دامەزراوەی (الوقف الاسلامي) ەوە دامەزراوە لە لایەن پۆلیسی هۆڵانداوە وەک لانەیەکی ڕێکخراوی ئەلقاعیدە سەیر دەکرێت، بە پێ ی زانیاریەکان ئەمیری ئەو گروپەی کە هێرشەکانی ١١ی سێپتەمبەری ئەنجامدا ( موحەمەد عەتا ) چەندین جار سەردانی ئەم مزگەوتەی کردووە، هەروەها ئەو دوو موجاهیدەی ساڵی ٢٠٠١ بۆ جیهاد بەرەو کشمیر ڕۆشتبون و لەلایەن پۆلیسی هندیەوە کوژران هەر لەم مزگەوتەدا دەماغ شۆرکرابوون.

یەکێک لە ئەندامانی دەستگیر کراوی گروپی ( شانەی پایتەخت ) بە ناوی تاهیر( Thaer B ) کە پێ دەچێت ئەویش هەر لەم مزگەوتەدا ڕێکخرابێت پاش دەستگیرکردنی لە بەردەم نوسینگەی پۆلیس ڕاشکاوانە ڕایگەیاند ( لەو مزگەوتەدا باسی شتی وادەکرێت کە مرۆڤ شێت دەکەن و مێشکی تێک دەدەن) هەروەها زیاتر دانی بەوەدا نا کە لەم مزگەوتەدا بەردەوام پارەوپول بۆ موجاهیدینی دنیا کۆ دەکرێتەوە.

هەتاکاتی ڕووداوەکانی سێپتەمبەر حکومەتی سعودیە بە شێوەیەکی فەرمی خۆشی لە بڵاو بوونەوەی ئایدولۆجیای سەلەفیەتدا دەستی هەبووە، وێرای ئەوەی باڵوێز خانەکانی خۆی کردبووە مەڵبەندی هاوکاری کردنی بێ مەرجی چەندین دامەزراوەی ئیسلامی، لە هۆڵاندا هاوکاری مەلاکان و ئیمامەکانیشی کردووە، تەنانەت بۆ خوێندن و دەورەی ئایینی هەندێکیانی لە هۆڵانداوە بۆ سعودیە ناردووە. بەڵام لە پاشاندا ئیتر ئەم کارەی بەتەواوی ڕاگرت ودژایەتی کردنی زۆربەی ڕێکخراوەکانیشی گرتە ئەستۆی خۆی چونکە ئیتر هێرشەکان بەوە نەوەستانەوە کە هەڕەشە بن بۆ سەر ئاسایشی ئەمەریکاو ئەوروپا بەڵکو لە سەرەتای ساڵی(٢٠٠٣ ) بوونە هەڕەشەی جدی بۆ کورسیە ئەستورو نەبزۆکەکانی خۆیان...

وێرای ئەو دوو دامەزراوەی کە باسمان کردن دامەزراوەی ( التوحید ) لە ئەمستەردام و فورقان لە شاری ئاییندهۆڤن، دامەزراوەی ( الموحدین ) کە مزگەوتێکیشی بەناوی مزگەوتی عومەر ئیبن خەتاب لەگەڵدایە لە شاری هێڵمۆند، دامەزراوەی لاوانی موسڵمان لە شاری برەیدا، مەڵبەندی پەروەردەی ئیسلامی لە شاری تیلبۆرخ...هتد لە هەموو ئەم مەڵبەندانەدا ئیسلامی سیاسی بەدەنگی بەرز بانگەوازی جیهاد لە دژی ئەمەریکاو ئیسرائیل دەکەن ، بە پێ ی زانیاریەکان لە کۆی مزگەوتەکانی ڕەوەندی ئیسلامی لە نزیکەی ۳۰ مزگەوتدا ووتاری توندو تیژ کە لاوانی ئەم وڵاتانە هان دەدات بەرەو شەهادەت و فەردوسی گەورە، بەرەو کوشتار و مردن بڕۆن دەخوێنرێتەوە..

ئەوەی جێگەی سەرنجە لەم هەڵس و کەوتەی ئیسلامی سیاسیدا ئەوەیە کە تائێستا هێرشی هاوشێوەی ۱۱ سێپتەمبەر و ئازار ئەنجام نەدراوە، بەڵام زۆرجار ڕووی داوە کە هۆڵاندا بۆ حەواندنەوەی ئەندامانی تۆڕە تیرۆریستیەکان بەکار هاتووە هەروەک چۆن ئاشکرا بوو کە دوو لە ئەنجام دەرانی هێرشەکانی ۱۱ی ئازاری مەدرید بەر لە هێرشەکەو پاش هێرشەکەش لە هۆڵاندا شوێنی حەوانەوەیان بۆ دیاری کراوە.

**ئیسلامی سیاسی لە ئەوروپا:**

لێکدانەوەی ئیسلامی سیاسی لە ئەوروپا لێکۆلینەوەیەکی دورودرێژو وردی دەوێت، بەڵام پێوست دەکات ئێمە لێرەدا بە کورتی ئاماژەیەکی پێ بدەین:

**قاعیدە لە ئەوروپا:**

ساڵی ۱۹۷۹ ئوسامە بن لادن لە پاکستان نوسینگەی پێشوازی موجاهیدە عەرەبەکانی دامەزراند، ئەو نوسینگەیە بوو بە خاڵی دەستپێکی دامەزراندنی ڕێکخراوی ئەلقاعیدە.

لە مانگی فێبروەری ۱۹۹۸ ئەیمەن زەواهیری ڕێکخراوی جیهانی ( قاعیدە الجهاد )ی ڕاگەیاند، لەو دەمەوە ئەم ڕێکخراوە لە ئەوروپاو ئەمەریکا و

ئەفەریقاو هەر بستە خاکێکی ئەم دنیایە کە دەستی پێ گەشتبێت درێغی نەکردووە لە زەبر وەشاندن. رووداوەکانی سێپتەمبەری ئەمەریکا و لەندەن و مەدرید باشترین نمونەی ئەو راستیەن.

چوار لقی رێکخراوی ئەلقاعیدە:

پاش هێرشە ترۆرستیە جۆر بە جۆرەکانی دنیا، چاودێران لەو باوەڕەدان کە رێکخراوی ئەلقاعیدە بەسەر چوار لقدا دابەش بووە، هەریەک لەو لقانە بە شێوازو تاکتیکی تایبەتی خۆی کار دەکات و هەر هەموشیان لە ئایدۆلۆژیاو ئامانجیاندا پشت ئەستورن بە تێزەکانی بن لادن و زەواهیری.

یەکەم- ناوچەی خۆرهەڵاتی ئاسیا کە ئەفگانستان و پاکستان دەگرێتەوە، ئەم ناوچانە بە قوڵایی ستراتیژی رێکخراوەکە دەژمێردرێت، ئەم لقە سەنتەری سەرەکی بەشەکانی دیکەی رێکخراوەکەیە لە روی لۆجستی و رۆحی و ئادۆلۆژیەوە چونکە جوگرافیای ناوچەکە تارادەیەکی زۆر هەلس وکەوتی ئەندامانی ئەو رێکخراوە ئاسان دەکات.

دووەم- قاعیدەی جیهاد لە وڵاتی رافدێندا: ئەم بەشە لە پاش هێرشەکانی ئەمەریکا بۆ ئەفگانستان و دەرپەڕاندنی دوا جاری ئەندامانی ئەلقاعیدە لە ناوچەی تۆرا بۆرا، لە رێگای ئێرانەوە بەرەو کوردستان پەڕینەوە و خۆیان گەیاندە ئەو ناوچانەی کە لە ژێر دەسەڵاتی هێزەکانی ( پشتیوانانی ئیسلام ) دا بوون. بەڵام لەگەڵ نزیک بونەوەی هێرەشەکانی ئەمەریکا بۆ عێراق ئەمانە لەگەڵ دەزگاکانی هەواڵگری عێراقدا رێکەوتن کە خۆیان بۆ قوڵایی عێراق بگوێزنەوە و هاوشانی عێراقیەکان لە دژی هێرشەکانی ئەمەریکا بجەگن، ساڵی ٢٠٠٣ راستەو خۆ ماوەیەکی زۆر کەم بەر لە هێرشەکانی ئەمەریکا ئەمانە خۆیان لە عێراقدا چەسپاند، ئەم هێزانە کە بە گروپی ١٠٠ کەس ناسراوبوون هاوڕێ لەگەل محمەد مەکاوی کۆنە ئەفسەری سوپای میسر قورسایی خۆیان لە ناوچەی ( سێگۆشەی سونی ) داناو پاشان لەگەڵ زەرقاوی و ئەوِ موجاهیدانەی کە لە ئەردەن و سوریاو سعودیەوە دەهاتن یەکیان گرتەوە و زەرقاوی خۆی کردە ئەمیریان.

**سێهەم – قاعیدەی جیهاد لە نیوە دورگەی عەرەب:**
ئەم لقە هەر لە تەقینەوەکانی خوبەرەوە لە سعودیە دەست بەکار بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی زۆربەی موجاهیدەکانی سعودیە لەگەڵ بن لادن لە ئەفگانستان خەریکی جیهاد بوون چالاکیەکانیان لە ناو وڵاتی خۆیان کەم بوو بەڵام پاش زەبر لێ کەوتنی قاعیدە لە ئەفگانستان هەندێک لەم جەنگاوەرانە گەڕانەوە بۆ ناو وڵات و دەستیان بە شەڕی خۆیان کرد، بەڵام تا ئێستا چەندین جار کەوتونەتە بەر زەبری هێزەکانی ناوخۆی سعودیە و چەندین جاریش رێکخراوەکە هەڵوەشاوەتەوە.

**چوارهەم – قاعیدەی جیهاد لە ئەوروپا:-**
چالاکیەکانی قاعیدە هەر لە ئەستەنبولەوە تا دەگاتە لەندەن و مەدرید و ئەڵمانیاو بەریتانیاو فەرەنسا هەموو بەڵگەی ئەوەن کە ئەو رێکخراوە لە ئەوروپا زۆر زیندووەو بۆ دەست وەشاندن هەمیشە لە کات و شوێنی جیاوازدا سەرهەڵدەدات.. ئەم بەشەی قاعیدە چۆن کاردەکات؟ چۆن ئەندام پەیدا دەکات؟ پەیوەندیەکانیان چۆن گرێ دەدەن؟ سەرچاوەی داهاتیان چی یە؟ ئەمانە ئەو پرسیارانەن کە وەڵامەکانیان قەبارەو ئاستی رێکخراوەیی قاعیدە لە ئەوروپا پیشان دەدات.
ئەم لقەی قاعیدە شاراوەترین و تەمومژاوی ترین لقی رێکخراوەکەیە، تا ئێستاش نەزانراوە ئەمیری ئەم لقە کێ یە یاخود ئایا یەک ئەمیریان هەیە یان چەند ئەمیرێک؟ زانیاری دەربارەیان زۆر کەمە، بە پێ ی وتەی هەندێک لە چاودێران ئەم لقە خۆی دابەش کردووە بەسەر ٣ ناوچەی جیاوازی ئەوروپا ، بەشێک لە رۆژهەڵاتی ئەوروپا ، بەشێک لە خۆرئاوای ئەوروپا بەشێکی دیکەش لە سەنتەری ئەوروپا،
شێوەی کارکردنی ئەم رێکخراوە لە ئەوروپا شێوەیەکی زۆر نهێنی و وردی لە خۆگرتووە، بۆ خۆپارستن لە زەبرەکانی پۆلیسی ئەو دەوڵەتانە خۆیان دابەشکردۆتەوە بەسەر گروپی زۆر بچوکدا کە لە هەندێک باردوخ دا تەنانەت لە دوو کەس یان سێ کەس تێپەڕناکەن، هەر شانەیەکیش لەم رێکخراوانە هەتا ساتی دەستوەشاندن هەر بە سڕکراوی و خەوتوو دەمێنێتەوەو هیچ جۆرە کارێکی ئەوتۆی رێکخراوەیی ئەنجام نادەن، ئەندامانی سەرەوەی ئەم شانانە بۆ پەیدا کردنی داهات هەموو جۆرە کارێکی حەرام و حەڵال ئەنجام دەدەن چونکە بە وتەی خۆیان ئەوانە لە

جەنگی هەمیشەییدان لەگەڵ دوژمندا، دەگوترێت کە بن لادن بەر لە هێرشەکانی ئەمەریکا بۆ ئەفگانستان توانیویەتی تەواوی پێداویستیەکانی ئەم گروپانە دابین بکات، ئەو کەسانەی کە سەرپەرشتی کارەکانی ئەم رێکخراوانە دەکەن خۆیان سەرقاڵی هەندێک کار بکەن کە هەرگیز گومانی ئیسلامی بونیان نەچێتە سەر.

چاودێرانی ئەم گروپە تروریستانە ژمارەی تەواویان لە ئەوروپا بە ٦٠٠ کەس مەزەندە دەکەن کە زۆربەی هەرە زۆریشیان یەک لە دووای یەک دەکەونە بەریتانیا و ئەڵمانیاو فەرەنساو ئیتالیاو هۆڵاندا و بەلجیکا.

ستراتیژی کاری ئەم گروپانە تەواو لە ستراتیژو پەیرەوی گروپەکانی نێو خودی دەوڵەتە ئیسلامیەکان جیاوازە، ئەم گروپانە کۆمەڵێک سیفەتی تایبەتیان هەیە کە ئەمانەی خوارەوەن

یەکەم- زۆربەی هەرە زۆریان لە دایک بووی ئەو وڵاتە ئەوروپیانەن کە تیایدا دەژین، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەوانە رەنگە پتر لە یەک رەگەزنامەی ئەوروپیان هەبێت و زۆر ئاسانتر لە هەموو کەسانی دیکە دەتوانن بە تەواوی دنیادا هاتوچۆ بکەن..

دووەم- زۆربەیان نەک زمانی عەرەبی بەڵکو زمانی دایکی خۆیان نازانن و تەنها زمانی وڵاتە خۆرئاواییەکان دەزانن.. بەم جۆرەش زۆربەیان ناتوانن لە تێکستە قورئانیەکان کە بەعەرەبی یان بە زمانەکانی دیکەی خۆرهەڵاتی راڤەکراون تێبگەن، یاخود زیاتر بڵێین ئەم نەوەیە لە ئیسلامی سیاسی هەموو پێداویستیەکانی خۆی لە سەر تۆڕەکانی ئەنتەرنێت چنگ دەخات.

سێهەم- ئەم نەوەیە لە ئیسلامی سیاسی تەمەنیان هەمیشە لە نێوان ١٨-٢٥ ساڵ دەبێت و زۆربەشیان لە بوارە زانستیەکانی وەک فیزیاو کیماو زانستی ئینفۆرماتیکا (کۆمپیتەر) شارەزان و زۆر بەئاسانی دەتوانن مامەڵە لەگەڵ تەکنەلۆژیای هاوچەرخدا بکەن و لە بەرژەوەندی خۆیاندا بەکاری بهێنن، ئەمانە دەتوانن ماڵپەڕی جۆراوجۆری جیاواز بە ئاشکراو نهێنی دروست بکەن و لە رێگای ئەنتەرنێتەوە پەیامەکانی خۆیان بگەیەنن و هەر ئەنتەرنێتیش بکەن باشترین هۆکاری توندوڕەوکردنی خەڵکانی دیکە، سەرچاوە ئاگادارەکان لە سەرتاسەری ئەوروپا ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە تۆڕەکانی ئینتەرنێت ئەمڕۆ باشترین هۆکارن بۆ دروستکردن و برەو پێدانی ئایدۆلۆژیای سەلەفی و توندڕەوی ئیسلامی سیاسی..

چوارهەم- ئەم نەوەیە هەرگیز رۆژێک لە رۆژان چاویان بە بن لادن نەکەوتووە و هەرگیز لە وڵاتێک لە وڵاتە ئیسلامیەکان جیهادیان نەکردووە بەڵام پەراوێزبونیان و نەتوانینی خۆگونجاندنیان لە نێو کۆمەڵگا ئەوروپیەکاندا جۆش و خرۆشێکی زۆریان پێدەبەخشێت و هەستێکی زۆریان لا دروست دەبێت بۆ تۆڵە سەندنەوەو گەڕانەوە بۆ ئیسلامی توند رەو.

پێنجەم – ژمارەیەکی زۆر لەم ئەندامانەی ئیسلامی سیاسی هەوڵیان داوە ئەوروپیە قژ زەردەکان راکێشنە نێو ریزەکانی خۆیانەوە، بۆ ئەم مەبەستەش تاکتیکی ژن و ژنخوازی بەکار دێنن، بۆ نمونە یان ژنی ئەوروپی دەخوازن و کارئاسانی پێ دەکەن یاخود ژنێکی ئیسلامی دەبەخشنە کەسێکی ئەوروپی کە پابەند بوونی خۆی بە ئیسلامەوە راگەیەنێت...

رێکخراوی ئەلقاعیدە لە ئەوروپا ئەمڕۆ یەکێکە لەو هەڕەشە گەورانەی کە تەواوی دەوڵەتە ئەوروپیەکانی ماندوو کردووە، لەم پێناوەشدا پارەو پۆلێکی یەکجار زۆر تەرخان دەکەن بۆ بەدوواداچونی هەر زانیاری و سەرەداوێک کە ببێتە هۆی ئاشکرا کردنی بەشێک یاخود گروپێک لەم رێکخراوە، سەرباری ئەوەی ئەلقاعیدە لە ئەوروپا زەبری زۆر گەورەی وێ کەوتووە، بەڵام هەرگیز هێندە لاواز نەبووە کە دەوڵەتە ئەروپیەکان بتوانن لە وڵاتەکانی خۆیاندا هەست بە ئارامی بکەن...

## بەشی شەشەم:-

### ئەمڕۆی ئیسلامی سیاسی لە هۆڵاندا:-

جەنگی دژ بە تیرۆر نەیتوانی کردەوە تیرۆریستیەکانی جیهان کەمتر کاتەوە، ئەو جەنگە بە ڕابەری ئەمەریکا تاڕادەیەکی باش توانی جوگرافیای جەنگەکە بگۆڕێت و هیچ نەبێت لە ئەمەریکاو ئەوروپا دووری خاتەوە و بیباتەوە بۆ نێو نیشتیمانی لێوە هاتوو کە ئەویش وڵاتانی ئیسلامیە، بەڵام هەرگیز نەیتوانی گەرەنتی دووبارە نەبوونەوەی بدات ئەوەتا پاش هێرشەکانی سێپتەمبەر لە ئەمەریکاو مارت لە مەدرید ئەم جارە بەریتانیا بوو بە ئامانج و لەو پەڕی ئامادەباشی دام و دەزگاکانی پۆلیس و ئاسایش بۆ بەڕێوە بردنی کۆبونەوەی سەرانی هەشت دەوڵەتە مەزنەکە لە بەرواری ٧-٧-٢٠٠٥ ، لە ڕۆژێکی ئاوادا هێرش دەکرێتە سەر بەریتانیای مەزن و شاری لەندەن دەکرێتە چۆڵی قوڵفە..

لەندەن تەنها پایتەختی ئابوری ئەوروپا نیە بەڵکو پایتەختی سیاسی ئەوروپاشە بۆیە ئەو دەمەی لەندەن دەپژمێت هەموو ئەوروپا و لە نێوانیشیاندا هۆڵاندا نەخۆش دەکەوێت لەبەر ئەوە لامان سەیر نی یە کە

تەقینەوە کانی لەندەن دیسانەوە وابکات ئەمستەردام بکەوێتە حاڵەتی ئامادەباشیەوەو لەوەش زیاتر ئەمستەردام دیسانەوە ئەگەری هێرشی تیرۆریستی بۆ سەر وڵاتەکەی لێک بداتەوە، بۆیە ئەگەر بڵێین ئیسلامی سیاسی لە هۆڵاندا بۆتە کێشەو گرفتی ژمارە یەکەمی حکومەت و کۆمەڵگای هۆڵاندا، ئەوە شتێکی تازەمان نەوتووە.

هەموو چاودێرێکی سیاسی دەتوانێت تیرۆریزمی نێودەوڵەتی بەتایبەت ئەو کردەوانەی ئیسلامی سیاسی ئەنجامی دەدات بکاتە نمونەو بە هۆیەوە ئاست و قەبارەی هەڕەشەکانی ئیسلامی سیاسی و تیرۆریزم دیاری بکات، بەڵام من پێم وایە هەر چاودێرێکی سیاسی ووردبینانە هێڵە باریکەکانی ئیسلامی سیاسی لە ئەوروپاو دنیادا لێک جیانەکاتەوە دەکەوێتە هەڵەیەکی گەورەی شیکردنەوەوە، حکومەتی هۆڵاندا خۆی زۆر بەباشی پەی بەم ڕاستیە بردووە، ئەوەتا دەزگای هەواڵگری هۆڵاندا لە دووا ڕاپۆرتەکانی خۆیدا کە ڕۆژی ٢٣-١٢-٢٠٠٤ ئاشکرای کرد، سەبارەت بە ڕەنگ و هێڵ و گرایشە جیاوازەکانی ئیسلامی سیاسی دەڵێت ( ئەوەی بە یەک چاو سەیری هەموو هێڵ و ڕەنگەکانی ئیسلامی سیاسی بکات وەک ئەوە وایە بەنزین بەسەر ئاگردا بکات ) .

سەیرێکی خێرای مێژووی ئیسلامی سیاسی زۆر بە ئاشکرا ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە ئیسلامی سیاسی لەگەڵ پەرە سەندنی ڕووداوەکاندا هەمیشە ئەویش پەرەی سەندووەو گۆڕاوە، لە بەشەکانی پێشودا سەرەتای کۆچ کردن و ڕوو لە ئەورپاکردنی ئیسلامی سیاسیمان خستە ڕوو، لەم بەشەدا هەوڵ دەدەین گرایش و هێڵەکان و دەنگ و ڕەنگی ئەو ڕەوتە ئیسلامیانەو ئێستای هەڵکەوتەی سیاسی و ئەمڕۆی ئایدۆلۆژیایان بخەینە ڕوو، هەروەک بۆ خوێنەری هێژاش ئاشکرایە تەواوی پەنجەکان ئەمڕۆ ئاراستەی ( سونە) یە زۆربەی هەرە زۆری باڵە توند ڕەوو تیرۆریستەکانی ئیسلامیش زیاتر سونەکانن، بۆیە لێرەدا مەبەست لە لێکدانەوەو شیکردنەوەکانی ئیسلامی سیاسی باڵی سونەیە کە دەکرێت بە سێ بەش پۆلێنیان بکەین:

١- ئەوباڵەی ئیسلامی سیاسی کە تەنها کاری سیاسی بەدەر لە توندو تیژی ئەنجام دەدات ، ئەمە زیاتر باڵەکانی ئیخوان دەگرێتەوە کە خەباتی سیاسیان بەڕێگەی ئاشتی خوازانە گرتۆتە بەر هەر وەک خۆیان دەڵێن (بالحکمة و الموعظة الحسنة) ، ئەم باڵە دژ بە توندو تیژی و کردەوەی شۆڕشگێڕانەیە نمونەی ئەم باڵەش وەک پارتی عەدالەت و پەرەپێدان لە

تورکیا، پارتی عەدالەت و پەرەسەندن لە مەغرب و ئیخوانەکانی میسر و دنیا...

٢- ئەوبالەی بانگەوازو مزگێنی ( تەبشیر ) پەیڕەو دەکات:-

بزوتنەوەکانی تەبلیغ و دەعوە کردن باشترین نمونەی ئەم باڵەن، ئەم باڵەی ئیسلامی سیاسی زیاتر کار بۆ ئەوە دەکات کە پارێز گاری لە شوناسی ئیسلامی و ڕەوشت و ڕەهەندە ئاکاریەکانی کۆمەڵگای ئیسلامی لە هەڕەشەی ڕۆژئاواو هێزەکانی کوفر بپارێزێت.

٣- باڵی جیهادی و تەکفیری:- ئەم جۆرە ڕەوتە لە ئیسلامی سیاسی بایەخی تەواو بەکاری چەکداری و شۆڕشگێڕی و جیهادی دەدات، سێ ڕێبازی دیکەی جیاواز لەخۆ دەگرێت:

- باڵی نێو دەوڵەتی عەرەبی و ئیسلامیەکان: ئەم باڵە دژایەتی خودی ڕژێمە عەرەبی و ئیسلامیەکانی نێو وڵاتانی خۆیان دەکەن.
- باڵی بەرگری و دژایەتی داگیرکردن: ئەم باڵە لەو وڵاتانەدا ئەکتیڤە کە ئەوان بە داگیرکراوی دەزانن وەک عیراق و ئەفگانستان و فەلەستین.
- باڵی ئەنتەر ناسیۆنالی کە بە تەواوی دنیای خۆرئاوادا بڵاو بونەتەوەو دژایەتی ڕۆژئاوا دەکەن.

ئەو سێ دابەشکرنەی سەرەوە ( ١،٢،٣ ) دابەشکردنێکی گشتی یە ، چونکە دیسان لە نێو هەر یەکە لەو باڵانەدا گرایش و هێڵی دیکە هەنە کە بۆ تێگەیشتن و شیکرنەوەیان پێویستە تێکست و نوسراوە ئایینیەکان بکرێنە بەڵگە کە ئەمەش بوارێکی دیکەی لێکۆڵینەوەیە، بەڵام ئەوەی تایبەت بێت بە تێگەیشتن لە ئیسلامی سیاسی ئەوروپا بەگشتی و هۆڵاندا بە تایبەتی پێویست دەکات زیاتر لەسەر ووردەکاریەکانی بڕۆین.

هەڵکەوتەی ئیسلامی سیاسی لە ئەوروپا لە وڵاتێکەوە بۆ ئەوی دیکە جیاوازە، ئەم هەڵکەوتەیە نەك تەنها ژمارەی ڕەوەندەکە کاریگەری توند دەکاتە سەری، بەڵکو هەڵکەوتەی ئەمڕۆی ڕەوەندەکەو کەسایەتی تاکەکانی و باری دەرونیان و کلتورو نەریتەکانی وڵاتانی لێوە هاتوو ڕۆڵی زۆر دیاری کراویان هەیە هەر ئەوەشە وای کردووە کە هەمیشە هاوشێوەی وڵاتانی ئیسلامی و عەرەبی لە وڵاتانی ئەوروپیشدا ڕەوتی ئیسلامی جیاواز هەبن، بۆنمونە لە بەریتانیا کە ڕەوەندی ئیسلامی زیاتر پاکستانی و ئاسیاوین ئیسلامی سیاسی تا ڕادەیەکی زۆر هاوشێوەی ئیسلامی سیاسیە لە پاکستان

و ئاسیا، بەهەمان شێوە لە فەرەنسا کە جەزائیری زۆرترین ژمارەی ڕەوەندەکەیەو لە ئەڵمانیا تورک و لە هۆڵاندا تورک و عەرەبی ئەفریقایی (مەغریب و تونس و میسر) ... بەم جۆرە ئەو سێ باڵەی سەرەوە ( سیاسی و تەبلیغی و جیهادی ) بەهەمان شێوەکانی وڵاتانی باوک بەڵام بە فۆرمێکی ئەوروپی و موتوربەکراودا باڵیان بەسەر ڕەوتەکانی ئیسلامی سیاسیدا گرتووە.

دەزگای زانیاری هۆڵاندا لە دووا ڕاپۆرت و هێڵکاریەکانی خۆیدا، ئیسلامی سیاسی دابەش دەکات بەسەر هەشت گرایشی جیاوازدا، کە ( شەش)جۆریان لە هۆڵاندا چالاکن.

ئەم ڕاپۆرتە دووا ڕاپۆرتی ئەودەزگایەیە کە تا نوسینی ئەم بابەتە ئاشکرا کرابێت و لە نزیکەی ١٥٠ لاپەڕە پێک دێت و زۆرترین بەشی هەروەک چاوەڕوان کراوە بۆ هەڕەشەکانی ئیسلامی سیاسی تەرخان کراوە لێرەدا سەرەتا بە هێڵکاریەکی وورد ڕاپۆرتەکە ڕوون دەکەینەوە پاشان بە ووردی و بە سەرنجەکانی خۆمانەوە دەیخەینە ڕوو...

هەروەک سەرنج دەدەین جۆری پۆلێن کردنی ڕەوتەکانی ئیسلامی سیاسی جیاوازە لە جۆری پۆلێن کردنیان لە وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامی، ئەمەش دیارە هۆیەکەی ئەوەیە کە ئامانج و ئامرازی ئەو ڕەوتانەو کاریگەرییان لە سەر کۆمەڵگا لە ئەوروپا بە هەمان شێوەی وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامی نی یە.

ئێستاش دێینە سەر شیکردنەوەی هەر هەشت باڵەکەی ئیسلامی سیاسی:-

بالّی یەکەم:-

ئـەم باڵــە کــە زیــاتر عــەرەبــە ناسیۆنالیــست و موســڵمانە عــەرەبــە ناسیۆنالیستەکان پەیڕەوی دەکەن، دژی ئەوەن کە دەوڵەتێکی دیموکراسی و سیکیولاریــست لــەســەر دەســەڵات بێـت. ئــەمانــە هــەوڵ دەدەن بــە خــودی ئامرازەکانی دیموکراتیەت شەڕی دیموکراتیەت بکەن، ئامانجیان ئەوەیە کە نەوەکانی ڕەوەندی ئیسلامی بەتایبەت عەرەب لە دەوری خۆیان کۆکەنەوە و لە ڕێگای دامەزراوە دیموکراتیەکان و پێکهێنانی حزب و ڕێکخراوی ئیسلامی مۆڵەت پێ دراوەوە خۆیان بگەیەننە دەسەڵات و لە ڕێگای دەسەڵاتەوە داخوازیەکانی خۆیان لەوانە چەسپاندنی شەریعەت و ئایینی ئیسلام و زمانی عەرەبی بەسەر دام و دەزگاو دەوڵەتدا بسەپێنن. هەروەک لە هێڵکاریەکەدا ئاماژەمان پێداوە ئەم باڵە ( دەعوە - بانگەواز ) ی ئیسلامی خۆی بە ئاشکرا دەکات و پەنا بۆ کاری توندو تیژ نابات. دووا ئامانجی ئەم گروپە لە ئیسلامی عەرەبی ـ سیاسی ئەوەیە کە تەواوی ڕەوەندی ئیسلامی ( عەرەب و ناعەرەب ) یش بخەنە خزمەت بیروڕای خۆیان ( ئومەی ئیسلامی عەرەبی ) چونکە ئومەی عەرەبی لە پەیڤەکانی ئەماندا هەڵبژێردراوی خودان، هەر لەبەر ئەمەشە کە دەزگای زانیاری هۆڵەندا( ئەبو جەح جەح) و گروپەکەی ( AEL کۆمەڵەی عەرەبەکانی ئەوروپا ) دەخاتە ڕیزی ئەم باڵەوە.

ئەبو جەح جەح ( دیاب ئەبو جەح جەح ) کە خۆی لە بنەڕەتدا خەڵکی لوبنانە، ڕەگەز نامەی بەلجیکی هەیە و لە بەلجیکا ڕێکخراوێکی پێک هێنا بە ناوی کۆمەڵەی عەرەبەکانی ئەوروپا،

ئەم کەسە کە ساڵی ١٩٩١ هاتۆتە بەلجیکا و داوای مافی پەنابەری کردووە، لەبەر ئەوەی کە چیرۆکی داخوازیەکەی بە پێ ی وەزارەتی دادی بەلجیکا درۆ بووە چەندین جار داخوازیەکەی ڕەت کراوەتەوە، بەڵام سەرەنجام لەبەر مانەوەی درێژی لەو وڵاتە ساڵی ١٩٩٦ ڕەگەز نامەی بەلجیکی پێ درا.. بە پێ ی ووتەکانی ئەم کەسە ( کە هەرگیز بڕوای پێ نەکراوە ) ئەندامی پارتی خودای لوبنانی بووە و لەگەڵ سەرۆکی پارتەکە کەوتۆتە کێشەوە ناچار بووە وڵات بەجێ بهێڵێت..

ئـەو ڕێکخـراوەی کـە ئـەم پیـاوە پێکـی هێنـاوە چـەنـدین داخـوازی تونـدی ئاراستـەی دەوڵـەتی بەلجیکا کردووە لـەوانـە زمـانـی عـەرەبـی بکرێتـە زمـانـی فـەرمـی لـە وڵات و ئـامـاژەی هـاتـوچۆ لـە وڵاتـدا بـە زمـانـی عـەرەبـیش بنوسـرێت، وێـرای ئـەوەش شـکـات نـامـەی دژی سـەرۆک وەزیـرانـی ئیـسرائـیل ( ئـار ئێـل شارۆن ) تۆمار کردووەو داوای لـە دەسەڵات دارانـی بـەلجیکـا کـردووە کـە لـەو وڵاتـەدا دادگایی بکەن، ئەم پیاوە بە چەندین کاری ئەوتۆ هەستاوە کە بۆتـە مـایـەی بێزارکردنـی دەسـەڵات دارانـی بـەلجیکـا لـەوانـەش بـڵاو کردنـەوەی چەندین گروپی ڕێکخـراوەکـەی بـە نێـو شـارەکـانی بـەلجیکـادا بـە کـامیراوە تاوەکو ڕەفتاری پۆلیس لە دژی موسڵمان و بیانیەکان تۆمار بکەن..
پاش پێکهێنانی ئەو کۆمەڵە سیاسیە لە بەلجیکا ئیستا لقی هۆڵانداش پێک هێنراوە کە بەپێ ی زانیاریەکانی دەزگای ئاسایشی گشتی باڵی یـەکـەمـی ئیسلامی سیاسی پێک دێنن.

باڵی دووەم:-

ئەم باڵە بە هەمان شێوە بـە بـێ پـەنـابردن بـۆ تونـدو تیـژی و بـە ئاشکرا کاری دەعوەی خۆی دەکات، ئەمانە بە پلەی یەکەم دژی کلتوری ( مەدەنـی - Civic ) ی ئـەوروپـان و بـە کلتـوری ئیبـاحـی نـاوی دەبـەن، لـە ڕێگـای خوتبـەو نوسراوو گوتارەکانیانـەوە خـەوشـەکانی دەخـەنـە ڕوو، پاشـان بـە پلـەی دووەم دژی سیاسـەتـەکـانـی ئـەوروپـان، لایـەنگـرەکـانی ئـەم گرایـشە بـە هـەمـوو شـێوەیـەک دژی بـەهـاو ئاکـارەکـانی کۆمـەڵگـای هۆڵانـدی ( ڕۆژئـاوایین ). ئامانجیان ئەوەیە کە چی دی لـە نێـو ئـەو کۆمـەڵگایانـەدا ژیانیـان بـەسـەر نەبەن بـەڵکو بگـەڕێنـەوە بۆ نێو کلتورو کۆمەڵگای خۆیان ( بـا بـە جـەستـەش نـەبێت و تـەنها بە ڕۆح بێت ) ، ئەمەش وادەکات کە لایەنگرانـی ئـەم ڕەوتـە ئیسلامیە بە هیچ شێوەیەک لـەگەڵ ئاوێتە بوون و تێکەڵاو یوونی کۆمـەڵگـای هۆڵاندی نەبن، ئـەمـانـە هـەوڵ دەدەن کـە جیاوازیـەکـانی کۆمـەڵگـا، بۆچونـە هەمەڕەنگەکان، پێکەوە ژیانی گروپە جیاوازەکانی کۆمەڵگا، ئۆتۆنۆمی تاکە کـەس کۆتـایی پـێ بێت و هـەمـوو کۆمـەڵگـا ( تـالیبـان ئـاسـا ) لـە یـەک ڕەنـگ هـەڵکێشن ( پیاوانی ڕدێن درێژو ژنـانی بورقا لـەسـەر ).
ئـەمـانـە دژی مـافی ژنـانن و بڕوایـان بـە پیـاو سـالاری هـەیـە سانـسۆرێکی کۆمـەڵایـەتی زۆر گـەورە لـەسـەر یـەکتـرو لـەسـەر تاکـەکـانی خۆیـان دادەنـێن.. وەزیری کارو باری پـەنـابـەران Verdonk لـە سـەردانێکیدا بۆ مزگـەوتی تلبـۆرخ

دەستی درێژ کرد بۆ تەوقە لەگەڵ ئیمامی مزگەوتەکە ئەحمەد سالم، بەڵام ئیمامی ناوبراو ئامادە نەبوو تەوقەی لەگەڵ کات چونکە بە دیدی ئەو تەوقە کردن لەگەڵ ئافرەتێکی ئەوهاداحەرامە.

پروپاگەندەو دەعوەکردنی ئەم تەرزە لە ئیسلامی سیاسی چەندین فۆرم لەخۆ دەگرێت لەوانە فێر کردنی لایەنگرەکانیان بە ڕێبازی سەلەفی و گەڕانەوە بۆ بنەڕەتی ئیسلام، ڕاڤەکردنێکی ئەوتۆ

پێشکەش دەکەن کە جگە لە موسڵمان و کۆمەڵگای ئیسلامی هەموو گروپە ئەتنیەکانی دیکە کافر و دژی ئیسلامن، بەم جۆرە ئەوەی ئیسلام نەبێت دژی ئیسلامە، هەر بەهاو کلتورێکیش هەڵقوڵاوی ناو شەریعەت و ئایینی ئیسلام نەبێت ئەوە هی کۆمەڵگای موسڵمان نی یەو دەبێت خۆیانی لێ دوور بگرن، کە ئەمەش لە ئاکامدا دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەندامانی ڕەوەندی ئیسلامی زیاتر بەرەو قبوڵ نەکردنی ئەوی دی هەنگاو بنێن و ئەو بەخشندەییەی کە سەدان ساڵە کۆمەڵگای هۆڵاندی پێ ناسراوە بخەنە مەترسیەوە..

### باڵی سێهەم:-

ئەو باڵەی بە نهێنی و بەبێ پەنابردن بۆ کاری توندو تیژی چالاکیەکانی خۆی لە شێوەی دەعوەدا ئەنجام دەدات ،ئەم باڵە گومانی ئەوەی لەسەرە کە هەمیشە وەک چەتر وابووە بۆ پاراستنی باڵەکانی دیکەو ژینگەیەکی لەبار بووە بۆ تروکاندنی گەرای باڵەکانی دیکە..

ئامانجی ئەم باڵە ئەوەیە کە تەواوی ڕەوەندی ئیسلامی لە چواردەوری دابڕن و زۆر بە توندی بیبەستنەوە بە ئایدۆلۆجیای سەلەفی خۆیانەوە، تا ئەو ڕۆژەی کۆمەڵگایەک دادێت کە حوکمی شەریعەت و قورئان پەیڕەو بکات..

ئەم باڵە کە زیاتر لە سەلەفیەکانی سعودیەو کەنداو سودمەند دەبن، ڕێکخراوە ناحکومیەکان دەکەنە چەتر بۆ ئەنجام دانی چالاکیەکانیان و بڵاوکردنەوەی بیروباوڕیان و بەرهەم هێنانی مرۆڤی توند ڕەو ئەو مرۆڤانەی کاتێک دەستەمۆ دەکرێن و دەخرێنە ژێر پرۆسەی دەماخ داشۆرین و ئامادە دەکرێن ڕێک لەوانە دەچن کە دەیان ساڵە لە نێو ئەشکەوتەکاندا ژیان بەسەردەبەن و هاوتای ( اصحاب الکهوف ) نامۆ بە کۆمەڵگاو دەوروبەر، نامۆ تەنانەت بە خێزانی خۆشیان دێنە گۆڕەپانەوە..

ئەم باڵە لە ئیسلامی سیاسی وێرای ڕێکخراوەکانی وەک ئەلحەرەمەین و ئەلئەقسا و ئەلوەقف چەندین تۆڕی ئەنتەرنێت و ماڵپەڕ دەکەنە سەنگەر و لە ژوورەکانی چەلەحانێدا ( چات کردن ) هاوتاکانی خۆیان دەدۆزنەوەو بیروباوەڕەکانیان دەگۆڕنەوەو زیاتر ڕادیکاڵ و توند ڕەو دەبن.

چەندین مزگەوتی وەک ئەلتەوحید لە ئەمستەردام و ئەلفورقان لە ئاییندهۆڤن و مزگەوتی ئەلسونە لە دانهاخ لەلایەن ئەم باڵەوە بەڕێوە دەبرێن، هەروەهاچەندین قوتابخانەی ئیسلامیش.

لە میانەی تەقینەوەکانی دورگەی بالی لە ئۆکتۆبەری ساڵی ٢٠٠٢ کە سێکی هۆڵەندی بە ڕەگەز ئەندەنوسی بە ناوی عەبدول واحید کادونگە ( Abdul Wahid Kadungga ) دەستگیر کرا کە گومانی ئەوەی لێدەکرا کۆنتاک پێرسۆن بێت لە نێوان ئیسلامیەکانی ئەندونوسیاو تۆڕی ئەلقاعیدەو ئیسلامیەکانی ناوخۆی هۆڵاندا..

## باڵی چوارهەم:-

ئەم باڵە فۆرمێکە لە ئیسلامی ڕادیکاڵ کە چالاکیەکانی خۆی بە نهێنی ئەنجام دەدات و هەمیشە هەوڵ دەدات لە تەواوی دنیای ئیسلام و نائیسلامدا دیموکراسیەت لەکەدارو لاواز بکات. ئەم باڵە لە ئیسلامی سیاسی ڕووبەڕوو بونەوەی ڕاستەوخۆی لەگەڵ دەسەڵاتدا پێ باش نییە و لە ڕێگای دەستگرتن بەسەر دامەزراوە دەوڵەتیەکانی وەک ( شارەوانیەکان ، دامەزراوە یاسایی یەکان، دامەزراوەکانی خوێندن و فێر کردن ) باوەڕو سیستەمی سیاسی خۆیان بڵاو دەکەنەوە، ئەم باڵە هەمان شێوەی باڵەکانی پێشو چالاکیەکانی کۆکتێلێکە لە پاراستنی کلتوری ئیسلام و دوور کەوتنەوە لە کلتورە نامۆکانی دیکە، وێرای ئەوەش لە ئەوروپاوە بەدڵ و بە گیان لە گەڵ ڕێکخراوە هاوبیرەکانی خۆی هاوکارە. ئەمانە نەفەس درێژ کار دەکەن و نەخشەی کارەکانیان هەمیشە دووربینی و دوور زەینی پیلانی ئاییندەی پێوە دیارە.

## باڵی پێنجەم:-

باڵی پێنجەم کە باڵێکی جیهادیەو بە نهێنی کارەکانی خۆی ئەنجام دەدات بە شێوەیەکی پراکتیکی لە هۆڵانداو ئەوروپا بەگشتی بونیان نیە، ئەم باڵە کە زیاتر باڵە چەکدار و شۆڕشگێرەکانی جیهانی ئیسلامیە و بە پێچەوانەی باڵی چوارهەم کارەکانی بۆ ماوەی کورتەو ئامانجی ئەوەیە کە بە زوو ترین کات دەسەلاَت تێک و پێک بدات و لە شوێنیدا خۆی دەسەلاَتی ئیسلامی دامەزرێنێت لەوانەش باڵە چەکدارەکانی ( الجماعة الاسلامیه ) لە میسرو شوێنانی دیکە. بەلاَم ئەوەی تایبەت بێت بە هۆڵاندا پێ دەچێت ئەندامانی پەڕاگەندەی ئەم باڵە لە ژێر ناونیشان و ناوی نەناسراودا توانیبێتیان جێگەی خۆیان دابین بکەن و ژیانێکی سیاسی سڕ بەسەر بەرن.

## باڵی شەشەم:-

ئەم باڵە هاوشێوەی باڵی سێهەمە بەلاَم لە جیاتی ئەوەی باڵێکی بانگەوازی بێت جیهادیە، بەلاَم کاری جیهادی خۆی بە ئاشکرا ناکات و ژێر بە ژێر بەرنامە ڕێژی بۆ جیهاد دەکات و کۆمەڵگا بەرەو توندو تیژی هان دەدات، ئەم باڵە لە ڕەوتی ئیسلامی سیاسی بە یەکێک لە و باڵانە دەژمێردرێت کە هانی توندو تیژی و جیهاد دەدات بە بێ ئەوەی خۆی ئەنجامی دات، لە هۆڵاندا زۆربەی هەوادارانی دژ بە سامی ( ئەنتی سامی ) پەروەردەی ئایدۆلۆجیای کۆنە پارێزو توندڕەوی ئەم باڵەن..
پارتی تەحریر کە لە ڕاپۆرتەکانی پێشوودا ناوی هاتووەو تیشکمان خستە سەری بەم باڵە دەژمێردرێت، بە پێ ی زانیاریەکانی دەزگای هەواڵگری هۆڵاندا ئەم پارتە تەنها لە ناو تورکەکانی هۆڵاندا نزیکەی ١٥٠٠ لایەنگرو ئەندامی هەیە، هەرچەندە ئەم حزبە بە ڕواڵەت لە ناو خۆی هۆڵاندا بانگەشەی جیهادی چەکداری ناکات بەلاَم لە ڕاستیدا لە چەندین وڵاتانی جیهاندا پەیوەندار بوون بە کاری توندو تیژەوە، ڕووداوەکانی مانگی ئازاری ساڵی ٢٠٠٥ ی قەرەغزستان زۆر بە توندی ئەم حزبەی هێنایەوە ڕووکاری گۆڕەپانی سیاسی.
ڕاپۆرتەکانی نێو خۆی هۆڵاندا باس لەوە دەکەن کە بزوتنەوەی قاپڵان کە باڵێکی توند ڕەوی چەکداری ئیسلامیەو پێ دەچێت باسکی سەربازی پارتی

تەحریر بێت لە نێو خۆی هۆڵاندا چەند سەد ئەندامێکی هەبێت، ئەم ڕێکخراوە توند ڕەوە کە لە ئەڵمانیا چالاکیەکانی لەلایەن پۆلیسەوە قەدەغە کراوە چەندین ئەندام و چالاکیی خۆی بۆ ناو هۆڵاندا گواستۆتەوە، سەرکردەکەشیان بە ناوی مەتین قاپلان ڕۆژی ٢٧-٥-٢٠٠٣ لە ئەڵمانیا ئازاد کرا.. ژمارەیەکی زۆری ئەندامانی ئەم ڕێکخراوە لە بەریتانیاو ئەڵمانیا هەنە..

## باڵی حەوتەم:-

ئەم باڵە، جیهادی خۆی بە ئاشکرا دەکات، بۆ ئەنجام دانی گۆڕانکاری لە بیروڕاو سیستەمی کۆمەڵگا کۆ لە هیچ شتێک ناکاتەوە. ئەم باڵە هاوشێوەی باڵی دووەم و سێهەم دژی کلتوری مەدەنی و کۆمەڵگای سڤیلە بەڵام دژایەتی ئەم باڵە شێوازی چەکداری جیهاد لە خۆ دەگرێت. ئایدۆلۆژیای ئەم باڵە بەهەمان شێوەی ئەو دوو باڵەی سەرەوە کە ناومان بردن سەلەفین بەڵام شێوەی جیهادی لە خۆ دەگرن ( سەلەفی جیهادی ) ، پەیڕەوانی ئەم باڵە هەڕەشەی جدیین بۆ سەرکۆمەڵگای هۆڵاندی و پێ دەچێت هەمیشە لە هەموو ئان و ساتێکدا هەڕەشە بن بۆ سەر کۆمەڵگاو دیموکراتیەت، فۆرمی ئەم باڵە بریتیە لە فۆرمێک هەر شتێک ڕەت دەکاتەوە کە پەیوەندی بە خۆرئاواو بەهاکانی خۆرئاواوە هەبێت. ئەم باڵە هەڵگری ئایدۆلۆجیای تەکفیر کردنە واتە دژایەتی هەر شتێک ( دەوڵەت و مرۆڤەکان ) کە ئیسلام نەبێت، تەنانەت ئەو حاکمە عەرەب و ئیسلامانەی کە ئاماژەی ئیسلام نەبونیان لای ئەم گروپە ڕوون دەبێتەوە تەکفیر دەکرێن تا دەگاتە خودی دەسەڵات دارە سەلەفیەکانی سعودیەش.

ئەم باڵە لە هۆڵانداش هاو شێوەی دەوڵەتە ئەوروپیەکانی دیکە هەڕەشەی جدی دەکاتە سەر سیستەمی دیموکراتی دەوڵەت و بۆ دووا جار لە ڕۆژی ٢٤-٦-٢٠٠٥ دا سێ ئەندامی دیکەی ئەم باڵە کە لە ڕێکخراوێکدا خۆیان بۆ هێرش کردن ساز دابوو دەستگیر کران ئەو ڕێکخراوەش ناو نراوە ( شانەی پایتەخت ) و لە بەشەکانی پێشوودا ئاماژەمان پێدان.

پێدەچێت بە هەمان شێوە ئەو دوو کەسەی کە بە نیازی سەفەرکردن بوون بۆ چیچان تا لەو دەڤەرە جیهادی خۆیان بکەن لە ڕیزبەندی هەمان باڵی توند ڕەو بن، هەرچەندە پۆلیسی هۆڵاندا ئەم دووکەسەو سیانی دیکەشی

دەستگیر کرد لە گەڵیاندا کە لە سەروبەندی ئەوەدا بوون کاری تیرۆریستی ئەنجام بدەن..

### باڵی هەشتەم:-

ئەم باڵە بە هەمان شێوە باڵی جیهادی توند ڕەوە و بە ئاشکرا چالاکیەکانی خۆی ئەنجام دەدات، لەگەڵ ئەم باڵەدا شۆڤێنیزمی عەرەبی تا ڕادەی فاشیزمی ئیسلامی درێژ دەبێتەوە و ئامانجی دروست کردنی دەوڵەتی عەرەبی ئیسلامی سەلەفی یە لە ڕێگای جەنگ و زۆرەوە.. ئەم باڵە لە هۆڵاندا بوونی نیە.

ئەو پۆلێن کردنەی سەرەوە تاڕادەیەکی زۆر ڕەنگە ووشک بێت بۆ خوێنەر کە بزانێت کامە ڕەوتی ئیسلامی لە کامە خانەدا خۆی دەبینێتەوە یاخود کامە ڕەوتی ئیسلامی لە هۆڵاندا یان ئەوروپا لە هەمووان بەهێز ترە بۆیە پێویست دەکات ئێمە لەم بارەوە چەندین تێبینی دیکە بخەینە سەر ئەو پۆلێن کردنەو باشتر لە گەڵ زەمینەی ڕاستی ( واقعی ) هۆڵانداوە بیگونجێنین..

ئەو ڕاپۆرتە هەرە تازەیەی دەزگای زانیاری هۆڵاندا هەڕەشەی ئیسلامی سیاسی بە پلەی یەکەم داناو ە بۆ سەر ئاسایشی ولات، وێرای هەڕەشەی ئیسلامی سیاسی ڕاپۆرتەکە ئاماژە بە چەندین هەڕەشەی دیکەی تیرۆریستی دەکات وەک ڕاپۆرتەکە خاڵێکی زۆر گرنگ دەوروژێنێت ئەویش تەمەنی ئەندامانی ئەو باڵانەی ئیسلامی سیاسین، ڕاپۆرتەکە ناوەندی تەمەنیان بە ١٦-١٧ ساڵ دیاری دەکات کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا چەندین پرسیارو سەرنجی گرنگ دێنێتە ئاراوە لەوانەش پرسیاری ئەوەی کە چ وادەکات لاوێکی لەدایک بوو لە هۆڵاندا کە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا زمانی زگماکی خۆی باش نازانێت و هیچ پەیوەندیەکی بە ولاتی باوکەوە نیە، تەنانەت ئاستی ئاشنا بونیشی بە ئیسلام زۆر نزمە وا بە ئاسانی ببێتە کەسێکی ئەوها تیرۆریست و بەرەو کاری تیرۆیستی هەنگاو بنێت..

ڕاپۆرتەکە ژمارەی ئەو کەسانەی کە ئامادەی کاری تیرۆریستین و هەڕەشەن بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەیی لە هۆڵاندا بە (١٠٠ – ٢٠٠ ) کەس لە قەڵەم دەدات ..

ڕاستەو خۆ پاش تەقینەوەکانی لەندەن ڕۆژی ٧-٧-٢٠٠٥ وەزیری ناوخۆی هۆڵاندا جەختی لەسەر ئەم ڕاستیە کردەوەو ڕایگەیاند کە بە لای کەمەوە ٢٠ گروپ و دەستەی توندڕەوی ئیسلامی سیاسی ساز و ئامادەن بۆ دەست وەشاندن لە نێو خۆی هۆڵاندا..

وێڕای هەڕەشەی ئیسلامی سیاسی چەندین هەڕەشەی دیکە لە ڕاپۆرتەکەی دەزگای ئاسایشی گشتی هۆڵاندا ناویان هاتووە لەوانەش هەڕەشەی هێرشی تیرۆریستی بە چەکی کۆکوژ و هەڕەشەی برەو سەندنی بزوتنەوەی ڕاستی توند ڕەوو بزوتنەوەی ناسیۆنالستی..

## سەرنج و دەرئەنجامەکان:

پاش خوێندنەوەی ئەم لێکۆڵینەوەیە هەندێک ڕاستیمان لا پەیدا دەبێت کە ئەوانیش بریتین لەمانەی خوارەوە:-

یەکەم- ڕەوەندی ئیسلامی بە ژمارەو بە سەنگی سیاسی لە هۆڵاندا بڵاو بۆتەوە.

دووەم- زۆربەی ئەندامانی ڕەوەندی ئیسلامی ئەمڕۆ لە هۆڵاندا هەڵگری ناسنامەی هۆڵەندین واتە بە هەموو یاسایەک هاولاتیەکی هۆڵاندین و ئەرک و مافیان لە سەرە.

سێهەم- ئەو ڕەوەندە تائێستا نەیتوانیوە وەک پێویست لە نێو کۆمەڵگای هۆڵاندیدا ئاوێتە بێت و بەهای خۆی وەک هاولاتیەکی ئەوروپی بزانێت.

چوارهەم- ئیسلامی سیاسی لە نێو ئەو ڕەوەندەدا بە تەواوی باڵەکانی خۆیەوە ڕەگی قوڵی داکوتیوە، ئەمەش وای کردووە کە هەمیشە کردەوە تیرۆریستیەکانی ئیسلامی سیاسی بلکێنرێت بە تەواوی ئەو ڕەوەندەوە، لەوەش زیاتر بەرامبەر بە ڕوودانی هەر کردەوەیەکی سیاسی تەواوی ڕەوەندەکە بخرێتە ژێر نیشانەی پرسیارەوە..

پێنجەم- لە نێوان ئەو ڕەوەندەو دەوڵەت و هاولاتیانی ڕەسەنی هۆڵاندا کێشەی سیاسی و کلتوری و ئەمنی هەیە کە پێویستیان بە چارەسەر کردنە..

ئەو دەرئەنجامانەی سەرەوە ڕەنگە لە زۆر حاڵەتدا بۆ زۆربەی ئەو دەوڵەتە ئەوروپیانەی دیکە شیاو بێت کە بە هەمان شێوە ژمارەیەکی زۆری ڕەوەندی ئیسلامیان لە خۆ گرتووە.

لێرەدا دەکەوینە شیکردنەوەی ئەو دەرئەنجامانەی سەرەوە:

ئەنفلۆنزای باڵندە:

تەقینەوەی میترۆکانی لەندەن دیسان ئەو ڕاستیەی دووپات کردەوە کە توندڕەوی ئیسلامی سیاسی شێوازی ڤایرۆسی هەیە و گواستنەوەی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە زۆر ئاسانە، هەروەها ئەوەشی سەلماند کە هاوشێوەی ئەنفلۆنزای باڵندە ئەودەمەی لە یابان سەرهەڵدەدات، لە ئەمەریکا مرۆڤ دەکەوێتە دڵە ڕاوکە..

تەقینەوەکانی لەندەن یەکسەرو دەست بەجێ زۆربەی دەوڵەتانی ئەوروپاو ئەمەریکای خستە ئامادەباشیەوە، ئەم کەوتنە ئامادە باشیەوە دیسان بەڵگەی ئەوەیە کە توند ڕەوی ئیسلامی سیاسی بە هەمان خێرایی و بە هەمان مەترسی ئەنفلۆنزای باڵندە کشوەرەکان تێدەپەڕێنێت.

چارەسەریش بە هەمان شێوە چون یەکە، لەو شوێنەی ئەنفلۆنزای باڵندە هەیە پێویستە جوان بە دیتۆل و کەرەسەی پاقژ کردنەوە شوێنەکان بشۆرێن و هەندێک لە مەڵبەندەکانی تروکاندنی باڵندەش ( دەواجن ) پێویستە بە تەواوی دابخرێن...

هەروەک لە بەشەکانی ئەم کتێبەدا ئاماژەمان پێدا، لە بەر هۆیەکانی چەوساندنەوە و دیکتاتۆریەت و چەندین هۆی دیکەی ئابوری و کۆمەڵایەتی، مەیدانە گەرمەکانی شەڕی سارد (ئەفگانستان، خۆرهەڵاتی ناوەڕاست ، باکوری ئەفەریقا ) بوونە هۆی تروکاندنی چەندیین گەرای زیان بەخش، کە ئەمانە هەموو، لە مەیدانەکانی یەکلاکردنەوەی شەڕی ساردا، دەست و پەنجەیان نەرم کردبوو، زۆربەی ئەمانە کە ئەو دەمە هیچ هەڕەشەیەکیان بۆ سەر بەرژەوەندی ئەمەریکا نەبوو، ساڵانیکی تەمەنی لاوی خۆیان لە نێو کوژراوەکان و قوربانیەکانی شەڕو نەهامەتیدا بەسەر بردووە، ئەمانە بە خوێن گۆش کرابوون و بە دەنگی قورئان و گوللە گوێچکەی زارۆکانیان دەکرایەوە، لە مانەش هەمووی ناهەموارتر ئەمانە تەنها لە هونەری شەڕو کوشتندا بەهرەمەند بوون..

ئەم جەنگاوەرە کفن لەبەرکردووانە کە هەرگیز لە بارو دۆخیکدا نەژیاون تیایدا ژیان بەهاو نرخی هەبێت، ئەمانە کە تەنها شەڕ بۆ ئەوە دەکەن کە زوو بمرن، ئەمانە کە تازە تەمەنی لاوی و هەرزەکاری خۆیان بۆ فەردەوس تەرخان کردووە، ئەمانە کە هەموو پیلانێکیان بۆ مردن هەیە و هیچ

بەرنامەیەکی ئەوتۆیان بۆ ئەم ژیانە ( کاتیە) ی ئێستا نیە، ئەمانە کە واتا هەمە ڕەنگەکانی ووشەکانی( مردن ) لە فەرهەنگیاندا بە هێندی زاراوەکانی تەکنەلۆژیای ئەوروپا سەخت و گرانە.. هتد ئەمانە بە خۆیان و ئەو هەگبە قورسەوە وڵاتی ( حەرام ) ەکانیان بەجێ هێشت و بەرەو وڵاتی (ئیباحی) حەڵاڵ ملیان گرتە بەر...

یاساکانی ئەوروپا لە بڵاو بوونەوەی ئەنفلۆنزاکەدا هاوکاریان بوو.. مافی پەنابەری، ڕاکێشانی خێزان، ڕەگەزنامەی ئەوروپی بە سێ ساڵ، مافی مرۆڤ و نەبوونی زیندان و لە سێدارەدان، هتد هەموو ئەم سیفەتە مرۆیانە بە خراپ سودی لێ بینراو خرایە ژێر بەرژەوەندی تاکە کەس و گروپەکانەوە..

ئەوەدەمەی کە ئیتر ئەو جەنگاوەرە ماندووانە حەسانەوەو ئاوڕیان دایەوە بە چواردەوری خۆیاندا یەکسەر هەروەک چۆن گورگ پەلاماری لاوازترین مەڕ دەدات و ملی دەشکێنێت ئەوانیش بە هەمان شێوە پەلاماری لاواز ترین هەڵقە ی کۆمەڵگای ئەوروپیان دا کە ئەویش ڕەوەندی ئیسلامی بوو.. ئەمانە خۆیان خستە نێو ئەندامانی نامۆی ئەو ڕەوەندەو دەستیان کرد بە گێڕانەوەی چیرۆکەکە لە سەرەتایەوە...

وە نەبێت ئەم دەوڵەتانەش ئاشنا نەبوبن بە چیرۆکی خوێنی ئەو جەنگاوەرانە، وەنەبێت نەیان زانیبێت کە ئەمانە پاشخانی کۆمەڵایەتی و سیاسیان هەمووی خوێن نەخشاندویەتی بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە پێناو بەرژەوەندی سیاسی خۆیاندا گوێ ی خۆیان لێ خەواند، ئاش لە خەیاڵی ئاشەوان دوور بوو، دەوڵەتانی ئەوروپا هەمیشە وەک دەستکەوتێکی سیاسی دەیانڕوانیە ئەم مرۆڤە هەڵهاتوانە، دەیانویست هەروەک چۆن بە چەپڵەی موجاهیدەکان سۆڤیەت و سوپای سوریان ڕیسوا کرد هەر ئاواش لە کاتی پێویستدا لە دژی دەوڵەتەکانی خۆیان بەکاریان بهێننەوە...

بەڵام ئەمە وانەکەوتەوە بەڵکو هەروەک لە بە شەکانی پێشودا ڕوونمان کردەوە ئەمانە ئیتر بوونە میوانی نەخوازراو و ئەرکی میوانداری خۆیان گرانتر کرد..

سەرەتای نەوەتەکانی سەدەی بیستەم ، ئەم جەنگاوەرانە بە ئەوروپادا بڵاو بوونەوە، ئەو سیفەتانەی کە لە سەرەوە باسمان کردن هاوکاریان بوو بۆ ئەوەی بە دڵی خۆیان بکەونە نێو ڕەوەندی ئیسلامی و بانگەوازی جیهاد و سەلەفیەت و توند ڕەوی بڵاو کەنەوە، بارو دۆخ بۆ ئەم هەڵسوڕانە زۆر لە بار بوو:

- لە لایەکەوە ڕەوەندی ئیسلامی کە لە نێو ئەو وڵاتە ئەوروپیانەدا بڵاو ببونەوە، ئامادەییەکی زۆریان تیادا بوو بۆ وەرگرتن و قبوڵ کردن و هەزم کردنی ئەو پەیامە تازەیەی کە لە وڵاتی باوکەوە دێت و ڕۆح دەکاتەوە بە بەریاندا و لە نامۆیی کۆمەڵگای ئەوروپا ڕزگاریان دەکات.

- لە لایەکی دیکەوە حکومەتە ئەوروپیەکان هەرگیز لە خەیاڵی ئەوەدا نەبوون کە ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەم ڕەوتە ئیسلامیە پەیامەکەی خۆی بە جۆرێک بڵاو دەکاتەوە کە دەبێتە مایەی هەڕەشە بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەیی ئەوروپا...

ئەو دوو خاڵە بوونە هۆی ئەوەی کە وورده وورده ژینگەی لە بار بۆ دروست بوون و بڵاو بوونەوەی ئیسلامی سیاسی بخولقێت..

## ژینگەی بڵاو بوونەوەی ئەنفلۆنزاکە

تاقی کردنەوە و شارەزایی ئەو جەنگاوەرانەی کە بە هەزارانیان ڕوویان لە ئەوروپا کردبوو بووە هۆی ئەوەی کە چەندین ڕێگای دوور زۆر نزیک بکەنەوە و بەرنامەکانیان بۆ ماوەی درێژ خایەن دابرێژن..

ئەوانە دەست بە جێ و بە پارەی زۆرو زەوەندی سعودیەو دەوڵەتانی کەنداو کەوتنە دروست کردن و بنیات نانی دەیان و سەدان مزگەوت، بە دروست کردنی ئەم مزگەوتانە توانیان یەکەم درزی گەورە بخەنە ڕیزی کۆمەڵگای ئەوروپاوە، مزگەوتەکان کرانە شوێنی دیسان کۆکردنەوەی ڕەوەندی لێک ترازاوی ئیسلامی، مزگەوتەکان توانیان بەردی بناغەی ئەو دیوارە ئەستورە دارێژن کە لەمەو پاش لە نێوان هەردوو لای کۆمەڵگاکە دروست دەبێت ( ئەوروپیە ڕەسەنەکان و ئەوروپیە بێگانەکان یاخود موسڵمانەکان ) .

مزگەوتەکان هاوتای موگناتیس وەک وورده ئاسنی نێو خۆڵ و پوش و پەڵاش توانیان زۆربەی هەرە زۆری تاکە پەراگەندەکان لە دەوری یەکتر کۆکەنەوە، مزگەوتەکان بەم کارەیان بارو دۆخێکیان هێنایە ئاراوە بووە هۆی ئەوەی تاکی موسڵمان زیاتر خۆی لە نێو کۆمەڵگای خانە خوێدا دووره پەرێز کات و زیاتر بەرەو کلتوری وڵاتی باوکی پاشەکشە بکاتەوە..

مزگەوتەکان بوونە هۆی ئەوەی کە لە نێو جوگرافیای ئیباحی گڵاوی کافر و خاچ پەرستەکاندا جوگرافیایەکی ڕۆحی و خەیاڵی هێندە بێ گەرد بۆ

ڕەوەندی ئیسلامی بدۆزێتەوە کە (مزگەوت خوشەویست ترین و بێگەرد ترین جوگرافیای تاکی نامۆ بێت و دەرەوەی مزگەوتیش جوگرافیای کوفرو هەموو کارە دزێو و ناشیرینەکان بێت ).

وێرای مزگەوت قوتابخانە ئیسلامیەکانیش بە هەمان شێوە، دەبنە هۆکاری ئەوەی کە دیسانەوە ئاوێتە بوونی ڕەوەندی ئیسلامی توشی گەورەترین فیاسکۆی خۆی بێت و هەر لە تەمەنێکی زۆر کەمەوە، منداڵ بە گیانی وەرنەگرتنی کلتوری ئەوی دی و رق و کینەو ڕەت کردنەوەی بەها ڕۆژئاواییەکان و دابڕانی ڕۆحی و دەرونی و کۆمەلایەتی لەو کۆمەلگایەی کە تیایدا لە دایک بووەو تیایدا گەورە دەبێت پەروەردە دەکرێت.. منداڵانێک کە هەر لە سەرەتاکانی تەمەنی خونچە بەهارییی یانەوە چیرۆکی مردن و جەهەنەم و یاجو ج و ماجوجیان فێر دەکرێت..

منداڵانێک بە دەر لە خواستی خۆیان و لەسەر خواستی گەورەکانیان ئایینێک بە سەریاندا دەسەپێت کە خۆیان لە هەڵبژاردنیدا هیچ هەڵوێست و وتەیەکیان لێ داوا نەکراوە..

ئەم پرۆسە بەردەوامەی نێو ڕەوەندەکە لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی بەرهەم هێنانی وێنەیەک کە بەشداریەکی زۆر کاریگەری دەبێت لەسەر ڕەفتارو ڕەوشتی تاکەکانی ڕەوەندی ئیسلامی، تاڕادەی ئەوەی کە کاری بەرهەم هێنانی توندو تیژیش ئاسانتر کات..

## ئەو وێنانەی کە مزگەوت دەیانبەخشێت:

لە بەشەکانی پێشودا وێنەی بێگانەکان و موسڵمانەکانمان لە زەینی هۆلاندیەکان و ئەو وێنەیەی کە میدیا دەیسەپێنێت بەسەر ڕەوەندی ئیسلامیدا پیشاندا، بە هەمان شێوەش لە نێو ڕەوەندی ئیسلامیدا وێنەیەکی هەڵگەڕاوە بۆ هۆلاندیەکان ئامادەیە..

مزگەوت لە بەرهەم هێنان و ناشیرین کردن و دزێو کردن و سواغ دانی ئەو وێنەیەدا ڕۆڵێکی نەرێنی خراپ دەبینێت..

هەر لە ووتاری ووتە بێژەکانی مزگەوتەوە، تا دەگاتە وەعزەکان و نەسیحەتەکان و وانە ئایینیەکان.. هتد ئەمانە هەر هەموو پێکەوە بەشدار

دەبن لە بەخشینی وێنەیەک کە بەهەمان ئەو وێنەیەی بەسەر ڕەوەندی ئیسلامیدا سەپێنراوە قێزەوونە..
ئەو وێنەیەی کە مزگەوت پێکی دەهێنێت هەمیشە بۆ باشترین شێوەی نواندن ڕەهەندە ئەخلاقیەکان دەکاتە ڕوکەش ، لەم وێنەیەدا دەرەوەی مزگەوت کۆمەڵگای ئیباحی خاچ پەرستەکانە و ئەوەی تێکەڵی دەبێت وەک ئەوان گلاو دەبێت ، کۆمەڵگای دەرەوەی مزگەوت کۆمەڵگایەکە کە مرۆڤی قژ زەرد پێکی هێناوە ئەو مرۆڤانە هەموو پیاوەکانیان هۆمۆ ( نێر باز ) ن و هەموو ئافرەتەکانیشیان سۆزانین. ئەندامانی ئەو کۆمەڵگایە لە ڕووی ڕەوشتەوە هەرەسیان هێناوە و هەموو لەگەڵ یەکتر سێکس ئەنجام دەدەن، تەنانەت ئاژەڵیش لەم شالاوە سێکسیە دەرباز نەبووە..
لە خۆڕا نەبوو کە ئیمامی مزگەوتێکی شاری ڕۆتەردام کە پاشان درایە دادگا لە یەکێک لە گوتارەکانی ڕۆژی هەینیدا ڕاشکاوانە گوتی ( هەر موسڵمانێک لەگەڵ کەسێکی هۆلاندی هۆمۆ گفت و گۆ بکات ئەوە یەکسەر ئەویش دەبێتە هۆمۆ چۆنکە هۆمۆ بوون نەخۆشیەکی درمەو لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە دەگوێزرێتەوە)
وێنەی کۆمەڵگای ناو مزگەوت وێنەیەکی تەواو جیاوازە کە ئیسلامی سیاسی و گروپە توند ڕەوەکان بەردەوام بە ڕەنگ و بەها ئیسلامیەکان و تەقسەکانی فەردەوس دەینەخشێنن، ئەندامانی ئەو کۆمەڵگایە شوناس و کلتوریان بەرزترو خاوێن ترە، ئایینەکەشیان تاکە ئایینی پەسەند کراوی سەردەمە و قورئانیش تاکە کتێبی پیرۆزی پەسەند کراوی خواوەندە.
دیوێکی دیکەی ئەو وێنەیە مرۆڤەکان تێ دەپەڕێنێت و باز دەداتە نێو ڕەهەندە کۆمەلایەتی و سایکۆلۆژی و مێژوییەکانەوە... هەموو بەها کۆمەلایەتیەکانی دەرەوەی مزگەوت گلاو یان حەرام دەکرێن، تێکەلاو بوون و ئاوێتە بوون لەگەڵ ئەو کۆمەڵگایە کە ئەندامەکانی هەموو خاچ پەرست و جولەکەو سەهیۆنیین حەرام دەکرێت و بە شداری کردن لە بوارە کۆمەلایەتییەکانی ژیاندا لەگەڵ کۆمەڵگای دەرەوەی مزگەوتدا بەهەمان شێوە حەرامە، لە حاڵەتی پێکهێنانی خێزانیشدا هەمیشە دەبێت لایەنی بەرامبەر ئەگەر پیاو بێت یان ژن ئایینەکەی خۆی بگۆڕێت و تۆبە بکات و بێتە سەر دینی ئیسلام، خۆ ئەگەر کەسێکی ئیسلام ئایینەکەی خۆی گۆڕی ئەوە مورتەدەو دەبێت سزا وەرگرێت.. لە نێو ژینگەیەکدا کە بەو شێوەیە وێنە دەکرێت زۆر کارێکی ئاساییە تاکی ڕەوەندی ئیسلامی خۆ ماندوو کردن بە بەهاکانی ئەم کۆمەڵگایەوە بە بێ هودە بزانێت و تەنها ڕۆڵی

خۆی بەوە دیاری بکات کە بەس بە جەستە لە دەرەوەی کۆمەڵگای مزگەوت بێت و بە ڕۆحیش لە نێو ماڵ و مزگەوت دا بێت لە نێو ئەو جوگرافیایەی کە هی خۆیەتی..

لە ڕەهەندە سایکۆلۆژیەکەشدا هەمیشە ئیسلامی سیاسی هەوڵدەدات لە ڕێگەی مزگەوت و قوتابخانەو بوارەکانی دیکەی پڕوپاگەندەوە ئەوە بۆ ئەندامانی ڕەوەندەکە دووپات کاتەوە کە دنیای ڕۆژئاوا بە پێ ی بەرنامەو کاری درێژ خایەن کاری بۆ ئەوە کردووە کە دنیای ئیسلامی ئەوان داگیر بکات و وێرانی بکات و لە هەمو و بەها ڕەسەنەکانی خۆی ڕووتی کاتەوە، ئەوانە هەمیشە کێشەی عەرەب و ئیسرائیل دەکەنە نمونەو هەوڵ دەدەن کە هەمیشە تاکەکانی نێو ئەو ڕەوەندە خۆیان بە غەدر لێکراو و زوڵم لێ کراو بزانن، هەوڵ دەدەن کەسایەتییەک بدەنە ئەو ڕەوەندە کە لە ناخی هەر تاکێکدا سایکۆلۆژیای مرۆڤی مەزلوم و چەوساوە چەردەیەکی گەورەی ڕەفتارەکانیان ئاراستە بکات ، هەر ئەوەندەی کە تاکە ووشیارەکانی ئەو ڕەوەندەش بەوپڕۆگرامە سایکۆلۆژیە گۆش کران ئەوە ئیتر لامان ئاشکرا دەبێت کە بۆچی هۆشیار ترین و خوێنەوار ترین ئەندامانی ئەو ڕەوەندە ئامادەن کە بە دڕندانە ترین شێوە دەست بووەشێنن..

ڕەهەندە مێژویی یەکەش پاڵپشتێکە بۆ ڕەهەندە سایکۆلۆژیەکە . یەکێک لەو وەتەرە گرنگانەی کە ئیسلامی سیاسی کاری لەسەر دەکات ئەوەیە کە هەمیشە ئەندامەکانی خۆی بەرێتەوە بۆ زەمەنی ڕابوردوو، زەمەنێک کە تەواو پێچەوانەی زەمەنی ئێستایە، زەمەنێک کە تیایدا ئیسلام و کۆمەڵگای ئیسلامی لە چاخی زێڕینی خۆیدا دەژیا، بەر لەوەی دنیای ڕۆژئاوا ئیمارەت و خەلافەتە ئیسلامیە زێڕینەکەی ئەمان تێک بشکێنێت، ئەمان سەرچاوەی هێز و دەسەلات بوون لە دنیادا و سنوریان نزیک ئەوروپای ئەمرۆ بووە، ئەمان سەرچاوەی زانست و مەعریفە بوون و زمانی عەرەبی و ئیسلامیەکەی ئەمان زۆر لە ئینگلیزی و فەرەنسیەکی ئەوان بڵاو تر بووە.. هتد

ئامادەکردنی کەشێکی لەو بارە وا لە تاکی ئیسلامی دەکات کە نەک لەم زەمەنەدا نەژی بەڵکو هەرچی شتێک کە بەرجەستەی ئەم زمەنە دەکات ئەوان ڕەتی کەنەوە، لە خۆڕا نیە کە لە نێو دڵی ئەوروپادا ئەودەمەی خانەیەکی تیرۆریستە ئیسلامیەکان لە لایەن پۆلیسەوە دەپشکنرێت وێرای مادەی تی ئێن تی و کەرەسەی تەقاندنەوە، شمشێر و خەنجەری ئیسلامی و عەرەبی دەدۆزرێتەوە، ئەم دیاردەیە کە لە سعودیەش دووپات بۆوە جگە لە نۆستالیژای سەردەمی خەلافەت چی دی نیە.

ئەو دەمەی گروپێکی تیرۆریستی ئیسلامی دەستگیر دەکرێن مرۆڤ سەری لەو هەموو گەڕانەوەیە دەسوڕمێت بۆ ڕابوردوو، ناوی ڕێکخراوەکان بە ناوەکانی سەردەمی فتوحات ( سوپای فاروق جەیشی موحەمەد، ئەبو قەتادە، ئەبو موسعەب، ئەبو حەفەس، تەلحە، حەنزەلە، هتد ) ناونراون ، ئەم سەرسوڕمانە وای لە هەندێک نوسەری حەپەساوی عەرەبی کردووە کە ئەو گروپانە بە ( ئەسحابول کەهف ) ناوبەرن.. لە ڕاستیشدا ئەمانە هۆشیارانە دەکرێنە ئەسحابول کەهف چونکە لە ژێر کارلێکی هەر سێ ڕەهەندە کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆژی و مێژویی یەکەدا ئیتر حاڵەتێکی نامۆ بوون توشی ئەو کەسانە دەبێت کە ئەنفلۆنزاکە توشیان دەبێت کە هەرگیز خۆشیان هەست بەوە ناکەن کە لەم سەردەمەدا دەژین..

## بەرهەم هێنانی تیرۆریست:

بەو جۆرەی سەرەڕە مەیدانەکانی ئیسلامی سیاسی ( مزگەوت - تۆتابخانە - کتێبخانەکان - ئەنتەرنێت - میدیا ) بە شێوەیەکی زۆر چالاک و چڕو پڕ لە جوڵەدان، ژینەگەیەکی زۆر باش ئامادە دەکەن بۆ کارکردن لە نێو ڕەوەندی ئیسلامیدا، ئیتر لەم ژینگەیەوە پرۆسەکە دەست پێ دەکات:-

**هەنگاوی یەکەم - بە سیاسی کردنی تاک یاخود ڕەوەندەکە.**

لەم هەنگاوەوە یەکەمین سەرەتا بۆ ئەوە دروست دەکرێت کە یەکەم جار تاکەکە لە هەموو چواردەورێکی نائیسلامی خۆی داببڕن، بەرهەم هێنانی ئیسلامی سیاسی لەم خاڵەوە دەست پێ دەکات، هەر لەم خاڵەشەوە یەکەم پرۆسەی دژ بە ئاوێتە بوون دەست پێ دەکات و هەنگاوی یەکەمی دابەش کردنی کۆمەڵگای ئەوروپی تەواو دەبێت..

**هەنگاوی دووەم- توند ڕەو کردنی تاکەکانی ئیسلامی سیاسی**

جیاوازی هەنگاوی یەکەم و دووەم ئەوەیە کە لە هەنگاوی یەکەمدا تەنها پرۆسەیەک بە ڕێوە دەبرێت کە تیایدا ڕەوەندی ئیسلامی و تاکەکانی بەرەو

بە سیاسەت کردنی ئایین دەچن، ئەم هەنگاوە هەرچەندە نەلەگەڵ یاسا و نەلە گەڵ کلتوری دەوڵەتانی ئەوروپادا ناگونجێت کە سەدان ساڵە ئایین و دەوڵەتیان لە یەک جودا کردۆتەوە، نابێتە هەڕەشەی جدی بۆ سەر ئاسایشی ناوخۆی ئەو وڵاتانە، هەنگاوی دووەم لە بنەڕەتدا خاڵی دەسپێکی لێکترازانی کۆمەڵگایە.
لەم هەنگاوەدا، باڵە توند ڕەوەکانی نێو ئیسلامی سیاسی بە نێو تاکەکاندا دەگەڕێن و کار بۆ ئەوە دەکەن کە ئەو تاکانە بەرەو توند ڕەوی بەرن و لە گروپە توند ڕەوەکانی نێو باڵە جیاوازەکانی ئیسلامی سیاسیدا ڕێکیان خەن..

## هەنگاوی سێهەم – بە تیرۆریست بوونی توند ڕەو

لەم قۆناغەدا تاکە توند ڕەوەکان بەرەو کاری تیرۆریستی هەنگاو دەنێن ، کەسی توند ڕەو لەم قۆناغەدا ئیتر لە ڕووی کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆژیەوە ئامادەکراوە، دەماغی زۆر بەباشی داشۆراوەو لە هەر ئان و ساتێکدا بێت دەست دەوەشێنێت، لێرەدا پرۆسەی بەرهەم هێنانەکە دەگاتە ئامانج.
بەڵام بێ گومان پێویستە وەڵامی ئەو پرسیارە لێرەدا بدەینەوە: ئایا کۆمەڵگای دەرەوەی مزگەوت چ ڕۆڵێک لە پرۆسەی بەرهەم هێنانی تیرۆریستدا دەگێڕێت؟
ئەوەی لە سەرەوە باسمان کرد تەنها نیوەی پرۆسەی بەرهەم هێنانەکەیە چونکە نیوەکەی دیکەی پرۆسەکە لە کۆمەڵگای دەرەوەی مزگەوت دا تەواو دەکرێت..
ئەو دەمەی کە ئیسلامی سیاسی سەرگەرمی خۆسازدانە بۆ بەرهەم هێنانی ئەو پرۆسەیە، لە دەرەوەی مزگەوتدا باشترین ژینگەی لە بار ئامادەیە بۆ خێرا کردنی پرۆسەکە.
لە بەشەکانی پێشوی ئەم نوسینەدا باسمان لە پەیوەندەی ڕوو لە خراپ و ئاڵۆزی ڕەوەندی ئیسلامی و هۆڵاندیەکان کرد، لێرەدا باشتر بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە بەهۆی ئەو ڕاستیانەی باسمان کردن ( ڕەگەز پەرستی، بێکاری ڕەوەندی ئیسلامی، دوواکەوتوویان لە ڕووی خزمەت گوزاریە کۆمەڵایەتیەکانەوە، توندوتیژی،هتد ) هەموو ئەم ڕاستیانەی دەرەوەی کۆمەڵگای مزگەوت هەمیشە وا دەکات کە پاشە کشەی ڕەوەندی ئیسلامی بۆ نێو مەڵبەندەکانی خۆی بە تایبەت مزگەوت وماڵەوە خێرا تر بن و وێنە

دروست کراوەکانی ناو مزگەوت بۆ دەرەوەی مزگەوت زیاتر شێوەی واقعی وەرگرن و باشتریش لە لایەن تاکەکانی ڕەوەندی ئیسلامیەوە پەسەند بکرێت، بەم جۆرە هەنگاوەکانی توند ڕەو بوون وەک گەرایەکی نەتروکاو لە دەرگای مزگەوت و قوتابخانە ئیسلامیەکانەوە دێنە دەرەوە بەڵام لە نێو کۆمەڵگای دەرەوەی مزگەوت ژینگەی گەشەسەندن و تروکاندنی ئەو گەرایانە هاوتای ژینگەی مزگەوت لەبارە بۆ گەشە سەندن و بڵاو بوونەوەی تۆوی توند ڕەوی..

بۆ ئاسانکردنەوەی زیاتری پرۆسەی بەرهەم هێنانی تیرۆریست پشت دەبەستین بە هەمان هاوکێشە ساکارەکانی هەر پرۆسەیەکی بەرهەم هێنان بەم جۆرەی خوارەوە:-

$$Y = X_1 + X_2 + X_3 + X_4 + U$$

Y یەکسانە بە بەرهەم

X یەکسانە بە کەرەسەکانی بەرهەم یاخود ( ڕەگەزەکان )

U یەکسانە بە ( هۆکاری کت و پڕ و ڕاندۆم )

سەرنجێکی ووردی ئەو هاوکێشە ئاسانە ئەوەمان بۆ دەردەخات کە هەر پرۆسەیەکی بەرهەم هێنان **Y** پێویستی بە کۆمەڵێک کەرەسەو ڕەگەز هەیە **X** وێرای لەبەر چاو گرتنی هەر هۆکارێکی کت و پڕ واتە **U** کە ئەمەش لەو هێرش و کردەوانەی ئەمەریکاو ئەوروپادا خۆی دەنوێنێت کە هەمیشە ئیسلامی سیاسی دەیکاتە بەهانە بۆ ئەنجامدانی کردەوە ترۆرستیەکانی خۆی..

بەم جۆرە بۆ بەرهەم هێنانی تیرۆریست پێویستمان بە ئیسلامی سیاسی و مزگەوت و قوتابخانەی ئیسلامی و سەرچاوەی مادی و ژینگەو دەوروبەرێک هەیە تا پرۆسەکە بە ئەنجام بگات..

زۆر هەڵەن ئەو کەس و لایەنانەی نێو هۆڵانداو دەوڵەتە ئەوروپیەکان و تەنانەت خودی دەوڵەتانی ئیسلامیش کە مزگەوت و قوتابخانەی ئیسلامی و ئیسلامی سیاسی بە تاکە کەرەسە دەزانن بۆ بەرهەم هێنان و کامڵ بوونی تیرۆریزم.. بەهەمان شێوە بە کەم کردنەوەی توانای یەک

دانە یان دوو دانە لە کەرەسەکان پرۆسەی بەرهەم هێنانەکە ڕەنگە دووا کەوێت یاخود لە ڕووی چۆنایەتی یەوە زۆر کامڵ نەبێت بەڵام هەرگیز کردەوەی بەرهەم هێنانەکە ناوەستێنێت..

بۆیە پێویستە هەموو ڕەگەزەکانی ئەو بەرهەمە نارەسەنە بە جۆرێک لاوازکرێن کە چی دی کارخانەکان نەتوانن کاڵاو خزمەت گوزاریەکانیان بەرهەم بێنن یاخود هەر هیچ نەبێت بە شێوەیەکی ئەوتۆ بەرهەم بێت کە لەهیچ بستێکی ئەم دنیایەدا بازاڕی ساغ کردنەوەیان نەبێت.

## ئیسلامی سیاسی بەرەو کوێ؟

بەر لەوەلام دانەوەی ئەم پرسیارە هەندێک پرسیاری دیکە هەنە کە خۆیان دیسانەوە دەبنەوە بە سەرچاوە بۆ وەلام دانەوەی یەکەم پرسیار:

ئیسلامی سیاسی لاواز تر دەبێت یان بە هێز تر؟ یان هەروا وەک خۆی نیوە مردوو دەمێنێتەوە؟

ئایا ئیسلامی سیاسی هاوتای بلۆکی خۆرهەلات لەم ڕووبەڕوو بونەوەیدا لەگەڵ ئەمەریکا و دنیای خۆرئاوا چەند ساڵ بڕ دەکات؟

لە جەنگی دژ بە تیرۆردا کێ سەردەکەوێت؟

ئایا مەیدانەکانی ڕووبەڕوو بوونەوەی ئیسلامی سیاسی تاڕادەیەکی زۆر هاوتای هەمان مەیدانەکانی ڕووبەڕووبونەوەی جەنگی ساردە؟

ئەمانەو چەندین پرسیاری دیکە کەڕۆژانە چاودێرانی سیاسی و سەنتەرەکانی لێکۆڵینەوەو لایەنە بەرپرسەکان لە خۆیانی دەکەن..

لێرەدا هەوڵ دەدەین لە چوارچێوەی شیکردنەوەکاندا، بۆچوون و شیکردنەوەی گونجاو بۆ هەریەکە لەو خاڵانە بکەین تا بزانین ئاییندەی ڕەوشەکە بەرەو کوێ دەچێت و ئاستی تێگەشتنی هەردوولای کێشەکەش لە چ ئاستێکدایە..

ڕۆژئاوا تائێستا بە چوار ئاراستەی جیاواز مامەڵە لەگەڵ دیاردەی تیرۆریزمی ئیسلامی سیاسی دەکات، کە ئەمانەی خوارەوەن:

یەکەم/ کارکردن بە ئاراستەی هەڵوەشاندن و لێدان و لاواز کردنی دیاردەکە بە شێوازی هاوکاری زانیاری و هەواڵگری لە نێوان تەواوی دەوڵەتانی پەیوەستدا.

دووەم/ سەپاندنی ریفۆرم و چاکسازی بەسەر زۆربەی دەوڵەتانی ئیسلامی و عەرەبیدا، وێرای دیموکراتیزە کردنی هەندێک لە دەوڵەتەکانیان.

سێهەم/ ئەنجام دانی شەڕی پێشگرتن لە پێناو دوورخستنەوەی تیرۆریزم لە خۆیان.

چوارهەم/ چاوخشاندنەوە بە شێوازی مامەڵەکردن لەگەڵ ئیسلامی میان ڕەوداو ئەگەری هێنانە ناوەوەیان بۆ نێو پرۆسەی سیاسی..
بەم جۆرە ئاشکرا دەبێت کە شێوازی مامەڵە کردنەکە لە دوو خاڵەوە سەرچاوەی گرتووە
یەکەم/ ڕووبەڕوو بوونەوەی تەکنەلۆژی و ئەمنی .
دووەم/ ڕووبەڕوو بوونەوەی فەرهەنگی و ئایدۆلۆجی.
کەواتە هاوشێوەی هەموو جەنگەکان ئەم جەنگەش بۆ ئەوەی ببرێتەوە پێویستە زەمینەی لە باری بۆ برەخسێت..
ئەوەی لە هەموو خاڵەکان گرنگترە ئەوەیە ئەو جەنگە بەر لەوەی جەنگێکی تەکنەلۆژیاو ئەمنی بێت جەنگێکی مەعریفی و فەرهەنگیە، جەنگی ئەقڵی ڕووناکە بەرامبەر بە ئەقڵی تاریک. بردنەوەی ئەم جەنگە تەنها سەرکەوتن نی یە بۆ ڕۆژئاوا بەڵکو سەرکەوتنە بۆ خودی جیهانی ئیسلامیش، سەرکەوتنی ئەوبەرەیەیە لە ئیسلام کە ماوە نادات ئایەتە جوانەکانی وەک ( أقرا باسم ربک – ادع الی سبیل ربک بالحکمه و الموعظه الحسنه وجادلهم بالتي هي أحسن ) بگۆڕدرێن بە ( أقتل باسم ربک – وارهبهم بالتي هي أحسن ).. سەرکەوتنی ئەو موسڵمانانەیە کە هێشتا چیرۆکەکەی عومەر ئیبن خەتابیان لە یاد ماوە کە ئافرەتێک هەڵەیەکی بۆ ڕاست دەکاتەوە و پاشان ئەویش وتە بەناوبانگەکەی خۆی دەڵێت ( اخطا عمر و أصابت امرأه ).
ڕاستیەک هەیە کە کەم جار گفتو گۆی لەسەر دەکرێت ئەویش ئەوەیە کە لەنێو خودی ڕەوەندی ئیسلامیدا لە هۆڵاندا زۆرێک لە موسڵمانان دژی ئیسلامی سیاسین و پێیان خۆش نیە کە بانگەوازە پیرۆزەکانی خۆیان بە کردەوەو ڕەنگی سیاسی لەکەدار کەن و پێیان وایە ئایین تەنها بۆ خوداوەندە و کارێکی باش نی یە کە لەگەڵ ئەو هەموو گەمە پیس و گڵاوانەی سیاسەتدا تێکەڵ بکرێت.. بەڵام بە داخەوە ئەم دەنگە تائێستا لە نێو ڕەوەندی ئیسلامیدا هێشتا وەکو پێویست نەخراوەتە سەر مێزی گفت و گۆ، هێشتا زۆر لە دامەزراوە ئایینی و کلتوریەکان شەرمێکی کچانەیان هەیە لە خستنە ڕووی ئەم ڕاستیەدا..
ئەم جەنگە پێویستی بەوەیە کە هەردوو لای کێشەکە، دەوڵەتانی ئەوروپی و دەوڵەتانی ئیسلامی، ئەوروپیە مەسیحیەکان و بێگانە موسڵمانەکان، قژ زەردەکان و قژ ڕەشەکان سەرلەنوێ واتای چەمکە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکان لێکدەنەوەو پیاچونەوەیەک بە تەواوی ڕەهەندەکانی ژیاندا

بکەن، دەست بە گفتوگۆی شارستانی بکەن و پەنجە بخەنە سەر ئەو شوێنانەی کە پەنجەی نەخراوەتە سەر و گفتوگۆی جدی دەست پێ بکەن، گفتو گۆ لە نێوان دوو بەرەدا هەمیشە پشت بەوە دەبەستێت کە داخۆ هەر لایەکی کێشەکە تا چەند لە رووی مەعریفیەوە سازن بۆ گفتوگۆ، تا چەند ئامادەن هەڵەو خەوشەکانی خۆیان بدرکێنن..

ڕەوەندی ئیسلامی دەتوانێت لە جیاتی گۆشەگیری و خۆ دوور خستنەوە لە سەنتەرەکانی بڕیار دان، لە جیاتی ئەوەی وەک بینەر تەنها ڕۆڵی تەماشاکرنی رووداوەکانی هەبێت، پۆزەتیفانە کاریگەری خۆی بکاتە سەر بونیادی سیاسی دەوڵەت و لە بەرهەم هێنانی ئایدیاکان و وەبەرهێنانی هزرەکاندا خاوەنی پێگەو چوارچێوەی خۆی بێت و بتوانێت لەو ڕێگایەوە کاریگەری خۆی بکاتە سەر کۆمەڵگای ئەوروپی ...

تاکە کلیلی چارەسەری تیرۆریزم لە نێو ڕەوەندی ئیسلامی خۆیدایە، لە سەر موسڵمانەکانی ئەوروپاو هۆڵاندا پێویستە کە چی دی هەموو تاوانەکە نەخەنە سەر کۆمەڵگای رۆژئاواو لە جیاتی ئەوەی هەمیشە ئەوە دووپات بکەنەوە کە ئەو تیرۆریستانە ئیسلام نین و بە فەرهەنگی ئیسلام نامۆن، ئەو ڕاستیە لە نێو خۆیان و لە نێو ئەوروپیەکانیشدا بدرکێنن کە بەڵێ ئەوانەش موسڵمانن بەڵام ئەوانە بەرەیەکی دابڕاو و کەمایەتیەکی ئیسلامن بێنە مەیدان و هەڵوێستی توندو ڕاشکاوانەیان هەبێت و شەڕی ئەو باڵە تاریکانە بکەن لە ئیسلام ..

دەبێت موسڵمانی نێو ئەوروپا ئەوە بزانێت کە تیرۆریزم یەکەم زەبری خۆی لەوان و لە ئاییینەکەیان وەشاندووە، دەبێت زۆر بە توندی بەرامبەر ئەوە ڕاوەستنەوە کە ژمارەیەکی کەمی ڕەوەندی ئیسلامی، ئەوانەی کە زۆر بە کەمی لە ئاییینی ئیسلام شارەزان واتای ئیسلام بکەنە هاوواتای تیرۆرو سەربڕین، دەبێت ئەوە بزانن کە ئەرکی سەرشانیان ئەوەیە چی دی ماوە نەدەن هەموو موسڵمانێک بە چاوی ئەوە سەیربکرێت کە (بۆمبێکی گەڕۆکە ) و لە هەموو ئانوساتێکدا ئەگەری خۆتەقاندنەوەی هەیە...

بابەتێکی دیکەی نێو جیهانی ئیسلامی کە پێویستی بە گۆڕان هەیە ئەوەیە کە تیۆری پیلان ( نظرية مؤامرە ) وەک چوارچێوەیەکی شیکردنەوەو ڕاڤە کردن ئیتر مامەڵەی پێ نەکرێت، پێویستە هەمیشە بە گومان و دوودڵی و بێ بڕواوە سەیری هەموو پەیڤ و کردەوەیەکی بەرامبەر نەکرێت و هەنگاوەکانی بەرامبەر ( کە لێرەدا جیهانی خۆرئاوا دەگرێتەوە ) بە پیلان و موئامەرە لێک نەدرێتەوە.. تیۆری پیلان کە لە نێو جیهانی عەرەبیەوە

سەری هەڵداوەو خۆی گەیاندۆتە تەواوی جیهانی ئیسلامی تائێستا تیۆرێکی باوە بۆ شیکردنەوەو لێکدانەوەی بەرامبەر.. ئەم تیۆرەکە جۆرێکە لە خۆ بەهەڵە دا بردن و خۆ دزینەوە لە لێپرسراوی و هەمیشە ئۆباڵی فیاسکۆی خۆی دەخاتە سەر بەرامبەر.ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە ڕەوەندی ئیسلامی لە ئەوروپا ببێتە پێشەنگی چاکسازی لە دنیای ئیسلامی و لە ڕاڤەکردنی ئیسلامیدا، ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە خوێندنەوەیەکی مرۆڤانە، سڤیلانە بەدوور لە توندو تیژی و هاندان، بۆ ئیسلام بکرێت، خوێندنەوەیەک کە سورەتە کلاسیکیەکانی وەک سورەتی( مانگا و مێروولە و فیل و قاپ) لە گەڵ دنیای گلۆبالیزەیشن و کۆمۆنیکەیشن و مایکرۆسۆفت و ئەنتەرنێتدا بگونجێنێت.. خوێندنەوەیەک کە لە جیاتی سەربڕین و لەت و پەت کردنی مرۆڤەکان، نرخ و بەها بداتەوە بەو مرۆڤەی کە خەلیفەی خوداوەندە لەسەر زەوی.. خوێندنەوەیەک لە جیاتی ئەوەی هانی تەقاندنەوەی فڕۆکە و مترۆکان لە جیهانی خۆرئاوادا بدات، بتوانێت لە جیهانی خۆرهەڵاتدا هەمان ئەو تەکنەلۆژیایە بەرهەم بهێنرێت. ئەگەر لێرەدا قسە لەسەر نوێ کردنەوەی ئیسلام بێ بە جۆرێک کە بتوانێت لەگەڵ چەمکەکانی دیموکراسی و لیبراڵیزمدا مامەڵە بکات، ئەوە بێ گومان گەورەترین ئەرک و قورسایی دەکەوێتە سەر ڕەوەندی ئیسلامی چونکە زۆر بە ڕوونی پێویستە ئەوە بگوترێت ئەو ئیسلامەی کە لە ئەزهەر باسی دەکرێت، یان ئەو ئیسلامەی کە لە نەجەف و کەربەلا گوزارشی لێ دەکرێت، یاخود ئەو دیدگا ئیسلامیەی کە لە قەندەهارو مەکەو مەدینەو کشمیرەوە فتوای بۆ دەدرێت ئیسلامێکن نەك بە کۆمەڵگای ئیسلامی ئەوروپی و هۆڵاندی نامۆن بەڵکو جێگاشیان نابێتەوە..

ئەو ئیسلامەی کە لە هۆڵاندا پێویستە گوزارشی لێ بکرێت دەبێت ئیسلامێک بێت کە دەربڕی خواست و ئاوات و ئامانجەکانی ئەو هۆڵاندیە موسڵمانانە بێت کە لە هۆڵاندا لە دایک بوون و هۆڵاندین و هیچ پەیوەندیەکیان بە مەغرب و تورکیاو جەزائیرەوە نی یە. بەهەمان شێوە لە وڵاتانی دیکەی ئەوروپا پێویستە مۆدێلێک لە ئیسلامی ئەوروپی بێتە کایەوە کە ڕەهەندەکانی وەک ( مێژووی ڕەوەندەکە ، ژمارەیان، پاشخانی فەرهەنگی ..هتد ) لە بەرچاو بگرێت..

ڕەوەندی ئیسلامی لە هۆڵاندا پێویستی بە جۆرێکە لە ئیسلام کە توانای خۆ گونجاندنی هەبێت لەگەڵ کۆمەڵگای فرە کلتورو فرە ڕەگەز و ئایینی هۆڵاندا، ئیسلامێک کە تەنها مۆرکی مەغریب و تورکیای پێوە نەبێت بەڵکو

مۆرکێکی پێوە بێت کە بەڕاستی گوزارش لە تەواوی ئەو ئیسلامانە بکات کە لە بنەڕەتدا لە چەندین وڵاتانی ئیسلامی جیاوازەوە هاتوونەتە ئەم وڵاتەوە..

هەر وەک لە بەشەکانی پێشودا ئاماژەمان پێ دا ڕەوەندی ئیسلامی خاوەنی چەندین شوناسی ڕۆژهەڵاتی و ئاسیاوی و ئەفریقایی جیاوازە، هەروەها ئایینەکەشی بەهەمان شێوە تەنها یەک مۆرکی ئیسلامی پێوە نیە بەڵکو چەندین مۆرکی تورکی و مەغریبی و ئەندەنوسی پێوەیە کە بونەتە هۆی ئەوەی ئیسلام لە هۆڵاندا چەندین ڕەنگ و مۆرکی جیاوازی هەبێت، ئەمەش خۆی لە خۆیدا خاڵی لاوازی ڕەوەندی ئیسلامی و ئایینی ئیسلامیشە، هەر ئەم خاڵە لاوازەشە کە دەبێتە هۆی سەرلێشێواندنی ئەندامانی ڕەوەندەکە و سەرگەردان بوونیان لە نێوان هەڵبژاردنی کامە کلتوری زاڵ : ماڵەوە یان دەرەوە؟ مزگەوت یان کۆمەڵگای دەرەوەی مزگەوت، ئالێرەوەیە کە تاکی ڕەوەندی ئیسلامی دەکەوێتە نێوان بڕیارێکی زۆر سەختەوە بۆ هەڵبژاردنی یەکێک لەو دوو فەرهەنگە، خۆئەگەر ئیسلام لە هۆڵاندا یان لە ئەوروپا بیتوانیایە خۆی بکاتە شوناسێکی ناوەڕاست بۆ ئەندامانی ڕەوەندی ئیسلامی ئەوە دیاردەی نامۆ بوونی تاکی بێگانە و موسڵمان لە ئەوروپا زۆر کەمتر دەبوو لەو ئاستەی کە ئیستا هەیە، بە هەمان شێوەش کەمترین کەس لە تاکەکانی ڕەوەندی ئیسلامی دەکەوتنە نێو تۆڕی توندڕەوەکانەوە..

نوسەرێکی سیاسی عەرەبی بەناوی جەمال سولتان ئیسلامی سیاسی بە پاپۆڕێکی زۆر گەورە دەچوێنێت کە بارێکی زۆر گەورەی لە خۆ ناوەو سوتەمەنیەکی زۆر گەورەشی هەڵگرتووە و ژمارەیەکی یەکجار زۆریش ئەندازیار و کارمەند کاری لەسەر دەکەن، بەڵام ئەم پاپۆڕە هەرگیز بەندەرێک شک نابات و ئامانجێکی نیە بۆ لەنگەرگرتن!

## کێ گرەوەکە دەباتەوە؟

پێ دەچێت ئەم پرسیارە زیاتر لەو جۆرە پرسیارانە بن کە ئاراستەی فاڵگرەوەکان دەکرێن، چونکە نەک تەنهاخوێندنەوەی ئایندەی ڕووداوەکان بەڵکو دەرک پێکردنی پێشوەختیشی کارێکی زۆر ئاڵۆزە، بە ووتەی خودی ئەمەریکاییەکان ئەوان هەرگیز پێشبینی هەڵوەشاندن و لەت و پەت

بوونی یەکیەتی سۆڤیەتیان نەکردبوو، هەروەک چۆن دارمانی دیوارەکەی بەرلینیشیان لە خەیاڵدا نەبوو ...
بەڵام هەموو ئەمانە واتای ئەوە نیە کە چاودێری سیاسی و لێکۆڵەرەوان لێکدانەوەی خۆیان نەبێت بۆ ئاییندەی ئەو کێشانە با لێکدانەوەکانیش زۆر لە ڕاستیەوە نزیک نەبن بەڵام گرنگ ئەوەیە پشت ئەستوور بن بە بنەمای لۆژیکی بۆ لێکدانەوە..
ئەوەی من زۆر دەمێکە بە ووردی لە پاش هەموو کردەوەیەکی تیرۆریستی یاخود پاش دەستگیر کردنی هەر تۆڕێکی تیرۆریستی لە ئەوروپا و هۆڵاندا سەرنجی دەدەم بریتیە لە دووبارە بوونەوەی دوو خاڵی هاوبەش:
یەکەم / زۆربەی هەرە زۆری تیرۆریستان لە وانە پێکهاتوون کە هاوڵاتی هۆڵاندین یان ئەوروپین واتا لە ئەوروپا ( هۆڵاندا ) لە دایک بوون.
دووەم / ناوەندی تەمەنیان زۆر کەمەو هەمیشە لە نێوان ٢٠ – ٢٢ ساڵ تێپەڕ ناکات.
ئەم دوو خاڵە هاوبەشە پێویستی بە سەرنج و ڕاوەستان هەیە، چونکە ئەگەر لێکدانەوەکان گەیشتنە دیاری کردنی بنەڕەتی نەخۆشیەکە ئەوە ئیتر دەرمانەکە ئاسانە .
دەمەوێت بڵێم ئێستا دیاردەیەکی زۆر ئاشکرا بە دی دەکرێت، ئەو دیاردەیەو شیکردنەوەی هۆیەکانی دەبنە هۆی چارەسەرێکی زۆر باش هەر هیچ نەبێت بۆ کەم کردنەوەو بەرتەسک کردنەوەی ئەو ژینگە ناساغەی کە تیرۆریست وەک کرم هەڵدێنێت..
زۆر بەی هەرە زۆری ئەوانەی کە بەرەو ڕیزی تیرۆریستان هەنگاو دەنێن چ لە هۆڵاندا یان ئەوروپا بە ڕێژەیەکی بەرز ( نەوەی دووەمی ) ڕەوەندی ئیسلامین، نەوەی دووەم کێشەی زۆرە، ئەو کێشانەشمان لە بەشەکانی پێشوودا تاوتوێ کرد، چارەسەرکردنی ئەو کێشانە دەبێتە هۆی دوور خستنەوەی لاوەکان لە توند ڕەوەکان و لە تیرۆریستان..
دەبێت دەوڵەتی هوڵانداو لایەن بەر پرسەکان لە خۆیان بپرسن:
ئەو هەموو لاوانەی لەم وڵاتەدا لە دایک دەبن و هۆڵاندی زمانی دایکییانە بۆچی توشی نامۆیی دەبن، بۆ چی دەبنە نێچیرێکی زۆر ئاسان بۆ نەزان ترین مەلا و ئیمامی مزگەوتەکان؟
ئیسلامی سیاسی تەواوی توانای خۆی وەگەر خستووە بۆ ئەوەی لاوەکانی نەوەی دووەم توشی نامۆ بونێک بکات کە هەمیشە بە ئاسانی بکەونە داویەوە بۆیە پێویستە دەوڵەت لە سەر هێڵی بەرامبەر دژی ئەم هەنگاوە

پرۆگرامی خۆی هەبێت چونکە ئاییندەی بردنەوەی ئەو شەڕە بۆ ئەو لایەنەیە کە گەنجەکانی نەوەی دووەم دەباتەوە..

پێم وایە دەوڵەتی هۆڵاندا پێویستە لەمەو دووا زۆر بە ووردی چاو بە سیاسەتەکانی خۆیدا بخشێنێتەوە و هەڵەکان و کارە نەشیاوەکانی هەردوولایەنەکە بنە بڕ بکات..

پێویستە دەوڵەت بە رامبەر بە کردەوە ڕەگەز پەرستیەکانی دژ بە بێگانە توند تر بێت

خوێندنی باشتر و زۆرتر بۆ بێگانەکان ئامادە بکات چونکە بێگانەکان پێویستیان بە خوێندن و کاتی زیاتر هەیە تا بتوانن لە نێو کۆمەڵگادا نرخ و بەهای شیاویان هەبێت..

پێویستە ئاسانکاری زیاتر هەبێت بۆ دۆزینەوەی کار و سەرلەنوێ ئامادەکردنەوەی بێگانەکان بۆ نێو کۆمەڵگاو بۆ نێو گۆڕەپانی ژیان و کار کردن.. میدیاکان ئاگادار بکرێنەوە کە دەست لە بڵاو کردنەوەی هەندێک بابەت هەڵبگرن کە هۆڵاندیەکان دژی بێگانەکان هاندەدات..

لە بەرامبەر ئەم ئەرکانەی دەوڵەتدا هەنگاوی دیکەی جدی تر پێویستە بۆ سنور دانان بەرامبەر بە تاوان و فێڵ کردن لە یاساکان و پێشێل کردنی بەرژەوەندی گشتی کۆمەڵگا..

پێویستە دەوڵەت بەرامبەر بە تاوانباران لێبوردوو نەبێت و زۆر هەنگاوی جدی بنێت بۆ سنور دانان و ماوە نەدان بە دووبارە بوونەوەی.. ئەوانەی دەبنە مایەی هەڕەشە بۆ سەر ئاسایشی گشتی زۆر بە زوویی دەستگیر بکرێن و لە ئەگەری بوونی بەڵگەدا یەکسەر تاوانبار سنووورداش بکرێتەوە یاخود سزای زیندانی توند بدرێت..

مزگەوتەکان لە زۆربەی وڵاتە ئیسلامیەکاندا تەنها کاتی نوێژ کردن کراوەن بۆ ئەوەی نەکرێن بە خانەی تیرۆر و ئیسلامی سیاسی کەچی لە هۆڵاندا بە پێچەوانەوە ئەم مزگەوتانە ڕۆژانە و هەمیشە کراوەن و بوونەتە لانەو خانەی ئیسلامی سیاسی، تەنانەت زۆربەی مزگەوتەکان دوکان و کافتریاو چێشتخانەی تیادا کراوەتەوە کە پارەکەشی کەس نازانێت بۆچی بەکار دێت.

ئەو قوتابخانانەی کە لە نێو مزگەوتەکاندا مێشکی منداڵی ٤ ساڵ و ٦ ساڵی تیادا ئامادە دەکەن دژی هەر شتێک کە ئیسلام و ئیسلامی نەبێت؛ پێویستە دابخرێن، بەڵکو خودی مزگەوتەکانیش پێویستە کەم بکرێنەوە، دیاردەی بڵاوبوونەوەی مزگەوت بە شێوەیەکی بێ شومار بەرجەستەی بێ

سەرەو بەرەیی یاسا دەکات، لە هەر شارێکدا بە هێندی ژمارەی دانیشتوانەکەی پێویستە مزگەوت هەبێت.. وێرای ئەوەش قوتابخانە ئیسلامیەکان پێویستە بەردەوام و ڕۆژانە لەژێر ئامۆژگاری خوێندنی باڵای وڵاتدا بێت، نەک بۆ خۆی یاسای تایبەت بە خۆی چێ بکات..

ئەو کەسانەی کە گومانی ئەوەیان لێ دەکرێت هەڕەشەی ڕاستەو خۆن بۆ سەر ئاسایش یاخود ئەندام بن لە ڕێکخراوە ترۆریستیەکاندا پێوستە ڕاستەو خۆ دەستگیر بکرێن و بخرێنە ژێر لێپێچینەوە، هاوشێوەی موحەمەد بویری ماوە نەدرێت لەسەر جادەکاندا بۆ خۆی باندەکانی دروست کات و چ کاتێک پێ ی خۆشە زەبر لە کۆمەڵگا بدات.

هەر وەک چۆن حکومەتی بەریتانیا ڕاستەو خۆ پاش تەقینەوەکانی مانگی یۆلیۆ لیستەیەکی لە ناوی ئەو کەسانە دروست کرد کە مایەی هەڕەشەن بۆ وڵات و مافی نیشتەجێ بوون و پاسپۆرتی لێ سەندنەوە، ئاواش حکومەتی هۆڵاندا بۆ ئەوەی ڕێگە بگرێت لە تێوە گلانی تەواوی ڕەوەندی ئیسلامی لە کارە نەشیاوەکانی ئیسلامی سیاسی پێوستە هەنگاوی لەو جۆرە هەڵنێت.

هەر ئیمامێک بەڵگەی فەرمی نەداتە دەوڵەت و پەیمانی ئەوە نەدات کە دژایەتی ئاوێتە بوون ناکات و پەیوەندی بە ئیسلامی سیاسیەوە ناکات و ماوە نادات کە تۆڕەسیاسیەکان لە نێو مزگەوتدا تەشەنە بکەن و بە کردەوە لە هەموو ووتارەکانیدا ئاماژە بۆ ئەو خاڵانە نەکات، پێویستە لە سەر کار لاببرێت.. نابێت ماوە بدرێت بەو ئیمامانەی کە دەیانەوێت یاساکانی تۆرا بۆرا بخەنە نێو مێشکی ئامادە بوانەوە و وتار بدەن.. لە ئاکامدا پێویستە ئایین زیاتر بکرێتە کارێکی تاکە کەسی ( شەخسی ) و ڕێگە نەدرێت بە پارەی دەوڵەت جۆرێکی تایبەت لە ڕێبازی ئایینی بخرێتە مێشکی لاوانەوە..

پێویستە دەوڵەت و دامەزراوەکانی دەوڵەت جیاوازی لە نێوان سێ جۆر لە ئیسلام بکەن کە بریتین لە ( موسڵمان و ئیسلامی و تیرۆریست )، مرۆڤی موسڵمان هاوتای هەموو مرۆڤەکانی دیکە نابێت بە چاوێکی کەمتر یاخود بە کردەوەی ڕەگەزپەرستی مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت.. بەڵام ئیسلامی و تیرۆریست مافی دەوڵەتە کە چاوپۆشیان لێ نەکات..

هەر دەوڵەتێک زەمینەی خۆی هەیە بۆ بەڕێوە بردن و گرەو کردن لەسەر برنەوەی جەنگی دژ بە تیرۆر، بوونی ڕەوەندێکی زۆری ئیسلامی، هۆڵانداو وڵاتانی دیکەی ئەوروپا ناچار دەکات کە چاو بە سیاسەتەکانیاندا بخشێننەوە بەرامبەر بە ئیسلام و ئیسلامی سیاسی.. دەوڵەتە ئەوروپیەکان زۆر نزیکترن لە چاو ئەمەریکا بۆ ئەوەی گفت وگۆیەکی هێمنانە لەگەڵ

ڕەوەندی ئیسلامیدا ئەنجام بدەن، بەڵام ئەو دەوڵەتانەی کە لە مێژوی کۆن و هاوچەرخیاندا مۆنۆپۆلی ئیسلامیان هەبووە ئەوە شارەزایی یەکی باشتریان هەیە بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ ئەم کێشەیەدا..

( ستراتیژی دۆزینەوەی دۆست لە نێو دوژمنەکاندا ) هەنگاوێکە لە و هەنگاوانەی کە پێویستە بۆ ئاشت کردنەوەی میان ڕەوەکانی نێو ڕەوەندی ئیسلامی بنرێت..

بەشداری کردنی ئیسلامیەکان لە پرۆسەی سیاسیدا هێندەی هاوکاری کردن و گەورەکردن و زەبەلاح کردنی دکتاتۆرەکانی ڕۆژهەلات مەترسیدار نی یە ئەمە ئەو پرۆسەیە بوو کە بوو بە هۆی سەرەکی بەرهەم هینانی ڕێکخراوی ئەلقاعدە .. ئەو پرۆسەیەی کە بووە هۆی بەرەو دکتاتوریەت بردنی سیستەمەکانی ڕۆژهەڵات لە پێناو دەستکەوتنی نەوت و فرۆشتنی چەکدا پرۆسەیەکی سەرتاپا کارەسات بار بوو.. ئێستا کاتی ئەوە هاتوە پرۆسەیەکی دیکە بە ڕێوە بەرین پرۆسەیەک تیایدا ڕەوەندی ئیسلامی هەست بکات بەوەی کە ئەندامێکە لە نێو کۆمەڵگای هۆلاندە ئەندامێک کە نامۆ نییەو لە ماڵی خۆیدایە، ئەندامێک کە نرخی خۆیی و نرخی مرۆڤەکانی دیکە بزانێت.

## ووردبوونەوەیەک لە ئەقڵیەتی پیاوی سپی:

فلیمی تەڕەزان و کارتۆنی ڕۆبنسۆ کرۆسۆ کە بە منداڵی یەکێک بوو لە فلیم و فلیم کارتۆنە هەرە پەسەندەکانم، لەگەڵ نوسینی ئەم چەند دێڕەدا هاتنەوە یادم.. ئەو فریاد ڕەسە بەهێزەی کە هەمیشە لە کاتی پێویستدا بە شان و بازوویەکی یەکجار بەتواناوە کۆمەڵێک لە مرۆڤە ڕەشەکانی لە کۆمەڵێکی دیکەیان ڕزگار دەکرد ، خۆ ئەگەر ئەو تەرەزانە نەبوایە ئەوا خوێنێکی زۆر دەڕژا.. ڕۆبنسۆ کرۆسۆ وەک تەرەزان گوزارشی لە دەسەڵات و هێزی پیاوی سپی نەدەکرد، بەڵکو گوزارشی لە زیرەکی و داناییان دەکرد کە چۆن بە تەنها خۆی لە دورگەیەکی زۆر دووردا توانی چەندین داهێنانی مەزن بخولقێنێت..

پێ دەچێت ئەم ئەقڵە لە خۆڕا نەچەسپیتە نێو مێشکی مرۆڤەکانی خۆر ئاواوە ، لەو دەمەیدا کە گەلە کەشتی ئەوروپیەکان جیهانی ڕۆژهەلاتی

دەدۆزیەوەو یەک لە دووای یەک پاش داگیرکردنی ئاوەڕوتیان دەکردن، ئائەو دەمە داروین بە خۆیی و تیۆری ( بنەڕەتی چەشنەکان) چەندین زاراوەی نوێ ی بۆ پیاوی سپی هێنایە ئاراوە کە زۆری نەبرد لە پاش خۆی کرا بە تیۆری( داروینیزمی کۆمەڵایەتی - سوشیال داروینیزم ) ئەم تیۆرە وێرای ئەوەی باس لە جیاوازی چەشنەکان لە مرۆڤدا دەکات، زاڵ بوون و سالاربوونی هەندێکیشیان بەسەر هەندێکی دیکەیاندا بە ئاسایی ناو دەبات چونکە لەبەر هەمان هۆ جۆرێک یان کلاسێک لە مرۆڤ دانا ترن لە کلاس و جۆرێکی دیکە..

بێ گومان ئەمەش پاساوێکی گونجاو بوو ئەوکاتە کە مرۆڤی سپێ خۆی بە سالار ترو راقی تر بزانێت لە مرۆڤی ناسپی ( مرۆڤی ئەو دەڤەرانەی کە ئەو داگیری دەکردن ) ..

ئەمڕۆ لە عەقڵی باتنی ئەو تەرزە لە پیاوی سپیدا هەمان فاکتور و هەمان دیدگا بوونی هەیە، کۆچ بەر یاخود بێگانە تا ئەو کاتە دەموچاوێکی پڕ لە خەندەو ڕێزی پیاوی سپی لە بەردەمیدایە کە لاواز و بێ توانا بێت، کەسێک بێت کە بە زمانی خۆی لاواز بوونی خۆیی و سالاربوونی ئەوی سپی بە ڕەسمی ناسیبێت، کەسێک بێت کە بە ڕاستی پێویستی بە هاوکاری و یارمەتی و فریاد ڕەسی ئەوی سپی هەبێت.. لە پاش ئەو سنورەو هەر ئەوەندەی ئاشکرا بوو کە تۆی کۆچ بەر ئەو پەیمانە بە ڕەسمی ناناسیت و دەتەوێت هاوتای ئەو بیت لەسەر کارو لە خوێندن و لە دامەزراوە کۆمەڵایەتیەکاندا، ئەوە ئیتر بارت لە لێژیدا دەبێت، کەم نین ئەو هەموو بێگانە خاوەن دبلۆمایانەی کە دەچنە سەنتەرێکی کارپێدان و بڕوانامەی ماستەرو زانکۆ دەردێنن و داوای کار دەکەن یەکسەر زۆر بە ڕوویەکی خۆش و ناسکەوە کچە قژ زەردی فەرمانبەر پێیان دەڵێت ( کاری پاکرنەوەو سڕینەوە دەکەیت؟).

لە ڕاستیدا چەردەیەکی زۆری نامۆ بوونی تاکی ڕۆژهەڵاتی و بێگانە و تەنانەت ئەندامانی ڕەوەندی ئیسلامی دەگەڕێتەوە بۆ ئەم ئەقڵیەتە دووالیزمە، ولاتی مرۆڤە سپیەکان و ولاتی مرۆڤە ڕەشەکان، فەرهەنگی مرۆڤە سپیەکان و فەرهەنگی مرۆڤە ڕەشەکان...

ئەو دەمەی کە ئەو دوو ئەقڵە بەیەک دەگەنەوە زۆر شت گۆڕاوە و وەک خۆی نەماوە، کات و شوێن یەکێکن لە گرنگترین ئەو ڕەگەزانەن کە گۆڕاون.. ئێستا مرۆڤی سپی لە ولاتی خۆیەتی و مرۆڤی ڕەش بە پێ ی خۆی هانا بۆ ئەم کۆنە دوژمنەی خۆی دێنیت... مرۆڤی سپی کاتی خۆی شەڕی مرۆڤە

ڕەشەکانی دۆڕاندو بۆ هەوارگەی خۆی پاشە کشەی کرد، بەڵام پاش چی گەڕایەوە؟ پاش ئەوەی کوللە ئاسا نەک وڵاتی مرۆڤە ڕەشەکانی ڕوت کردوە و دایماڵی بەڵکو چەندین میللەتی وەک کووردی قەرج ئاسا بەسەر چەندین وڵاتدا دابەش کردو بە ڕاستەو خەت کێش چەندین دەوڵەتیشی دروست کرد و چەندین مەینەتیی وەک هۆتۆ و توتسیشی لە پاش خۆی بە جێ هێشت...

هۆڵانداش بە دەر نەبوو لەم مامەڵە گڵاوەدا... لەم دووری دوورەوە هەڵی کوتایە سەر سوێنام و دورگە ئەنتالیەکان و ئەندونوسیاو داگیری کردن، کەچی ئێستا ئەو ئەندونوسیە بەد بەختانەی کە زۆربەیان تەنها لەسەر نەخشە ئەندونوسیا دەبینن هەر بە بێگانە دەژمێردرێن.. ئەو مۆلۆکە بەدبەختانەی کە لە سوپای هۆڵاندادا کاریان بۆ هۆڵاندا دەکرد، لەگەڵ ئەوەی جەنگ تەواو بوو، لەگەڵ ئەوەی خۆری ئیمپریالیزمی هۆڵاندی لە ناوچەکەدا ڕووی لە ئاوا بوون کرد، ئەم مرۆڤە دڵسۆزانەی کە ئەمڕۆ نەوەکانیان خۆیان بە ( بەچکەی جاش ) دەزانن مریشک ئاسا لە ئۆردوگاو کەمپەکان ئاخنران..

هۆڵاندایەک کە لە ڕێگای بازرگانیەوە و بە ئاگاداری دەوڵەت و دەزگا هەواڵگریەکەی بازگانەکانی وەک ( فرانس ڤان ئانرات ) ی بەردابووە گیانی گەلی کوورد و لە ڕێگای فرۆشتنی چەکی کیمایویەوە هەزاران مرۆڤی کوورد مشک ئاسا گیانیان لێ دەستێنرا... هۆڵاندایەک کە پاش جەنگی دووەمی جیهانی دەڤەرێکی برسی و هەژارو کاول بوو، هۆڵاندیەکان خۆیان بە سەدان هەزاریان بەرەو ئوستورالیاو کەنداو نیوزیلاند کۆچیان کردو لە سەر داوای حکومەتی هۆڵاندا خۆی دەیان هەزار کرێکاری داماوی تورک و مەغریبی و یوگوسلاڤی ڕویان لەم وڵاتە کردو بە ناونیشانی ( کرێکارە میوانەکان )ە هێزو بازوی ئەوان لە سەرلەنوێ دروست کردنەوەی ئەم وڵاتەدا ڕۆلی گرنگی بینی، ئائەم کرێکارە ماندوانە ئەمڕۆ نەوەکانیان لەم وڵاتەدا جگە لەوەی هەرگیز بە هۆڵاندی قبوڵ ناکرێن هەزارەها ناوو ناتۆرکەی وەک (نارەسەنەکان و بێگانەکان و غەریبەکان) یان لێ دەنرێت..

بەڵێ وڵاتانی دادۆشراو ئەو وڵاتانەی کە بەهەر هۆیەکی نامرۆڤانەی دنیای خۆرئاوا خانەو لانەیان لێ تێک دەدرێت، ئەو وڵاتانەی کە ژینگەکەشیان بە لوغمی ئەورووپی و چەکی یورانیۆم و لاقە کراوە کاتێ مرۆڤەکانیان دەگەنە کەناری ئارامی وڵاتی مرۆڤە سپیەکان، کە ناچار دەبنەوە پەنا بۆ تەرەزان بەرنەوە، کە دێن و داوای مافی پەنابەری خۆیان دەکەن، کە ناوی لوغمی پاڵمێرای ئیتالی و فرۆکەی میراجی فەرەنسی

وگولله تۆپی نەمساوی و چەکی کیماوی بۆن پرتەقالی ئەڵمانی و بۆن سێوی هۆڵاندی دەکەن، نەک تەنها پێیان دەڵێن بۆچی هاتوون، بەڵکو بێ ڕەحمانە چوار ساڵ و پێنج ساڵ و حەوت ساڵ لە نێو ئۆردوگاکاندا باڵبەستیان دەکەن و کاتێکیش کە هەندێکیان ڕەوانە دەکەنەوە دیسان مریشک ئاسا لە قەفەزیان دەنێن و ڕەوانەی وڵاتی مرۆڤە ڕەشەکانیان دەکەنەوە ( با وڵاتەکەش هەمان ئەو وڵاتە نەبێت کە پەنابەری لێوە هاتووە -لە هۆڵاندا چەندین جار پەنابەر بە هەڵە بۆ وڵاتی دیکە سنور داش کراوە)، تۆ بڵێ ی زۆر بەی هەرە زۆرمان لە گەڵ یەکەم ڕۆژی تاراوگەدا یەکسەر لە خۆی نەپرسێت:

بۆچی ئەم وڵاتانە ئەوەندە جوانن؟ بۆ ئەوەندە پاکن؟ بۆ ئەوەندە پێشکەوتون؟

مەخابن من خۆم ئەوەم بەسەردا هات و لە وەڵامدا زۆر بە دڵڕەقیەوە گوتم:

چونکە وڵاتی ئێمە ناشرێنە ، چونکە وڵاتی ئێمە پیسە، چونەک وڵاتی ئێمە کاولە...

بە جۆرێکی دیکە بڵێم مرۆڤە ڕەشە خۆ بە لاوازو کەم زانەکەی ناخم پێ ی گوتم چونکە ئەمان وڵاتی ئێمەیان کاول و ناشرین و پیس کرد..

دەبێت چی وا لە کەسێکی وەک ئەبو حەمزەی میسری بکات کە هەڵگری ڕەگەزنامەی( ئینگلیز) شە لە وەڵامی پرسیاری ئەوەی کە( ئەگەر ئەم دەوڵەتە ئەوروپیانە بە کافرو گڵاو دەزانێت بۆ چی تیاید دەژی) بڵێت (ئێمە وەک ئاودەست خانە سەیری ئەم وڵاتانە دەکەین دەستی خۆمان بە ئاودەگەیەنین و دەڕۆین ) .

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە پیاوی سپی دان بە هەڵەکانی خۆیدا بنێ و لە ڕووی ئەخلاقیەوە بە ئەرکەکانی سەرشانی خۆی هەستێت دەنا گفت وگۆ لە نێوان هەردوولادا وەک گفت و گۆی ئەو دوو کەڕەی لێ دێت کە مامۆستا عەلادین سوجادی نەمر لە ڕشتەی مرواریدا باسیان دەکات و یەکێکان بۆخچەیەکی بە دەستەوەیە و ئەوی دی پرسیاری لێ دەکات:

- ئەوە ئەڵێ ی بۆ حەمام دەچیت؟
- نەوەڵا بۆ حەمام دەچم
- دەباشە وەم زانی بۆ حەمام دەچیت.

تەواو

پاشکۆ:

ئەم کتێبەم تەواو کردبوو کاتێک کۆمەڵێک روداوی زۆر کت و پڕ ئەوروپای گرتەوە، لەگەڵ روداوەکاندا بەردەوام نوسین و ریپۆرتاژم لە ماڵپەڕەکانی ئەنتەرنێتدا بڵاو دەکردەوە، ئەو نوسینانەی کە تایبەتن بەهەمان روداو پێم خۆش بوو وەک تەواو کاریەک بۆ ئەم کتێبە بیکەمە پاشکۆیەک و بیخەمە بەردەم خوێنەری هێژا.

تێبینی / هەموو ئەم نوسینانە لە ماڵپەرەکانی وەک پوک میدیا و پوک ئۆن لاین و دەنگەکان بڵاو کراونەتەوە

•

**ترۆر و جەژنی رەمەزان لە هۆڵاندا**

چەندین لایەنی سیاسی و کۆمەڵایەتی و کلتوری لە هۆڵاندا خۆیان بۆ ئەوە ساز داوە کە رۆژی چوارشەممە واتە ٢ی ئەم مانگە ( نۆڤەمبەر) یادی ئەو کردەوە ترۆستیە بکەنەوە کە بە سەپتەمبەری هۆڵاندا ناسراوە...

بەرە بەیانی ئەو رۆژە واتەساڵێک لەمەو بەر کەسێکی هۆڵاندی بە رەگەز مەغریبی بەناوی موحەمەد بویری دەرهێنەری سینەمایی هۆڵاندی ( تەیۆ

ڤان خۆخ ١٩٥٧-٢٠٠٤ ) ی تیرۆر کرد، ئەم ترۆرستە وێرای ئەوەی کە پێنج فیشەکی نا بە جەستەی ئەو دەرهێنەرەوە بە چەقۆ کەوتە هەڵهێنانەوەی ملی و لە پاشاندا نامەیەکی هەڕەشە ئامێزی بۆ چەند کەسایەتیەکی هۆڵاندی هەر بە چەقۆکە بەسەر سنگی ( ڤان خۆخ ) ەوە داکوتی...

هۆکاری کوشتنی ئەم دەرهێنەرە لە لایەن ئەو لاوە تەمەن ٢٦ ساڵە ئەوە بوو کە گویا ئەو دەرهێنەرە لە یەکێک لە فلیمەکانیدا بە ناوی ( مل کەچی ) سوکایەتی بە ئاینی ئیسلام و کتێبی پیرۆزی ئیسلام ( قورئان ) کردووە. ڤان خۆخ تەنها لەو فلیمەدا ئەو کارەی ئەنجام نەدابوو بەڵکو لە ماڵپەرەکەی خۆشیدا تەشەرلێدان و تەنانەت جنێو دانیشی بە ئیسلام کردبووە پیشە.

بکوژی ڤان خۆخ پاش ئەوەی کارەکەی خۆی ئەنجام دا، لە لایەن پۆلیسەوە دەستگیرکراو هەر زوو ئاشکرا بوو کە ئەم ترۆرستە ئەندامی گروپێکی گەورەترە کە هەمان ئایدۆلۆژیای رێکخراوی ئەلقاعیدەی هەیە. ئەندامانی تۆڕەکەشی جگە لە ئەمیری رۆحییان کە مەلایەکی خەڵکی ( سوریا ) بوو دەستگیر کران و ژمارەیان گەیشتە ١٥ کە هەروەک لە پاشاندا ئاشکرا بوون بە نیاز بوون کە کردەوەی ترۆرستی گەورە لە هولاندا ئەنجام بدەن..

ئەم کردەوە ترۆرستیە هۆڵاندیەکانی هەژاند و موسڵمانانی هۆڵانداشی خستە بەردەم هەڵوێستێکی زۆر نالەبارەوە، چونکە وێرای ئەوەی کە موحەمەد بویری ناسراو بە موحەمەد بەی لەبەر هۆکاری ئایننی ئەم کارەی ئەنجام دا ، پرسی ئاوێتە بوون و تێکەڵاو بوونی موسڵمانانی هۆڵاندا لەگەڵ کۆمەڵگای هۆڵاندیدا خستە گومانەوە، چونکە لە راستیدا موحەمەد نەک هەرگیز لە مەغریب نەژیاوە بەڵکو جگە لە رەنگ و رواڵەتی بە تەواوی هۆڵاندی بوو، کەئەمەش خۆی لە خۆیدا بەر لەوەی فیاسکۆ بێت بۆ موسڵمانان کارەساتە بۆ کۆمەڵگای هۆڵاندا کە لاوێکی ئاوا ( هۆڵاندی ) پەنا بۆ کارێکی ئاوا بەرێت و ئەو هەموو ساڵەی پەروەردە کردنی لە ناو کۆمەڵگای هۆڵاندا نەیتوانیبێت فێری ئەوەی بکات کە هەموو کێشەکان و ململانێکانی نێو کۆمەڵگا دەبێت بە گفت و گۆ و لێداوان چارەسەر بکرێن!

تەیۆ ڤان خۆخ لە رەچەڵەکدا لە هەمان خێزانی فنست ڤان خۆخ ( ١٨٥٣-١٨٩٠ ) ی هونەرمەندی بەناوبانگی شێوەکارە کە دەگوترێت گوێچکەی خۆی بڕیوە و پێشەکەشی خۆشەویستەکەی کردووە و پاشان لە تەمەنی ٣٧ ساڵیدا خۆی کوشت.

بەڵام ئامۆزاکەی پاش پتر لە سەد ساڵ بە دەستی ئەندامێکی ئیسلامی سیاسی نەک گوێچکەی بەڵکو سەری دەبڕرێت.

نیشانەی جیاکەرەوە لە نێوان ئەم دوو رووداوەدا ئەوەیە کە یەکەمیان خۆی کوشت بە خواستی خۆی بەڵام دووەمیان بەدەر لە خواستی خۆی لە سەردەمێکدا دەکوژرێت کە مرۆڤ لەگەڵ سەد ساڵی پێشو زۆری جیاوازە.
رەنگە موحەمەد بویری بەم کارەی هەوڵی دابێت مێژو وەیاد بخاتەوە بەڵام لە دەرگایەکی دیکەوە ئاوەڵای کات ئەویش ئەنجام دانی گوێ بڕینی سیاسی بێت لە لایەن گروپێکی نامۆ بە کۆمەڵگای ئەوروپی...
رێکەوت هەندێک جار کاری سەمەرە بەسەر ژیاندا دەسەپێنێت! لە لایەک هۆڵاندیەکان خۆیان بۆ یادێکی زۆر خەمناک ئامادە دەکەن و ماتەم دەگێڕن، لە لایەکی دیکە موسڵمانەکانی هۆڵاندا لە هەمان رۆژدا خۆیان بۆ جەژنی رەمەزان ئامادە دەکەن و شیرینی و شایی و لۆغان دەگێڕن...
هۆڵاندیەکان لە زمانی رۆژنامەکانەوە لە خۆیان دەپرسن داخۆ موسڵمانانی هۆڵاندا بەشێکن لە کۆمەڵگای هۆڵاندا یان بە پێچەوانەوە ؟ چونکە ناکرێت بەشێکی کۆمەڵگا ئاهەنگ بگێڕێت و بەشێکی دیکەش ماتەم... بە هەرشێوەک وەڵامی ئەم پرسیارە بدرێتەوە سەیر نی یە بەڵام ئەوەی کە بۆ هەموو لایەک روون و ئاشکرایە ئەوەیە کە لە پاش ئەم کارە ترۆستیەوە ئیتر کۆمەڵگای هۆڵاندا بۆتە دوو بەرەوە، بەرەیەک ئەوانەن کە هۆڵاندین و خۆیان بە خاوەنی وڵات دەزانن بەرەکەی دیکەش ئەوانەن کە هەر هۆڵاندین بەڵام خۆیان بە خاوەنی وڵات نازانن و بە کلتورەکەشی نامۆن بۆیە رۆژ لە دوای رۆژ زیاتر پاشە کشە دەکەن بۆ نێو چوار دیواری مزگەوتەکانیان و تەنها وەک تەماشاکەر سەیری رووداوەکانی وڵاتەکەیان دەکەن ئەو وڵاتەی کە هەمیشە بە ( ئالەختون ) واتە هۆڵاندی نارەسەن ناویان دەبات...

## هۆڵاندا دیسان دەکەوێتەوە بەر هەڕەشەی ترۆر

حەوت ئەندامی گروپێکی ترۆرستی ئیسلامی کە گومانی ئەوەیان لێدەکرێت خۆیان بۆ هێرشکردنە سەر کەسایەتیە سیاسیەکانی وڵات و دامەزراوە حکومیەکان ئامادە کردبێت ، دەستگیر کران.
هێزە تایبەتەکانی پۆلیسی هۆڵاندا سەرلە بەیانی رۆژی هەینی ١٤ی ئۆکتۆبەری ٢٠٠٥ لە شارەکانی ئەمستەردام و دەنهاخ و ئەڵمیرە هەڵیان

کوتایە سەر ئەو ئامانجانەو بە کەمترین روو بە روو بوونەوە ،هەموو گومان لێکراوەکانـاین دەستگیر کـرد، هـەنـدێک سـەرچـاوەی هـەواڵ ئامـاژە بـە تەقاندنی گولەو نارنجۆک دەدەن و هەندێک سەرچاوەی دیکەش نکوڵی لێ دەکەن، بەڵام هاوڵاتیانی نیشتەجێ ی نزیک ناوچەکە جەختیان لەسەر ئەوە کردەوە کە چەند فیشەکێک تەقابێت...

هاو کات لەگەڵ ئەنجام دانی ئەم کردەوەیەدا پۆلیسی هۆڵاندا تەواوی ئەو شـەقامانـەی داخـست کـە بـەرەو باڵـەخانـەی پارلـەمـان دەچـن، هاوکـات باڵـەخانـەکـانی وەک ( دەزگـای هـەواڵگـری – A.I.V.D) و وەزارەتـی داد و ناوخۆش کەوتنە ژێر چاودێری توندی پۆلیسەوە...

شەش لە دەستگیرکراوەکان پیاون و ناوەندی تەمەنیان لە نێوان ( ١٨-٣٠ ) ساڵ دەبێت، یـەکێکیـشیان ئـافرەتـە و تـەمـەنـی ٢٤ سـاڵە، بـە پـێ ی زانیاریەکانی دەزگای هەواڵگری هۆڵاندا سەمیرعەزوز ( سەمیر.ئا ) سەرقاڵی کڕین و پەیداکردنی چەکی ئۆتۆماتیکی و تەقەمەنی بووە تا لە هێرشەکانی ئەم گروپەدا بەکاریان بهێنن. ناوبراو کە ئەندامێکی گرپی ترۆرستی ( شانەی پایتـەخت )بـوو، یـەکـەم جـار سـاڵی ٢٠٠٣ دەستگیرکراو لـە نـاو ماڵـەکـەیدا نـەخـشەی زۆر وردی فرۆکـەخانـەی ئـەمستەردام و باڵـەخانـەی دەزگـای هـەواڵگـری و بنکـەی ئـەتـۆمی بۆرسیلا دۆزرانـەوە، مـانگی ئـاپرلی رابوردوو لەبەر نەبوونی بەڵگەی تەواو ئازاد کرا.

پـێ دەچێت ئـەم لاوە کـە بـە رەچـەڵـەک مـەغریبـی یـە لـە مزگـەوتـی (ئەلتەوحید) لە ئەمستەردام مێشکی داشۆرابێت و کرابێتـە ئـەندامێکی ئـەو گروپە کە لە رێکخراوی ئەلقاعیدەوە نزیکە، هەروەک چۆن موحەمـەد بـویری بکوژی دەرهێنـەری سینـەمـایی ( تـەیـۆ ڤـان خـۆخ ) کـە ڕۆژی ٢ی نۆڤـەمبـەری ٢٠٠٤ لـە ئـەمستەردام ئـەو کـارەی ئـەنجـام دا، بـە هـەمـان شێوە سـەردانـی هەمان مزگەوتی دەکرد. مزگەوتی ناوبراو زۆر دەمێکە بۆتە جێگەی پرسیاری ناوەندەکانی دەسەڵات لەم وڵاتەدا.

سـەرۆکـی رۆحـی ئـەم گروپـە کـە ناسراوە بـە شێخ ئـەبو خالـد ،خـەڵکـی سوریایە راستەو خۆ پاش روودانی ئەم کارە لە هۆڵاندا نەماو بێ سـەروشوێن بوو، بە پێ زانیاریەکان ئێستا ئەم کەسە لە سوریا زیندانی کراوە.

راستـەو خـۆ پـاش روداوەکـانی سـێپتەمبـەر، هۆڵانـدا چـالاکی و هـەڵسو کـەوتـەکـانی ئیسلامی سیاسـی وەک هـەڕەشـەیـەکـی پلـە یـەک نـاو دەبـات و وەزیری ناوخۆکەشی (رامکەس ) پاش هێرشەکانی مانگی گەلاوێژی لـەنـدەن

رایگەیاند کە لە هۆلاندا نزیکەی ٢٠ گروپی ئیسلامی ئامادەن کردەوەی ترۆرستی ئەنجام بدەن...
ژمارەی ئەندامانی رەوەندی ئیسلامی ( جالیەی ئیسلامی ) نزیکەی یەک ملیۆن دەبێت و ژمارەی مزگەوتەکانیش بە هەمان شێوە نزیکەی ٥٠٠ مزگەوت دەبێت کە ٥١ دەنەیان لە ئەمستەردامە.

## بەر لە ئەنفلۆنزای باڵندە پاریس سوتا !

ئەو کەسەی لەم رۆژانەدا روو لە پاریس دەکات شەقامی رازاوەی( شازئەلیزێ) و بورجی گەردن بەرزی ( ئەیفڵ تاوەر ) بە دەمیەوە پێ ناکەنێت بەڵکو دوکەڵی رەشی ئۆتۆمبیل و تایە سوتاو وەڕسی دەکات...
گەڕەکی ٩٣ لە کەناری باکوری شاری پاریس کە ناسراوە بە ( سانت دینی ) گەڕەکێکە کە زیاتر رەوەندی ئیسلامی بە تایبەت ( مەغریبی و جەزائری) تیادا نیشتەجێ بووە، لەم گەڕەکەوە رۆژی ٢٧ ی ئۆکتوبەری پێشو راپەڕین و کاری توندو تیژی سەریان هەڵداو پاشان بڵێسە بە چەندین شاری دیکەی فەرەنسادا بڵاو بۆوە...
لە ئاکامی ئەم کارانەدا سەدان کەس دەستگیرکراون و بە ملوێنەها یۆرۆش زیان بە ئابوری وڵات گەیشتووە، بەڵام لە تەواوی ئەوروپادا ئەم روداوانە تەنها وەک کاری توندو تیژی سەیر ناکرێن بەڵکو تاڕادەیەک سیمای راپەڕینی پێوە دیارە.. چاودێرانی سیاسی لە خۆیان دەپرسن کە داخۆ کارێک ئەگەر بێ ئامانج و گێرەشێوێن بێت لە وڵاتێکی وەک فەرەنسا بۆ چی هێندە درێژە دەکێشێت و بۆ چەندین شاری دیکە تەشەنە دەکات ؟
ئەوەی لە پاریس روو دەدات ئەگەری هەیە لە ئەمستەردام و بەرلین و چەندین شاری دیکەی گەورەی ئەوروپا روو بدات چونکە لە زۆربەی ئەو شارانەدا کۆچ بەران لەبەر هەژاریی و پەراوێزە بوون و بێ کاری تەنها لەو شوینانەدا دەتوانن ژیان بەسەر بەرن، شوێنانێک کە حکومەت تەنها لە سیمای پۆلیسێکی چارە گرانی شەڕانیدا بە دیار دەکەوێت...
ئەمڕۆ لەتەواوی ئەوروپادا بە تایبەت پاش روداوەکانی ١١ی سێپتەمبەر دوو دیاردەی زۆر مەترسیدار باڵی بەسەر کۆمەڵگای ئەوروپیدا کێشاوە:

### یەکەم – دیاردەی رەگەزپەرستی و رق لە بێگانە.

ئەوەی ئەمڕۆ لە فەرەنسادا روودەدات تەنها کاری گێرە شێوێن نییە بەڵکو ئەمە پەرچە کرداری دەیان هەزار گەنج و هەرزەکارە کە لە لایەن حکومەتە ئەوروپییەکانەوە نەك تەنها پەراوێز کراون بەڵکو بە چاوی هاوڵاتی پلە یەک تەماشا ناکرێن.
رێژەی بێکاری لە نێوان لاوانی ئەم رەوەندەدا هێندە بەرزە کە هەندێک جار ٥٠% تێپەڕ دەکات، کەچی ئەو رێژەیە لە خراپترین هەل ومەرجدا لە نێو گەنجە ئەوروپییە قژ زەردەکاندا ١٠% تێ پەر ناکات، حکومەتی فەرەنساو زۆربەی حکومەتە ئەوروپییەکان تەنانەت خودی پارلەمانی ئەوروپاش دان بەوەدا دەنێت کە لە زۆربەی وڵاتانی ئەندامی یەکیەتی ئەوروپا لە نێوان هاوڵاتیانی ئەوروپی و ئەوانەی کە بە بنەچە ئەوروپی نین ( نەوەی کۆچ بەران ) جیاوازی دەکرێت و هەلی یەکسان بۆ دەستکەوتنی کار نەڕەخساوە!
ئەمڕۆ لە زۆربەی کارگاکان و شوێنە خزمەتگوزاریەکانی ئەوروپادا کارەکان دابەش کراون، کاری زۆر قورس بۆ بێگانەکان و کاری پشت کۆمپیتەرو ئاسانیش بۆ ئەوروپییەکان، تەنانەت هەلی خوێندنیش لەبەردەم بێگانەکاندا گونجاو
نی یە، بەڵکو لەبەر هۆیەکانی زمان و بەراورد کردنی دیپلۆماو بەیەک چاو سەیر نەکردن زۆر جار بێگانەی کارامەو خاوەن شارەزایی بەرز ناچارکراوە کە بە خۆرایی کار بکات یان کارێکی زۆر نزمتر لە ئاستی خۆی بکات...

### دووەم – دیاردەی ئیسلامۆ فۆبیا ( ترس لە ئیسلام ).

هێرشەکانی مانهاتن و تەقینەوەکانی مەدرید و لەندەن و کوشتنی ڤان خۆخ لە هۆڵاندا هەموو ئەو دیاردانەی کە ترۆرستی ئیسلامی ئەنجامیان دەدات دەبنە مارو لە گەردنی هەموو بێگانەکان (با ئیسلامیش نەبن) دەئاڵێت! ئەمڕۆ هەموو کەسێکی قژ رەش لە ئەوروپا عەرەبێکی ترۆرستی ئیسلامیەو بە چاوی گومانەوە سەیر دەکرێت، ئەمڕۆ ئیتر هەموو موسڵمانێک یاخود بێگانەیەک لە ئەوروپا بۆمبێکی گەڕۆکەو لە ئان و ساتدا دەتەقێتەوە! لەبەر ئەوە مرۆڤی بێگانە لە ئەوروپا هەر لە بەردەرگایماڵی

خۆیەوە تا دەگاتە سەرکار روبەروی کاری نەشیاو دەبێتەوە ( ئەمەش نە ولاتەوە تاولاتێکی دیکە جیاوازە )، هەر لە دراو ـێ ک ـیەوە تا خاوەن کارەکەی لێ ی بە گومانن!

وێرای ئەم دوو دیاردە زەقە ـ ـندین گرفتی کلتوریش هەیە کە مەودای تێکەڵاو بوون و ئاوێتە بوونی ئەو کۆچ بەرانە دوورتر دەکاتەوە. میدیاکانیش بە شێوەیەکی خراپ بەشدار دەبن لە بەخشینی وێنەیەکی دزێو بە کۆچ بەران و مزگەوتەکانیش بەرامبەر بەمە کەمتەر خەم نەبوون لە بەخشینی وێنەیەکی دزێوتر بە ئەوروپییەکان!

روداوەکانی پاریس یەکیەتی ئەوروپای خستە بەردەم جۆرێکی تازە لە ئەنفلۆنزا بەڵام ئەمەجۆرە تازەیە لە ئەنفلۆنزا نە بە دەرمان و نە بە لەناوبردنی مریشک و باڵندە کۆتایی نایەت ئەم ئەنفلۆنزایە چارەسەرێکی تایبەتی هەیە کە رۆژنامەی

( تراو ) ی هۆڵاندی لە زاری مامۆستای ئابوری سیاسی ئەمەریکی (فرانسیس فۆکۆ یاما ) ئاماژەی پێ داوە ئەویش بە هەنگاو نان بۆ تێکەڵ کردنی ملوێنەها گەنجی موسڵمانی ئەوروپی لەگەڵ کۆمەڵگا ئەوروپییەکان بەبێ ئەوەی لەبەرامبەر ئەمەدا رق و کینەی راستە توند رەوەکانی ئەوروپاش بهەژێنرێت، فۆکۆیاما بانگەشەی شوناسێکی نەتەوەیی تازە دەکات ، شوناسێکی ئەوروپی ئەوتۆ کە جێگەی هەموو نەتەوە جیاوازەکانی ئەوروپای تیادا بێتەوە نەك شوناسێک بێت بۆ پەراوێز کردنی کۆچ بەران و نەتەوەکانی دیکە بەکار بێت!

## لە فەلوجەوە بۆ پاریس...ئەو دەمەی شێر دەبێتە مەسخەرە!

فەرەنسا کە ناسراوە بە بەرهەم هێنانی چەندین جۆری مەکیاژ و بەرام و هۆیەکانی جوانکاری، ئەمرۆ بەو هەموو شوشە عەترو بۆنەشەوە ناتوانێت تۆزێک رووی خۆی ماکیاژ بکات، بە هۆی سیاسەتە کۆن و تازەکانیەوە، بەهۆی خەیاڵ پڵاوی خۆیەوە بە دۆستایەتی کردنی عارەب و دنیای ئیسلامی یەوە ئەمرۆ سحرەکە لە خۆی هەڵگەراوەتەوە و بەدەست ئەو ملوێنەها موسڵمان و عارەبانەوە گیری خواردووە کە تەڕو وشک پێکەوە دەسوتێنن!

چەرخی زەمانەیەو دەگەڕێت! فەرەنسایەک کە خۆی کربووە دەم راستی هەژارو بێ مافەکانی دارفور و راشکاوانە داوای لە حکومەتی سودان دەکرد کە چی دی دانشتوانی هەرێمی دارفور پەراوێز نەکات، کە چی لەپڕ ملوێنەها مرۆڤی فەرەنسی ( با بە رەچەڵەکیش بێگانە بن ) لە تاو هەژاری و پەراوێز بوون رادەپەڕن و شەوانە سەدان ئوتومبیل و چەندین شوێنی نیشتەجێ بوون ئاگر تێ بەر دەدەن...

فەرەنسایەک کە بە دەوڵەتێکی نەک گەورەی ئەوروپا بەڵکو دنیاش دەژمێردرێت و مافی ( فیتۆ ) ی هەیە بەرامبەر بە بڕیارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان. خۆی کردبووە دەم راستی کێشەی سوریاو لوبنان و لە هەموار کردنی بڕیارەکانی دژ بە سوریا و لە بەرژەوەندی لوبنان گەورەترین رۆلی هەبوو کە چی ئێستا خۆی بەرامبەر بە سەرکێشی شورشی برسیەکان دەستەوەستان بۆتەوە!

ئەو فەرەنسا مەزنە ئەمرۆ لە زاری رۆژنامەکانی ئەمەریکاوە شەقامەکانی وەک شەقامەکانی بەغداو فەلوجە بەراورد دەکرێت و هاوتای شارە سونە نشینەکانی عێراق یاسای ئیمێرجەنسی

( تەواری ) تیایدا بەڕێوە دەبرێت...

فەرەنسایەک کە جاران چەکی ئەتۆمی و ریاکتور(مەفاعل )ەکانی دەفرۆشت بە عێراق و داوای لە ئێران دەکرد بەرهەمی ئەو چەکە رابگرێت، کە چی ئەمرۆ ئێران لە زاری وتە بێژی فەرمی خۆیەوە نیگەرانی خۆی دەردەبڕێ بۆ بارودۆخی موسڵمانە راپەریوەکانی فەرەنسا!

تورکیا نیگەرانەو وڵاتانی دیکەش داوا لە هاوڵاتیانیان دەکەن کە لە کاتی گەشتیاندا بۆ ئەوێندەرێ ئاگاداری خۆیان بن یان هەر گەشت نەکەن بۆ فەرەنسا..

قەزافی یارمەتی و پشتوانی لیبیا دەخاتە بەردەم فەرەنساو( قەرزاوی) داوا لە موسڵمانانی فەرەنسی دەکات کە هێور ببنەوە،هەرچی ئەو کەچەڵانەی دنیا هەیە کە دەرمانی سەری خۆیان بۆ ناکرێت، راوێژ پێشکەش بە کۆماری پێنجەم دەکەن ، بەم جۆرە فەرەنسا کەوتۆتە نێو گێژاوێکەوە کە رەنگە رزگار بوون لە ئاکامە کوشندە کۆمەڵایەتیەکانی بۆ ماوەیەکی زۆر درێژ خایەن ئاسان نەبێت.

ئەوەی لە فەرەنسا روو دەدات بە چەندین شێواز دەخوێنرێتەوە، رویەک لە رویەکانی ئەو راپەڕینە مەسەلەی پەراوێز کردن و هەژاری و دابڕاوی ئەو کۆچ بەرانەیە کە زۆربەی هەرە زۆریان موسڵمانن، ئەمانە بەشی هەرە

زۆریان تا ئێستا نەیان توانیوە لەگەڵ کۆمەڵگای فەڕەنسیدا ئاوێتە بن و وەک تاکێکی بەهرە مەند بەشداری خۆیان پێشکەش بە کۆمەڵگا بکەن ، لە لایەکی دیکەوە حکومەتی فەڕەنساو حکومەتەکانی دیکەی ئەوروپا تا ئێستا نەیان توانیوە ئەو رەوەندە زۆرو زەوەندە لە بۆتەی کۆمەڵگاکانی خۆیاندا تێکەڵ بکەن، ئەوانە لە باشترین حاڵەتدا فەرەنسی بوون و ئەوروپی بوونی خۆیان تەنها لەسەر لاپەڕە ی پاسپۆرتەکانیان بەدی دەکەن و لە ژیانی رۆژانەیاندا نەک هاولاتی پلە دوون بەلکو هەندێک جار هەست بەوە دەکەن کە هەر هاولاتی نین و بێ نرخ کراون.

رویەکی دیکەی ئەو رەوشە بریتیە لە کلتور، لە راستیدا کلتوری کۆچ بەرانی عەرەب و موسڵمان کلتورێکە هەرگیز بنەمای ئەوەی تیادا بەدی ناکرێت کە لەگەڵ کلتوری فەرەنسی و ئەوروپی تێکەڵ ببێت، کلتورێکە هێندەی ئامادەیە سرۆش لە موجاهیدە دەم و چاو هەڵپێچراوەکانی فەلوجە و فەلەستین وەربگرێت و کردەوە دزێوەکانی خۆکوژی و بۆمب سازدان بەرێتە نێو پاریس و لەندەن ، هێندە ئامادە نی یە کە مۆدێلی کلتوری ئەوروپی لەگەڵ کلتوری خۆیدا موتوربە بکات...

لە راستیدا من لەبەر دەم پرسیاری کەسێکی ئەوروپیدا زۆر رامام کاتێک دەیپرسی ( ئەگەر ئەوانە بێ کارن و لە کار دەگەڕێن ئەی بۆچی ئاگر بەر دەدەنە دەیان کارخانەو شوێنی خزمەت گوزاری مەگەر ئەو شوێنانە شوێنی کارکردن نین؟)

دوو دڵ نیم لەوەی کە ئەو راپەڕینە یاخود ئەو کارە دزێوانە یان هەر ناوێکی دیکەی لێ بنێن ئەگەر لە ولاتانی خودی ئەو کۆچ بەرانە روویدەن بۆ نمونە لە سوریا یان عێراقی سەردەمی دکتاتۆر یان سعودیە یاخود یەمەن یان میسر یان هەر دەوڵەتێکی دیکەی ئەو رەوەندە ئیسلامیانە، رویان بدایە ئەوە بێ گومان حکومەتەکانی ئەو ولاتانە بە بێ سێ و دوو بە ئاگر و ئاسن و بە کوشتنی بە کۆمەڵ لە ماوەی یەک دوو رۆژدا رەوشەکەیان دەخستەوە ژێر کۆنترۆڵی دەوڵەت...

گرفتەکە لێرەوەیە کلتوری کۆچ بەران کلتوری توندو تیژی ولاتی باوکە، هیچ کاتێک کۆچ بەر دوو دڵ نی یە لە دووبارە کرنەوەی کلتوری ولاتی باوک هەروەک لە فەرەنسا بە دیمان کرد، بەلام دیسان گرفتێکی گەورەرە ترە ئەو دەمەی کەسێکی توندو تیژ دەزانێت لەگەل کلتورێکی دیکەدا مامەڵە دەکات کە کلتوریکە چەند سەد ساڵێکە بنەماکانی مافی مرۆڤ و دیموکرسی پیادە دەکات و هەرگیز ماوە بە خۆی نادات ئەو کلتورەی کە سەدانی وەک ژان

ژاک رۆسۆ کردویانــەتــە پــەیمـانی کۆمــەڵایــەتــی، بگۆڕێـت و لــە پــەیمانــە مێژوییەکانی خۆیان پاشگەز ببنەوە....

## پەراوێزەكان

(١) دە ر هێنە ری سینەمایی كوژراو ( تە یۆ ڤان خۆخ ) بە ڕەچەڵە ك لە هە مان خێزانی هونە رمە ندی بە ناوبانگی شێوە كار (فنسنت ڤان خۆخ- ١٨٩٠/١٨٥٣ ) ە كە گوێچكە ی خۆی بڕی و پێشكە شی خۆشە ویستە كە ی خۆی كرد و لە تە مە نی ٣٧ ساڵیدا خۆی كوشت، بە ڵام تە یۆ ڤان خۆخ لە تە مە نی٤٧ ساڵیدا كوژرا...

(٢) لە هە ندێك دە وڵە تی ئیسلامیدا هێشتا ئافرە ت بۆی نییە ئۆتۆ مۆ بیل لێ بخورێت، یاخود لە پرۆسە ی هە ڵبژاردندا دە نگ بدات یان خۆی بۆ پارلە مان و سە رۆكایە تی دە وڵە ت كاندید بكات، لە كاتێكدا لە زۆربە ی دە وڵە تە ئە وروپییە كاندا زۆر دە مێكە ئە و كێشە یە یە كلا بۆ تە وە.

(٣) لە ڕاستیدا ناوی هۆڵاندا بە هەڵە بڵاوبۆتەوە چونكە ناوی وڵاتەكە خۆی ( Nederland ) ە واتە زەویە نشێوەكان ، بەڵام هۆڵاندابریتیە لە ناوچەی نێوان دوو هەرێم لە هۆڵاندا كە بریتین لە هەرێمی باكوری هۆڵاندا كە پایتەختەكەی شاری ( Haarlem ) ەو هەرێمی باشوری هۆڵاندا كە پایتەختەكەی شاری ( DenHaag ) ە بەڵام هۆڵاندا بە گشتی بریتیە لە ١٢ هەرێمی خودموختار.

(٤) ولیەمی یەكەم ( ١٥٨٤- ١٥٣٣ ) لە دایك بووی ( Dillenburg )ی ئەڵمانیایە ساڵی ١٨٥٤ لەلایەن Baltazar Gerards تیرۆر كرا، ئەم تیرۆرە بە یەكێك لە تیرۆرە سیاسیە گەورەكانی وڵات ناسراوە.

(٥) ڕۆژی ٨-٢-٢٠٠٥ پادشای هۆڵانداخانم (Beatrix) لە یادی ٤٣٠ ساڵ دامەزراندنی ئەم زانكۆیە وێڕای ئەوەی دكتۆرای شەرەفی وەرگرت ووتارێكی

گرنگیشی پێشکەش بە ئامادە بووان کرد، ئەم زانکۆیە ساڵی ١٥٧٥ دامەزراوە..
(٦) ناپلیۆن لەو ماوەیەدا نەک تەنها هۆڵاندا بەڵکو زۆربەی وڵاتانی ئەوروپای داگیرکردبوو، بەڵام ڕەنگە هۆی سەرەکی ئەم پێکەوەلکانە ئەوەبووبێت کە هێزەکانی ئینگلیز ساڵی ١٨٠٩ بۆ زەفەر بردن بە ناپلیۆن بە هێزێکی ٤٠ هەزار سەربازی و ١٤٤ تۆپخانەوە هێرشێکی هێناو ناوچەکانی (Zeeland . Limburg . Brabant) ی داگیر کرد هێزەکانی هۆڵاندا لە ناوچەکە بێ بەرگری خۆیان بە دەستەوە دا، بەڵام زۆری پێ نەچوو بە هاوکاری فەرەنسا هۆڵاندیەکان هێزەکانی ئینگلیزیان تێک شکاندو ناوچەکانیان لێ سەندنەوە.
(٧) ئەم شەڕو وێران کاریانە وڵاتی ماندوو کردبوو، ساڵی ١٨١٧ بەهۆی تێک چونی بەرهەمی کشتوکاڵەوە برسێتی و هەژاریەکی زۆر کەوتەوە، تەنها لە ئەمستەردام ٢٤٤ منداڵ فڕێدرابوون.
(٨) Harkis بە هەمان شێوە ٤٠٠ هەزار جەزائیری کە ناسراون بە
لە شەڕی سەربەخۆیی جەزائیردا چەکدارو میلیشیای فەرەنسا بوون، ساڵی ١٩٥٤ پاش شەڕی سەربەخۆیی جەزائیر، ڕوویان کردە فەرەنساو وەک پەنابەر وەرگیران.
(٩) ئاوێتە بوون پەیوەندیەکی مێژوویی بە ناشیونالیزم و دەوڵەتی ناشیونالستەوە هەیە، لە سەدەی ١٩ دا زۆر لە دەوڵەتانی ئەوروپای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا داوای ئاوێتە بوونی گروپە ئەتنیە جیاوازەکانی وڵاتیان دەکرد.
(١٠) گۆڕانکاری لە کلتووردا پەیوەندی زۆری هەیە بە پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاوە، هەر لەبەر ئەوەشە کە کۆمەڵگا دوواکەوتوەکان زۆر بە درەنگ لە کلتوری قەتیس ماوی خۆیان دەردەچن، لە کاتێکدا شۆڕشی زانیاری و تەکنەلۆژی ئێستا بناغەی پتەوی داناوە بۆ کلتورێکی دیجیتاڵی جیهانی.
(١١) ڕەوندی ئیسلامی لەم بارەدا خاوەنی سەدان تاوانی بچوک و گەورەی شەرەفە لە ئەوروپا.
(١٢) لە زۆربەی ئاڵوگۆڕەکانی نێوان ئیسرائیل و حزب الله ی لبناندا، سەربازێکی ئیسرائیلی (کلتوری من) بەرامبەر بە ١٠٠ کەسی فەلەستینی و لوبنانی (کلتوری ئێمە) ئازاد دەکرێت ئەمە خۆی لە خۆیدا هەستێکی وا نیشان دەدات کە یەک سەربازی ئیسرالی بەرامبەر بە ١٠٠ فەلستینی بەنرخە. بەهەمان شێوە قەرەبووی کەسێکی کوژراو لە ئەفگانستان یان لە

فەلوجە لەلایەن ئەمریکاوە بە ٢٠٠ دۆلار دەکرێتەوە بەڵام کەسێکی کوژراو لە لۆکەربی بە ١٠ ملیۆن دۆلار.

(١٣) ڕۆژنامەی( metro ) ڕۆژی ١٩-٣-٢٠٠١ لە سەر لاپەڕەی یەکەمی خۆی سەبارەت بە ڕەوشی چەند پەنابەرێکی کوورد کە بەهۆی مانگرتنیان لە خواردن هەڕەشەی مردنیان لە سەر بوو، بە مانشێتێکی گەورەو تۆخ لەژێر وێنەی پەنابەرێکی کووردا کە لە سەرەمەرگدابوو نوسیویەتی(کووردەکان پێیان خۆشە بمرن وەک لەوەی بگەڕێنەوە ) .

(١٤) یەکێک لە تاوانەکانی کوشتن کە تائەمڕۆ بکەرەکەی دیار نییە هێنرا بەسەر پەنابەرێکی عێراقی بەناوی عەلی ئەکبەر و ماوەیەکی زۆر درێژ میدیای هۆڵاندا ڕاشکاوانە باسی دەکرد وەک ئەوەی بە تەواوی بەڵگەی تاوانیان بە دەستەوە بێت کە ئەو کەسە ئەنجام دەری کارەکە بێت، پاش نزیکەی هەشت مانگ پەنابەرەکە لە تورکیا دەستگیر کراو تێستی(DNA )ی بۆ ئەنجام درا لە ئاکامدا ئاشکرا بوو کە بکەری کارەکە ئەو نی یە.

(١٥) ساڵی ٢٠٠١ لە کەناری ئاوێک لە ناوچەی( نولْدە) کۆمەڵێک منداڵ کەللە سەرێکیان دۆزیەوە، پاشان لە چەندین ناوچەی دیکە دەست و قاچ و لاشەی پارچەکراو دۆزرانەوە، پاش ئەنجام دانی لێکۆڵینەوە دەرکەوت کە ئەو پارچانە هەموو پارچەی لەشی منداڵێکن. کەللەسەری منداڵەکە لە نێو ئاودا شێوا بوو بۆیە ڕەوانەی بەریتانیا کراو پسپۆڕانی تاوان توانیان شێوەیەکی خەیاڵی بۆ منداڵەکە دروست بکەن. پاش ئەوەی کە شێوەکە درا بە تەلەفزیۆن دەرکەوت کە ئەمە تاوانێکی زۆر گەورەیەو دایکی منداڵەکە وازی لە مێردەکەی خۆی هێناوەو لەگەڵ پیاوێکی دیکە پاش ئەوەی منداڵەکەیان لە ناو بردووە بەرەو ئیسپانیا هەڵهاتوون و هەر لەوێش دەستگیرکران و ڕەوانەی هۆڵاندا کرانەوە.

(١٦) ساڵی ١٩٩٩ (AllD ) تەمەن ١٧ ساڵ ١٤ فیشەکی نا بە کەسێکی دیکەوە بەناوی حەسەن، ئەم تەقە لێکردنە لە نێو قوتابخانەیەکی شاری(Veghel ) ڕوویداو چوار خوێندەڤان و مامۆستایەک بریندار بوون. عەلی کە کووردێکی کرمانجی تورکیایە ئەم کردارەی بە فەرمانی باوکی ئەنجام داچونکە حەسەن پەیوەندی سێکسی لەگەڵ خوشکەکەیدا هەبوو، عەلی لە نوسینگەی پۆلیس گوتی ١٠ کەس لە خێزانەکەم بکوژرێت باشترە لەوەی کە خوشکەکەم پاکیزەیی خۆی لەدەست بدات و ناموسمان بشکێنێت.

(١٧) لە جەژنی قوربانا موسڵمانەکان مەڕو بزنیان دەکڕی و لەبەردەم ماڵ و منداڵی خۆیاندا، هەندێک جاریش لە حەوشەی ماڵ یان لە بالکۆنە

لەبەرچاوی خەڵکەوە سەریان دەبڕی، ئەم ڕەفتارە دژی کلتوری ئەوروپی یەو پێشێلکاریەکی زۆر نارەوای مافی ئاژەڵ بوو، بۆیە قەدەغە کراو تەنها قەسابخانەکان بۆیان هەیە کاری سەربڕین ئەنجام بدەن، لە ڕاستیدا ئەم کارەی ڕەوەندی ئیسلامی ماوەیەکی زۆر ببوە مایەی بێزاری خەڵکی ئەوروپا بەتایبەت لە بەلجیکاو هۆڵاندا.

(١٨) لە زۆربەی وڵاتانی جیهاندا ئەم کارە ئاسانترە لە هۆڵانداچونکە لە هۆڵاندا خوێندن بە بێ مافی نیشتەجێ بوون کارێکی زۆر ئاسان نی یە و لەڕێگەی ڕێکخراوی خێرخوازەوە ئەنجام دەدرێت وەک ڕێکخراوی **U.A.F** .

(١٩) ساڵی ٢٠٠١ کۆمسیۆنی ئەوروپا دژی جیاوازی کردن و ڕەگەزپەستی ڕایگەیاند کە هولاندا یاسایەکی ئەوتۆ باشی دژی ئەم دیاردەیە پیادە نەکردووە.

(٢٠) لە بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنی کەناڵی یەکی هۆڵاندا چەندین بەشدار بووی بەرنامەکە لە ڕەوەندی ئیسلامی و بێگانە، جەختیان لەسەر ئەوە کردەوە، یەکێک لە ئامادە بووان کە کچێکی بە ڕەچەڵەک تورک بوو ڕای گەیاند کە هەمیشە بەناوی ڕاستی خۆی کە ناوێکی تورکیە داخوازی کار کردنی هەر بە تەلەفون یاخود بە نامە ڕەت کراوەتەوە، بەڵام کە ناوی خۆی دەگۆڕیت بە ناوێکی دیکەی وەک ( سوزان) کە ناوێکی بڵاوە لە تەواوی جیهاندا ئەوە داخوازیەکەی ڕەتناکرێتەوەو بانگ دەکرێت بۆ گفتوگۆی کارپیدان.

(٢١) بەپێ ی تازەترین ئامار کە ڕۆژی ١٢-٢-٢٠٠٥ لە لاپەڕە دووی ڕۆژنامەی (**de Volkskrant** ) بڵاو بۆوە ساڵی ٢٠٠٤ ئەو کەسانەی کە لە زیندانداا بوون ژمارەیان ١٥،٧٧٤ بوو ، ژمارەی زیندانیانی هۆڵاندی بەرزتر بۆتەوە بۆ ٦،٨١٣ بەڵام ژمارەی بێگانەکان دەگاتە ٨،٩٦١ کەس. بەم پێ یە ئاشکرا دەبێت کە ساڵی ٢٠٠٤ ڕێژەی هۆڵاندیەکان لە زینداندا ٤٣،١% و بێگانەکانیش ٥٦،٨% بوون، جێگەی سەرنجە ژمارەی زیندانی کراوەکان لە هۆڵاندا بە پێ ی ژمارەی دانیشتوان زۆر لە ئەڵمانیاو فەرەنساو ئیسپانیاو ئیتالیا کەمترە بەڵام لە پرتوگال و بەلژیکاو سوید و نەمسا زۆرترە.

(٢٢) ووشە گەلێکی زۆری عەرەبی ( ئیسلامی ) خۆی سەپاندووە بەسەر فەرهەنگی هۆڵاندیدا بۆنمونە ئەم ووشانەی خوارەوە ڕۆژانە لە دوو توی ڕۆژنامەو گۆڤار و تەنانەت تەلەفزیۆنیشدا دەگوترێت

( **Allah** - خودا، **Koran** قورئان، **Hadith** حەدیس، **Sjaria** شەریعە ، **Salat** نوێژ ، **Hadj** حەج، **Jihad** جیهاد، **Soennieten** سوونە ، **Sjieten** شیعە، **Ramadan**

ڕەمەزان، Halal حەلاڵ ، Haram حەرام، Imam ئیمام، Tafsier تەفسیر، Hijab حیجاب، Sjeik شێخ ، Sultan سوڵتان... هتد ).

(٢٣) عبدولجەبار ڤان دڤەن ( Abdul jabbar van deven ) کە هۆڵاندیەو بۆتە ئیسلام ڕیشێکی درێژی هەیەو جلی موجاهیدنی ئەفغانی لەبەر دەکات و لە سەر تەلەفزیۆن بۆتە مایەی سەرئێشە بۆ هۆڵاندیەکان.

(٢٤) ئایین گۆڕین نەک تەنها لە هۆڵاندا بەڵکو لەتەواوی ئەوروپادا دیاردەیەکی باوە چونکە یاسا بەرگری لێ دەکات، وێڕای ئەوەش نەک تەنها بۆ ئایینی ئیسلام بەڵکو ئەوروپیەکان بۆ هەموو ئایینێک کراوەن و دەچنە ناوی چونکە کۆمەڵگای ئەوروپی زیاتر کراوەترن بۆ گۆڕانکاری وەک لە کۆمەڵگای ڕۆژهەلاتی، وێڕای ئەوەش ژمارەیەکی بەرچاوی موسڵمان ساڵانە دەبنە مەسیحی، ژمارەیەک لەوانە کوردن بەڵام لە ترسی تۆڵە خۆیان ئاشکرا ناکەن.

(٢٥) بەندی یەکەم برگەی یەکەم لە دەستوری هۆڵاندا، یاسای سڤیل بەندی ٢٠ ، یاسای نوێ ی سڤیل بەندی ١٦٢ ، یاسای سزادان بەندی ٩٠ ، بەندی ١٣٧ برگەکانی ( c,d,e,f,g ) ، بەندی ٤٢٩ .

هەموو ئەم برگانەی یاسا دژی جیاوازی کردن و ڕەگەز پەرستین.

(٢٦) ماڵپەڕی وەک( Holland Hardcore, Polinco, Stormfront ) بیرو باوەڕی ڕاستڕەوە تازەکان بڵاودەکاتەوەو هەمیشە بانگەوازی توندو تیژی دژی ڕەوەندی بێگانەو جولەکە بڵاودەکەنەوە.

(٢٧) پۆلیسی باڤاریا لە ئەڵمانیا ساڵی ١٩٩٣ بنکەیەکی نازیەکانی دۆزیەوە کە وێنەی هتلەرو سەدامیان پێکەوە هەڵواسیبوو.

(٢٨) ئەم سیاسەت مەدارە هۆڵاندیە ناسرابوو بەوەی کەسێکی هۆمۆ ( نێرباز) ە، بەڵام ئەم هۆمۆ بونەی کاریگەری نەکردبووە سەر لایەنی سیاسی چونکە لە هۆڵاندا سێکس ئازادە و پیاو لە پیاو هەروەها ژن لە ژن مارە دەکرێت.

(٢٩) لە یەکێک لەو هێرشانەی پاش ڕووداوەکانی سێپتەمبەر لە ئەمەریکا دەکرانە سەر موسڵمانەکان بریتی بوو لە ڕووداوی کوشتنی کەسێکی هندی کە سەربە ئایینی سیخ بوو.

سەرچاوەکان:

سەرچاوەکان:-
بەزمانی هۆڵەندی:
کتێب و نامیلکەکان
Essays, Naar een Europese Islam, Nederland bestaat niet meer, 2001.
Van den Baviere, Paul, Zoeken uit het oosten,Mavleen copelle,1995
Werf,Siep Van der, Allochtonen in de multiculturele samenleving, Bussum, coutinho 2002.
Pinto, David, samen verder, achtergrondinformatie, Houten,Bohn stafleu 1998.
Communicatie,Communicatie met etnische minderheiden, ,van DTC, informatie gids 1996.
Jaarboek, jaarboek minderheiden, HMAG smeets,Houten Bohn stafleu, 2002.
Klaas jansma, Meindert Schtoor, 100 jaar geschiedenis der Nederlanden, Robo productions,Lisse, Den Haag, 1991
Rapport kerncijfers discriminatie,2001 landelijke vereniging van anti discriminatie bureau en meld punten, 2002

Drs. S.Koopmans, Geschiedenis voor maatschappijleer,Willemien van delft,Venlo, 1985
A.J.G De geschiedenis van Nederland in de 20:te eeuw,strengholts boeken,2001
Reinildis van Ditzhuyzen- Oranje-nassau een biografisch woordenboek, Haarlem,2003
Dr.H.P.H. jansen Geschiedenis van laaglanden in jaar tallen.2002
E.D.Hirsch, Het culturele woordenboek, twaalfde druk, Amsterdam,2003
Vossestein.j Vremdevolk, Amsterdam, kitpublishers.2003.
Inburgeren: deperfecte, allochtonen,Amsterdam,trouw 2003 .
De Terroristen Jaagster,Anoniem, Harper Collins Publishers, Maarten muntinga bv,Amsterdam, 2003

ڕۆژنامەو گۆڤارەکان:

De Volks krant

ژمارەیەکی زۆری ئەم ڕۆژنامەیەم بەکار هێناوە ، ئەوەی پەیوەست بێت بە ژمارەو راستی وردەوە لە ناو کتێبەکەدا ئامارەی بۆ کراوە

Vrij Nederland –

ژمارەکانی ساڵی ٢٠٠٤

HP de tijd –

ژمارەکانی مانگی ئاپرل و ئۆگستۆس و سەپتەمەرو ئۆکتۆبەر٢٠٠٤

ژمارەکانی مارت و مەی و ژون و گەلاوێژو ئۆکتوبەری ٢٠٠٥

ژمارەکانی فێبروەری و مارتی ٢٠٠٦

Tribunee,

گۆڤاری پارتی سۆشیالستی هۆڵاندا، سەپتەمبەری ٢٠٠٤

ماڵپەرەکانی ئەنتەرنێت:

ئەم بەشە لە سەرچاوەکان گەلێک زۆرن بەلاّم گرنگترینیان دەخەینە روو:

www.regering.nl
www.vlaamsbelang.org
www.katolieknieuwsblad.nl
www.rd.nl
www.hizb-ut-tahrir.org
www.usinfo.state.gov
www.sp.nl
www.inburgernet.nl

www.hav.nl
www.koninklijkhuis.nl
http://nl.wikipedia.org/wiki/Islamitische_organisaties
www.justietie.nl
www.novatv.nl
www.scholieren.samenvating.com
www.web.inter.nl.net
www.travelmarken.nl
www.hvo.nl
www.indonesie.pagina.nl
www.landweb.com
www.om.nl
www.xs4all.nl
www.landweb.nl
http://www.hetnet.nl/actua_anp/
www.interculturelecommunicatie.com
www.20eeuwennederland.nl
www.intghis.nl
www.cidi.nl
www.worldbank.org
www.aivd.nl

http://aps.vlaanderen.be/statistiek/nieuws/cultuur/2004-11_islam.htm

http://www.easyterra.nl/autohuur-italie.html

http://www.kuleuven.ac.be/icrs/religies/religies_overzicht.htm#andere

http://nl.wikipedia.org/wiki/Islam_in_Nederland

سەرچاوەکان بە زمانی عەرەبی:
بە زمانی عەرەبی سود لەم ماڵپەڕانەی خوارەوە وەرگیراوە:
www.asharqalawsat.com
www.islam-online.net
www.us.moheet.com
www.aljazeera.net
www.alarabiya.net
www.daralhayat.com
www.darislam.com

http://www.qaradawi.net/site/topics/

http://www.almethaqalaraby.net/Essam14-7-2005.htm

http://www.2.tatsachen-ueber-deutschland.de/575.0.html

http://www.ikhwanonline.com/Article.asp?ID=11890&LevelID=1&SectionID=309

http://www.ahram.org.eg/acpss/ahram/2001/1/1/RARB77.HTM